


# شەرحی اللؤلؤ والمرجان

## فيما اتفق عليه الشيخان البخاري ومسلم

وضعه

محمد فؤاد عبد الباقي

بە پێنووسی

نوری فارس حەمەخان

سەرپەرشتی چاپ

محمود أحمد محمد

(بەرگی دووەم)

# شەرحی

# اللُّؤْلُؤُ وَالْمَرْجَان

# فِيما اتَّفَقَ عليه الشَّيْخَان

## البخاري ومسلم

وضَعَهُ

محمد فؤاد عبدالباقی

بەپێنووسی

نوری فارس حەمە خان

سەرپەرشتی چاپ

محمود أحمد محمد

﴿بەرگی دووەم﴾



*************************************************

📖 ناوی كتێب: شەرحی اللؤلؤ والمرجان فيما أتفق عليه الشيخان البخاری ومسلم.

📖 نووسینی: مامۆستا نوری فارس حەمە خان

📖 تیراژ: ١٠٠٠ دانە

📖 ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانەكان ژمارەی سپاردن ( ١٢٧٨ )ی ساڵی ( ٢٠١٥ز)ی پێدراوە.

📖 كۆمپیوتەرو دیزاین: ( سامان محمد أمین )

📖 لەسەر ئەركی كتێبخانەی ئارام لەسلێمانی چاپكراوە، مافی چاپكردنەوەی بۆ كتێبخانەی ناوبراوە.

## ٦- كتاب صلاة المسافرين وقصرها
## نامەی نوێژی ڕێبواران‌و كورتكردنەوەی
### (١) باب: صلاة المسافرين وقصرها
### باسی كورتكردنەوەی نوێژ بۆ ڕێبواران

٣٩٨- عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (فَرَضَ اللَّهُ الصَّلَاةَ حِينَ فَرَضَهَا رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ فِي الْحَضرِ وَالسَّفَرِ فَأُقِرَّتْ صَلَاةُ السَّفَرِ وَزِيدَ فِي صَلَاةِ الْحَضرِ). (الحديث ٣٥٠ طرفاه في: ١٠٩٠، ٣٩٣٥).[٣٩٨]

عائیشەی دایكی موسوڵمانان (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرمووێ: لەسەرەتاوە یەكەمجار كەخودای گەورە نوێژی فەرزكرد، دووركات دووركات فەرزی كرد، ئیتر نوێژخوێن نیشتەجێ بوایە، یارێبوار بوایە، گشت نوێژێ دووركاتی دەكرد، جانوێژی سەفەر وەك خۆی مایەوەو لەسەر شێوەی یەكەمجاری چەسپاو دامەزرا، بەڵام نوێژی نیشتەجێ لێ ی زیاد كرا (ت/١/ ٤٤٦ ز. ١٥٥).

**ڕوونكردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە مورسەلی صەحابییە، مورسەلی صەحابی حوججەت‌و بەڵگەیە، بۆیە مورسەلە چونكە عائیشە خۆی فریای ڕوودانی ئەم داستانە نەكەوتووە، سایا لە پێغەمبەری بیستووە، یالەیەكێ لەهاوڕێ یانی پێغەمبەری زنەوتووە، هەرچۆن بێ ئەم فەرموودەیە دەبێ بەسەر بەڵگە بۆ ئەم بابەتە،

---

[٣٩٨] تجريد/١، ژمارە: ٢٢٢، بخاری: ٣٥٠، ١٠٩٠، ٣٩٣٥، مسلم ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا: ١٥٦٨.

کەعیبادەتە، چونکە عیبادەت بەڕای خۆیی دانامەزرێ، ساخ بوونەوەی هەموو پەرستنێ پێویستی بەدەقی یاسادانەر (شاریع) هەیە کەخودای گەورەیە، کەس بۆی نییە چۆنێتیو چەندێتی ی پەرستنێ بڕیار بدا، جگە لەخودا خۆی.

مورسەل (بەکوردی واتە: بێ بەند: بێ پێوەند: رەها: بەرەڵا: ئازاد: سەربەست) چونکە راوی جڵەوی ڕشتەکە بەردەداو، خۆی سەربەخۆ، راستەوخۆ فەرموودەکە دەگێڕێتەوەو، باسی ئەوە ناکا کەئەو فەرموودەیەی لەکێ وەرگرتووە. کەواتە: حەدیثی مورسەل، واتە: فەرموودەی بەرەڵا، کەسەر روشتەی روشتەکە کوێر بۆتەوەو، لەدەستا نەماوە.

٣٩٩- عَنْ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ قال: صَحِبْتُ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) فِي طَرِيقِ مَكَّةَ، فَصَلَّى لَنَا الظُّهْرَ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَقْبَلَ وَأَقْبَلْنَا مَعَهُ، حَتَّى جَاءَ رَحْلَهُ، وَجَلَسَ وَجَلَسْنَا مَعَهُ، فَحَانَتْ مِنْهُ الْتِفَاتَةٌ نَحْوَ حَيْثُ صَلَّى، فَرَأَى نَاسًا قِيَامًا، فَقَالَ: مَا يَصْنَعُ هَؤُلاَءِ؟ قُلْتُ: يُسَبِّحُونَ، قَالَ: لَوْ كُنْتُ مُسَبِّحًا لأَتْمَمْتُ صَلاَتِي، يَا ابْنَ أَخِي إِنِّي صَحِبْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي السَّفَرِ فَلَمْ أَرَهُ يُسَبِحُ فِي السَّفَرِ، فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ، وَصَحِبْتُ أَبَا بَكْرٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ، حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ، وَصَحِبْتُ عُمَرَ فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ، حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ، ثُمَّ صَحِبْتُ عُثْمَانَ، فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ، حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ، وَقَدْ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: (لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ). {الحديث/١٥٧٧ = ١٥٤٣ فم. تجريد/١/٥٣١ = ١١٠١، ١١٠٢}. {راجع رقم: ٤٣٧ - تقدَّم}:[٣٩٩]

حەفصی کوڕی عاصیم فەرمووی: لە سەفەرێکا، لە رێگەی مەککە، لە خزمەت ئیبنو عومەری مامەدا بووم، نوێژی نیوەڕۆی بە کۆمەڵی بۆکردین، ئەوجا ڕۆیشتەوە بۆ جێگەکەی خۆی، ئێمەیش دوای کەوتین هەتا گەیشتەوە

[٣٩٩] مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٤٤١ = ١٥٧٧، شیحا تجريد/١، ژمارە: ٥٥٣، بخاری: ١١٠١.

ئەویٚ، لەویٚ دانیشتو ئێمەیش لە خزمەتیدا دانیشتین، وا ڕێکەوت ئاوڕێکی بەرەو لای جێگە نوێژەکەی دایەوە، کۆمەڵێکی بینی بەپێوە ڕاوەستابوون، فەرمووی: ئەوانە چی دەکەن؟ منیش گوتم: نوێژی سوننەتی پاش نوێژی نیوەڕۆ دەکەن! کەچی مامەم فەرمووی: (جا ئەگەر من شتی وابکەم، ئەوەم پێ باشترە کە نوێژە فەرزەکە بەتەواوی بکەم).

ئەوجا بۆ پاساودانەوەی باشی چۆنێتیی نوێژەکەی خۆی کە لە سەفەردا، بەو شێوەیە بکرێ کە ئەوکردی، فەرمووی: ئەی برازای شیرینم! لە سەفەردا هاوڕایی پێغەمبەرم کردووە، هەتا ئەو ڕۆژەی خودا بردیەوە بۆلای خۆی، لە دوو رکات زیاتری نەکردووە، لەپاش ئەویش هاوڕایی ئەبوبەکرم کردووە، لە سەفەرا، لە سەردەمی جێنشینی خۆیدا ئەویش هەروا، هەروا عومەریش لەسەردەمی جێنشینیی خۆیدا، هەروا عوثمانیش لەسەردەمی جێنشینیی خۆیدا، ئەم چوار زاتە لەسەردەمی خۆیانا، لەسەفەردا، هاوڕێتیم کردوون، هیچیان لە دوو رکات زیاتری نەکردووە!، دەی خودایش سەبارەت بە پەیڕەویی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ — أحزاب/٢١). واتە: پێغەمبەری خودا، سەرمەشقێکی جوانە بۆ ئێوە، لەهەموو کارێکا، کە مەودای پەیڕەویی هەبێ، بیکەن بە پێشەوا بۆ خۆتانو پەیڕەوی بکەن!). {بڕوانە: تاج/١/٤٣٧، زنجیرە: ١٥٧، ژمارە: ٨٩٧}.

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەفەرموێ: بۆخۆم زۆر لەخزمەت پێغەمبەردا بووم، نەیم دیوە کەلەسەفەردا نوێژی سوننەت بکا، وەلحاڵ خودای یادمەزنیش دەفەرموێ: (لقد كان لَكم في رسول الله أسوة): پێغەمبەری خوا سەرمەشقێ جوانە بۆ ئێوە، لەهەموو کارێکتانا پەیڕەوی بکەن).

**راڤەو شیكردنەوە:**

بەپێی ئەم فەرموودەیە لەسەفەردا نوێژە سوننەتەكانی پاش و پێشی فەرزەكان ناكرێن. بەڵام زوربەی زاناكان دەفەرموون: لەسەفەریشا نوێژخوێن ئارەزووی خۆیەتی، بۆی هەیە هەموو جۆرە سوننەتێ بكا، بۆی هەیە نەیانكا.

٤٠٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الظُّهْرَ بِالْمَدِينَةِ أَرْبَعًا، وَصَلَّيْتُ مَعَهُ الْعَصْرَ بِذِي الْحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ». {الحديث/١٥٨٠ = ١٥٤٦ فم. تجريد/٢، لاپەرە: ١٦٨، رقم: ٧٤٥ = ١٥٥١، ١٠٨٩، ١٥٤٦، ١٥٤٧، ١٥٤٨، ١٧١٢، ١٧١٤، ١٧١٥، ٢٩٥١، ٢٩٨٦}:[٤٠٠]

ئەنەسی كوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كەچوو بۆ حەجی مالاوایی، لە مەدینە نوێژی نیوەڕۆی بەچوار ركات بۆمان كرد، ئەوجا كەوتەڕێ، كە گەیشتە زولحولەیفە، لەوێ نوێژی عەصری بە قەصر، واتە: بە كورتی، بەدوو ركات، بە جەماعەت بۆمان كرد).

٤٠١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، حَتَّى رَجَعْنَا إِلَى المدينَةِ، قُلْتُ: كَمْ أَقَامَ بِمَكَّةَ؟ قَالَ: عَشْرًا. وَفِي رِوَايَةٍ: خَرَجْنَا مِنَ المَدِينَةِ إِلَى الحَجِّ». {الحديث/١٥٨٤ = ١٥٥٠ + ١٥٨٦ = ١٥٥٢ فم. تجريد/١، لاپەرە: ٥٢٠، رقم: ٥٤٥ = ١٠٨١، ٤٢٩٧}:[٤٠١]

---

[٤٠٠] تجريد/١، ژمارە: ٧٤٥ = ١٥٥١، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٤٣٥ = شيحا: ١٥٨٠.

[٤٠١] تجريد/١، ژمارە: ٥٤٥، بخاری: ١٠٨١، ٤٢٩٧، مسلم ترقيم محمد فؤاد: ٦٩٣ = ١٥٨٤، ترقيم شيحا = مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٤٣٦.



ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە حەجی ماڵاواییدا، لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) لە مەدینەوە چووین بۆ مەککە، ئیتر هەر دوو ڕکات دوو ڕکات نوێژە چوار ڕکاتییەکانی دەکرد بۆمان، بە کۆمەڵێ، بە جەماعەت، هەتا گەڕاینەوە بۆ مەدینە، یەحیای کوڕی ئەبو ئیسحاق فەرمووی: گوتم بە ئەنەس: لە مەککەو دەوروبەری چەندێ مانەوە؟ فەرمووی: دەشەو لەوێ ماینەوە. {تاج/١، ژمارە: ٨٩٠}.

## (٢) باب: قصر الصلاة بمنى
## کورتکردنەوەی نوێژە چوارینەکان لە مینا

٤٠٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمِنًى صَلاَةَ الْمُسَافِرِ وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ ثَمَانِيَ سِنِينَ، أَوْ قَالَ سِتَّ سِنِينَ، قَالَ حَفْصٌ (يَعْنِي إِبْنَ عَاصِمٍ): وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يُصَلِّي بِمِنًى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ يَأْتِي فِرَاشَهُ، فَقُلْتُ: أَيْ عَمِّ، لَوْ صَلَّيْتَ بَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ؟ قَالَ: لَوْ فَعَلْتُ لأَتْمَمْتُ الصَّلاَةَ». {الحديث/١٥٩٢ = ١٥٥٨ تجريد/١، لاپەڕە: ٥٢١، رقم: ٥٤٦ = ١٠٨٢، ١٦٥٥}:[٤٠٢]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە مینا، لە حەجی ماڵاواییدا، لە ڕۆژەکانی جەژنی قوربانداا، لەگەڵ پێغەمبەر خۆی و ئەبوبەکرو عومەردا، لەکاتی جێنشینی خۆیاندا، وەك نوێژی ڕێبوار، نوێژە چوار ڕکاتەکانمان بە دوو ڕکات دەکرد، واتە: کورتمان دەکردنەوە، لەجیاتی چوار ڕکات دوو ڕکاتمان دەکرد، کە ئەم کردارە لە زاراوی شەرعی پیرۆزدا، پێی دەگوترێ

[٤٠٢] تجرید/١، ژمارە: ٥٤٦، بخاری: ١٠٨٢، ١٦٥٥، مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٤٣٧ = ٦٩٤ = ١٥٩٢ شیحا.




(قصر الصلاة الرباعية) وه هەروەها لەگەڵ عوسمانیشدا، هەشت ساڵ، یا شەش ساڵ، لەسەرەتای فەرمان ڕەواییەکەیدا، بەهەمان چەشن، نوێژە چوارینەکانمان، لە مینا، بە دوو ڕکات دەکرد، بەڵام عوسمان لە دواییدا چوار ڕکاتی دەکردو، لە مینا نوێژی کورت نەدەکردەوە.

حەفصی کوڕی عاصیم، کە ئەم فەرموودەیە لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ: دەستووری ئیبنو عومەر وابوو، لە مینا نوێژی چوارینەی کورت دەکردەوەو، بەدوو ڕکات دەیکرد، بەڵام هیچ نوێژی سوننەتی لەپاشیەوە نەدەکرد، بەڵکوو ئەگەڕایەوە بۆ جێگەی خۆی، منیش عەرزیم کرد: ئەی مامی شیرینم! ئەوە بۆچی دوو ڕکات نوێژی سوننەت، لەپاش نوێژە فەرزە کورتکراوەکەوە ناکەیت؟ فەرمووی: ئەی برازای خۆشەویستم، ئەگەر شتی وا بکەم، نوێژە فەرزەکە بەتەواوی بکەم، بە چوار ڕکات، ئەوەم پێ باشترە لەمەی تۆ دەیڵێیت). {تاج/١، لاپەڕە: ٤٣٤، زنجیرە: ١٥٥، ژمارە: ٨٩٢ + ١٥٧٧ = ١٥٤٣ فتح الملهم}.

**ڕوونکردنەوە:**

١. حەفصی کوڕی عاصیمی کوڕی عومەری کوڕی خەطاب، هەق برازای عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەطابە، کە ناسراوە بە ئیبنو عومەر.

٢. ئیمامی نەوەوی (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: زانایان بەکۆی دەنگ دەفەرموون: سوننەتی ڕەها، لە سەفەرا، کاری شیرینە، بەڵام ڕاجیایی هەیە لە کردنی سوننەتەکانی پاش‌و پێشی نوێژە فەرزەکانا، لەلای شافیعی‌و هاوەڵانی‌و جەماوەری زانایانی ئیسلام، کردنی ئەم سوننەتانە سوننەتە، کەواتە: بە دڵنیایی دەڵێین: ئەی برای ڕێبوار! لە سەفەرا، دەتوانی هیچ نوێژێکی سوننەت تەرك نەکەی، لەپێش‌و پاشی فەرزەکانەوە نوێژە

سـوننەتەكان، وەك كـاتی ئاسـایی بكـە، شـەو نوێژبكـە، نوێـژی چێـشتەنگاوو سوننـەتی دەستنوێژو دیاری مزگەوت بكە. هەروا نوێژی سوننەتی ڕەها، كە پێی دەگوترێ: (نوافل مطلقة).

٣. لـە (فَتْحُ الْمُلْهِمِ)دا، دەفـەرموێ: سەرخەسـی لـە مـەبـسووطدا دەفـەرموێ: (نوێژی سوننەت كورت ناكرێتەوە).

٤٠٣- عَن حَارِثةَ بْنَ وَهْبٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ صَلّى بِنَا النَّبِيُّ (صَـلّى اللّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَ نحن أَكْثَرُ مَاكُنَّا قَطُّ وَ آمَنَةُ بِمِنًى رَكْعَتَيْنِ. (الحديث:١٠٨٣-طرفه في: ١٦٥٦).[٤٠٣]

حاریسەی كوڕی وەهـب (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەمووی: لەحـەجی مـاڵ ئـاوایی دا، لـەڕۆژەكانی مینـادا، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) نوێـژە چـوار ڕكاتییـەكانی كـورت دەكـردەوەو بـەدووڕكات بـۆی دەكـردین، لەوكاتەشـدا هەرگیز لەوەپێش وا زۆر نەبووین، وە دنیا زۆر هێمن و ئەمین بوو، ئەوەی بلێـی تـرس لەدوژمن پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) نـەیبوو، كەواتـە: كـورت كردنەوەی نوێژ پەیوەندی بەترسەوە نییە، وەك گـەلێ لـەزاناكان وادەفـەرموون. (بڕوانە: حاریسة بن وهب/الاستیعاب/ابن عبدالبر).

حاریسەری كوڕی وەهب خوزاعییە، براى دایكی عوبەیـدیللای كـوڕی ئیمـامی عومەرە، لەصەحیحەین داچوار فەرموودەی هەیە، لەبوخاریدا چوار فەرموودەی هەیە (ڕەزای خوای لـێ بێ).

[٤٠٣] تجرید/١، ژمارە: ٥٤٧، بخاری: ١٠٨٣، مسلم: ٦٩٢ = ١٥٩٦.



## (٣) باب: الصلاة في الرحال في المطر
## نوێژكردن لەجێگەو شوێنی نوێژكار لەكاتی بارانا

٤٠٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِىَ اللّٰهُ عنهما): أَنَّهُ نَادَى بِالصَّلاَةِ فِى لَيْلَةٍ ذَاتِ بَرْدٍ وَرِيحٍ وَمَطَرٍ، فَقَالَ فِى آخِرِ نِدَائِهِ: أَلاَ صَلُّوا فِى رِحَالِكُمْ، أَلاَ صَلُّوا فِى الرِّحَالِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَأْمُرُ الْمُؤَذِّنَ إِذَا كَانَتْ لَيْلَةٌ بَارِدَةٌ أَوْ ذَاتُ مَطَرٍ فِى السَّفَرِ أَنْ يَقُولَ: (أَلاَ صَلُّوا فِى رِحَالِكُمْ). {الحديث/١٥٩٩ = ١٥٦٥ ف.م. تجريد/١، لاپەڕە: ٣٥٩، رقم: ٣٦٣ = ٦٣٢، ٦٦٦}:[٤٠٤]

نافیع فەرمووی: شەوێ سەرماو سۆڵەو باران بوو، ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) بانگی دا بۆ نوێژ، بەڵام لەپاش تەواوبوونی بانگەكە، فەرمووی: (ئاگاداربن، مەیەن بۆ جەماعەت، لەبەر ئەم سەرماو سۆڵەیە، بەڵكوو هەر لەماڵو شوێنی خۆتان نوێژ بكەن).

لەپاشا فەرمووی: من ئەمەم لە خۆمەوە نەكرد، جاران لە سەفەردا، ئەگەر شەوێ سەرماو باران بووایە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە بانگدەرەكەی دەفەرموو كە لەپاش تەواو بوونی بانگەكە یەكسەر بڵێ: (أَلاَ صَلُّوا فِى رِحَالِكُمْ = ئاگاداربن! مەیەن بۆ جەماعەت، بەڵكوو هەر لەبنەو بارەگاكانی خۆتان نوێژەكانتان بكەن). {تاج/١، زنجیرە: ١٢٤، ژمارە: ٧٥٢}.

٤٠٥- عَنْ عَبْدَ اللّٰهِ بْنَ الْحَارِث (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (خَطَبَنَا ابْنُ عَبَّاسٍ فِي يَوْمٍ ذي رَدْغٍ فَأَمَرَ الْمُؤَذنَ لَمَّا بَلَغَ حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ قَالَ قُلْ الصَّلَاةُ فِي الرِّحَالِ فَنَظرَ بَعْضهُمْ إِلَى بَعْض فَكَأَنَّهُمْ أَنْكَرُوا فَقَالَ كَأَنَّكُمْ أَنْكَرْتُمْ هَذا إِنَّ هَذا فَعَلَهُ مَنْ هُوَ خَيْرٌ

[٤٠٤] تجرید/١، ژمارە: ٣٦٣، بخاری: ٦٣٢، مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٤٤٠، مسلم: ١٥٩٩.

مِنِّي يَعْنِي النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّهَا عَزْمَةٌ وَإِنِّي كَرِهْتُ أَنْ أُحْرِجَكُمْ. (الحديث ٦٦٨ ـ طرفاه في: ٦١٦، ٩٠١).[٤٠٥]

عەبدوڵلای کوڕی حاریث (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ ئیبنوعەباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) وتاری ڕۆژی هەینی خوێندەوە، هەورە ڕۆژو سەرماو سۆڵەو قوڕو لیتە بوو، لەبەرئەوە فەرمانی کرد بانگدەرەکەی کەگەیشتە سەر (حي على الصلاة) لە باتی ئەوە بڵێ: (الصلاة في الرحال) نوێژکەرەکانیش لەناو خۆیاندا تەماشای یەکتریان کرد، وەك بڵێ ی فەرمایشتەکەی ئیبنوعەباسیان بەدڵ نەبێ. بەڵام ئیبنوعەباس فەرمووی: دەڵێ ی ئەمەتان بەلاوە پەسەند نییەو ڕەخنەتان لێ ی هەیە، بەڵام ئەمە سوننەتی پێغەمبەر خۆیەتی، دیارە کە پێغەمبەر لەهەموو ڕوویەکەوە لەمن باشترەو گشت کردارو گوتارێکی سەرمەشقە بۆ نەتەوەی. ئەوجا فەرمووی: بەڵێ ڕاستە کەنوێژی هەینی فەرزی حەتمی یە، بەبێ بەهانەی ڕەوا نەکردنی دروست نییە، بەڵام باران‌و قوڕو لیتە یەکێکن لەبەهانە ڕەواکانی نەکردنی نوێژی هەینی، لەبەرئەوە حەزناکەم بەگیرتان بهێنم‌و زۆرتان لێ بکەم کەهەردەبێ بێن بۆنوێژی هەینی!(٣٦٣).

## (٤) باب: جواز الصلاة النافلة على الدابة في السفر حيث توجهت
## لە سەفەردا، نوێژی سوننەت بەسواری وڵاخ دروستە

٤٠٦ – عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُسَبِّحُ عَلَى الرَّاحِلَةِ، قِبَلَ أَيِّ وَجْهٍ تَوَجَّهَ، وَيُوتِرُ عَلَيْهَا غَيْرَ أَنَّهُ لاَ يُصَلِّي

[٤٠٥] تجريد/١، ژمارە: ٣٧٨، بخاری: ٦٦٨، ٦١٦، ٩٠١، مسلم: ١٦٠٢.

عَلَيْهَا الْمَكْتُوبَةَ). {الحديث/١٦١٦ = ١٥٨٢ فم. تجريد/١/٤٨٨، رقم: ٥١٤ = ٩٩٩، ١٠٠٠، ١٠٩٥، ١٠٩٦، ١٠٩٨، ١١٠٥}:[٤٠٦]

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لیٚ بیٚ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) بەسواری ولاخ نوێژی سوننەتو نوێژی وەتری بەسەر پشتی ولاخەوە دەکرد، بەرەو هەر لایێ بوایە، بەمەرجێ رووی لە جێگەی مەبەست بوایە، بەلام نوێژی فەرزی بەسەر پشتی ولاخەوە نەدەکرد). {تاج/١/٢٠٣، ژمارە: ٣٩٣، ٣٩٤، ٣٩٥، زنجیرە: ٥٤} .

٤٠٧- عَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلَّى السُّبْحَةَ بِاللَّيْلِ فِي السَّفَرِ عَلَى ظَهْرِ رَاحِلَتِهِ حَيْث تَوَجَّهَتْ بِهِ). (الحديث: ١١٠٤).[٤٠٧]

عامیری کوڕی ڕەبیعە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: لەسەفەردا لەخزمەت پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) بووم، دیومە بەشەو شەونوێژی دەکرد، جارێ دیم بەسواری ولاخەکەی، بەدەم ڕێوە شەو نوێژی دەکرد، ولاخەکەی ڕوی لەهەرلایەك بوایە، مەبەستی نەبوو بەمەرجێ بەرەو ئەو جێگە بڕۆشتایە کەمەبەستی بوو (بڕوانە تاج: ٢١٤/ ١/ ٢/ ٣ = ز-٥٤ ژ-٣٩٣).

## راڤەو شیکردنەوە:

عامیری کوڕی ڕەبیع (ڕەزای خوای لێ بێ) یەکێکە لەموسوڵمانە هەرەپێشینەکان، لەگەڵ ژنەکەیدا کۆچی کرد بۆ حەبەشە، لەپاشا کۆچی کرد بۆ مەدینە، بەدریەیە، لەگشت غەزاکانی تری پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر

---

[٤٠٦] تجرید/١، ژمارە: ٥١٤، بخاری: ٩٩٩، مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٤٤٢ = ١٦١٦.

[٤٠٧] تجرید/١، ژمارە: ٥٥٤، بخاری: ١١٠٤، مسلم: ١٦١٧.

بـێ) بەشـداری کـردوە دووفـەرمودەی لەصـەحیحی بوخـاری دا هەیـە، لـەکاتی ئاژاوەکەی سەردەمی عوسماندا (ڕەزای خوای لـێ بـێ)، عـامیر (ڕەزای خـوای لـێ بێ) شەوێ هەڵدەستێ بۆ شەونوێژ، لەپاش شەونوێژەکەی دەخەوێتـەوە جادێنـە خـەوی، پێـی دەڵـێن: هەڵـسە لـەخودا بپـاڕێرەوە، کەلـەم ئاژاوەیـە پـەنات بـدا، هەروەك بەندە باشەکانی خۆی لێ پەناداوە، ئەویش هەڵدەسـتێتەوەو نوێـژدەکاو نزادەکـا، جالەپاشـا نـەخۆش دەکـەوێ، ئـیتر لـەماڵ دەرناچـێ تائـەو سـاتەی تەرمەکەی دەبەن بۆ گۆڕستان. چەند قسەیێ لەسـاڵی وەفـاتی کـراوە، رەنـگ بـێ ساڵی سی‌و حەوتی کۆچی، کۆچی دوایی کردبێ، رەزاو رەحمەتی خـوای گـەورەی لێ بێ.

٤٠٨- عَن أنَس (رَضي اللهُ عَنْهُ) صلَّى عَلَى حِمَارٍ وَوَجْهُهُ عَنْ يَـسَارِ الْقِبْلَـةِ؟ فَقيلَ له: تُصَلِّي لِغَيْرِ الْقِبْلَةِ فَقَالَ: لَوْلَا أَنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَعَلَهُ لَمْ أَفْعَلْهُ. (الحديث: ١١٠٠).[٤٠٨]

ئەنەسی کوڕی شیرین (ڕەزای خوای لـێ بـێ) فـەرمووی: ئیمـامی ئەنـەس (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) کەلەشـام گەڕایـەوە چـووین بەپیریـەوە بۆپێـشوازی، لـە شوێنێ بەخزمەتی گەیشتین پێی دەڵێن عـەینی تـەمر، تەماشـایم کردبەسواری گوێدرێژێ نووێژی سوونەت دەکا، ڕووی لـەلای چـەپی قیبلەوەیـە، ئالەملایـەوە، منـیش عـەرزیم کـرد: دەبیـنم نوێـژی سـونەتت کـرد، کەچـی ڕووت لەڕووگـە نەبوو؟ فەرمووی: (ئەگەر بۆخۆم پێغەمبەرم بەچاوی خۆم نەدیبایـە، کەلەسـەر ئەم شێوەیە نوێژی سونەتی دەکرد، ئەمەم نەدەکرد! ).

---

[٤٠٨] تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٥٥٢، بخاري: ١١٠٠، مسلم: ٧٠٢ = ١٦١٨.

**راڤەو شیکردنەوە: ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێ:**

١- کـرداری پێغەمبــەر (درووودی خــودای لەســەر بــێ) وەك، گوتــاری، بــەبێ سێودوو، دەبــێ بەبەڵگـە بـۆوەرگرتنی بڕیـار، واتـە: کـرداری ڕێـك وەك گوتـاری سەرچاوەی بڕیارە.

٢- نوێـژی سـوننەت، گەرچـی نوێـژخوێن ڕووشـی لەڕووگـە نـەبێ، بەسـواریی وڵاخ و خۆشـرۆو ماشـێن و فـڕۆك و شـەمەندەفەرو پـاپۆڕو مووشـەك و بـاڵۆن، لەسەفەردا دروستە.

٣- نوێژخوێن لەسەر جێگەیێ نوێژ بخوێنێ،کەپیسی تیابێ، نوێژەکە دروستە، بەمـەرجێ پیـسیەکە لێـی نەکـەوێ، چـونکە وڵاخ کـە پێغەمبـەر خـۆی نوێـژی بەسواریی پشتی کردووە،لەپیسی بەدەرنییە، هەر هیچ نەبێ دەروازەکانی لەشـی پیسییان پێوە هەیە.

**شت شت یاد دەخاتەوە:**

لەیادمــە ســاڵێ شــێخ موحەمــەدی قــەرەداغی خــەتیبی مزگــەوتی گــەورەی سـلێمانی (ڕەحمــەتی خــوای لــێ بــێ)، بۆنــەقڵی وتــارو نوێــژی هــەینی، ســەری میکرۆفونەکەی، بەدەرزیەکی سنجاق دابوو لەقەراخی یەخەی جبەکەی.

جاهەنـدێ لۆکەبەسـەرئەمـەیان کـرد بەمەهانـەیێ لـەدژی خـەتیب، گوایـە: ئەومیکرۆفۆنــە بەســراوە بەوایەرێکــەوە، کەئــەو ســەرەکەی بەســراوە بەچــەن دارتەلێکەوە، کەخواە نـاخواە پیـسی وا لـەبن یـەکێ لەودارتەلانـەدا، شـتی وایـش نوێژ پووچ دەکاتەوە!

دەوروبـەری سـاڵی ١٩٥٥بـوو، عێـراق سـەرجەم لەئێـستا زیـاتر، وەك مەنجـەڵی سەر ئاگر دەکوڵا، لەمزگەوتی بنتەبەق مەلا مستەفای زەڵمی، ئیجازەی مەلایەتی




دا بەیەکێ لەفەقێ مەلا باشەکانی خۆی، ئەوسا باوبوو، بەم بۆنەیەوە ئاهەنگێکی قەشەنگ دەگێڕرا، خەڵکی گەڕەك و گشت مەلاو فەقێو پیاوما قووڵانی شارو قازیو فەرمانبەرانی میری بانگ دەکران،کۆمەڵێ وتاری جۆراو جۆر دەخوێندرانەوە، شەکراو دەخورایەوە، ئیجازە نامەیەکی پیرۆز دەخوێندرایەوە، ئەوجا قازی، یامەلا باشێ، یاگەورە پیاوێ، مێزەرو جبەی لەبەر فەقێ ئیجازەپێ دراوەکە دەکرد، ئیتر فەقێکە دەبوو بەمەلاو کۆتایی بەژیانی فەقێیەتی دەهێنا.

هەندێ کەسیش وەك کەڵەشێری ناوەخت خۆی تێ هەڵ دەقورتاند، ئەم جۆرە کۆبوونەوەی بەهەل دەزانی، بۆپڕوپاگەندەبۆدەستەو بەستەی خۆی، هەڵ ئەسا بەقاچاخی ووتارێکی دەدا!

جاکاك موحەممەدی مامۆستا مەلا عبدولکەریم ومن یەکێك بووین لەم لاکوتانە! قسەکانی من گەرچی کاڵو کرچ بوون، بەڵام چونکە بەیان حاڵی رووداوێکی تاڵی رەقو زەقو ناحەقبوون، هەتا ئێستایش لەناومەلاو فەقێکانا سەدای هەرماوە، پاڵفتەکەیان ئەمە بوو:

(... بەناوی هەموو فەقێکانی ناوچەکەوە، بێزاری لەحاڵی شڕی خۆمان دەردەبڕین، لەبەر ئەوە داوا لەکاربەدەستان دەکەین، کەقوتابخانەی ئایینیمان بۆبکەنەوە، هەتا کەی ئێمەی واریسانی پێغەمبەران، وەك سوالکەرو شوانو گاوان، ئێواران ماڵەو ماڵ نان بچنینەوە بەرێزان! ئێوە هەموتان بەتەلو وایەرکارەباتان ڕاکێشاوە بۆناو ماڵەکانتان، ئێمە بەڕۆژی نیوەڕۆ، بەئاوێنە شەوقی هەتاو رادەکێشین بۆناوحوجرەکانمان، چونکە نەکارەبایان تیادایە، نەڕۆشنایی، بەشەویش لەبەر ڕووناکی چرای کۆڵان دەخوێنین! گوتیشم:




ئـەوەبۆ (مـەجلیس عیلمـی) شـەرمێ لـەخودا ناکـەن، لـەکاتی تاقیکردنـەوەی تەعینـدا، بـەس سـەیری دیاریو دەسـەنەو واسیتەو جلو بـەرگو کورەمـەلایی دەکـەن، گـوێ بەزانـستو مەلایـەتی نـادەن، مزگەوتـەکانیان پڕکـردوە لەمـەلای نەزان، باری وشترێ لۆکەیان لەسەر ناوە، بەلآم بەقـەد حوشترێ عیلمـی یـان پـێ نییە... سەرە واوی وەحـە لـەورگیانا نییـە.. خەلکە بـۆ خـوا بەشایەت بـن رۆژ رۆژی زانستو شەهادەیە، باوی بارە لۆکە بەسەرچوو..!)

کاکەحەمـەش لـەبارەی زەمێکـی خەسـتی چـڕو پـڕی بەنـداوی دوکـانو دەربەندیخانەوە شانی پیا کرد.. گوایە:

(... ئەم بەنداوانە بۆ ئەوە دروست دەکرێن، کەببن بەبنکەی سـەربازی ژێـر دەریـایی ئـەتۆمی! ئەمـەریکای جیهـانخۆر دەیـەوێ وڵاتەکـەمان بکـا بـە پێگـەی ئەتۆمی لەدژی یەکێتی سۆفێت، کـەباوکی گەلانـە، پاسـەوانی ئاشـتی یـە، .. دەی ئێمـە چـۆن رازی دەبـین، کەلـەخاکی ئێمـەوە هێـرش ببرێتـە سـەر رزگارکـەری مرۆڤایـەتی، بڕووخـێ سـەددی دوکـانو دەربەنـدیخان! بمـرێ ئەمـەریکا، بـژی .. و..!). ئەمە پوختەی وتارەکەی حەمـە بـوو . مامۆسـتا مـەلا مـستەفای سـەفوەت هـەبوو ، مەلایـەکی زیرەکـی ڕۆشـنبیر بـوو ، ووتـار بێـژێکی جوان بـوو ، بـەلآم بەقەد عەقـقاد رقی لە کۆمەنیست بوو ، کۆمەڵێ مەلای تـریش هـەبوون، بەقـەد دەروێشێ ئاگایـان لـە رۆژ نـەبوو، لـەم جـۆرە کۆڕانـەدا چاویان لـەبڕیاری مـەلای سەفوەت بوو، کوێرانە دوای دەکەوتن، جا سەفوەت لەم قسانەی (حەمـەی مـەلا) تووڕە بوو، بەمەلا مستەفای زەڵمی گوت: ( مەلا مستەفا! ئەمە ئاهـەنگی ئیجازە وەرگرتنی فەقێ یە، یا مینبەری وتاری ئێستگەی مۆسکۆیە..) ئەوجا گوتی:

(خەڵکە! بۆ خواتان پێ دەڵێم: ئەم بیرو باوەڕە پیسە بەنگـو تلیـاکی گەلانـە، یەکـەم کۆمـاری نەتەوایـەتی کـورد لەمـەهاباد، رزگارکـەری مرۆڤایـەتی، بـاوکی

گەلانی جیهان بەچەند تەنەکەیەك نەوت فرۆشتی، بەچاوی خۆتان دەبینن کەئەم شینو شەپۆڕو گا قۆڕمیان لەبەرچاوی رەشی گەلان نییە، بەڵکوو بۆ هەریسەی نەوتە، لەڕاستیدا دانیشتن لەکۆڕی وادا، با لەناو مزگەوتیشا بێ، کەحەقیقەتی تیا ئاوەژوو دەکرێ تاوانە.. ئەمە مزگەوتە یا خەلییەو شانەی کۆمەنیستە..! ) یا شتێ لەم بابەتەی گوت، مەلا عبداللەی بێژوەیی هەبوو سۆفی شێخی بیارە بوو، لە خزمەت مامۆستا مەلا عبدلکەریمی بیارەدا دانیشتبوو، تاباسی بیارەی بۆ بکا، کەگوێی لەم کەینو بەینە بوو، بەحەمەی فەرموو: ئەم سەگبابە کێیە ئادەی بەشەق بیکەنە دەرەوە!

ئەوجا سەفوەت کۆڕەکەی بەجێ هێشت، کۆمەڵەکەیشی یەکسەر بەدەم جنێو دانەوە کۆڕەکەیان چۆڵ کرد، هەیان بوو دەیگوت: مچە زەڵمی تۆ لەمەت چی؟! تۆ لەم ملەقووتیەت چی؟!

ئەو رۆژگارە لەئێستامان خراپتر، مەردوم چەواشە کرابوون، شاری سلێمانی دەتگوت گرکانە، جەماوەر بەدەنگی دەهۆڵی دوور بەتەواوی تەفرە درابوو، هەتا گەڕەکەکانی ناوی نامۆیان لێ نرابوو، وەك: کۆریا، مۆسکۆ، فیتنام.. تاد، داخەکەم ئێستایش هەندێ کورد بەناوی کوردی ددانیان ئاڵ دەبێتەوە، ئاشق بەناوی بیانین، وەك: حەماسو دێر یاسینئەو هەمکە گوندو شارۆچکە پیرۆزانەی کوردستان، کەقەڵاچۆکران، هیچیان شایانی ئەوەنین، کەبنکەو مەڵبەندەکانی ئەوانیان بەناوە ناو ببرێ!

وەکی تریش کۆمەڵێ مەلای تری نیشتمانپەروەر هەبوو، زوربەیان لەژێرەوە پارتیو شتی تری وابوون، بەدزییەوە بەخۆیان دەگوت: عولەمای ئەحرار، زۆربەی فەقێ کانی ئەو سەردەمە تەفرەدراوی ئەم گوورووپە بوون، چونکە بەخەیاڵ وەك خەوی خۆش مژدەیان دەدا کەبەزوویی لەسەر دەستی

ئیشتراکییەتدا (بەھەشت دێتەوە بۆسەر زەوی..) لەھوتافکێشاندا دەیانفەرموو: (.. سۆسیالیستی ڕێڕەومانە، ئەبو زەڕ پێشڕەومانە !!) بە ئەبووزەڕی غەفارییان دەگوت: ابوالاشتراکیە!

من خۆم یەکێ بووم لە بە تەڵەبوانی ئەم تاقمەیە، بەڵگەیشم ئەم شتانەیە: بەشداریم دەکردلە (دەنگی فەقێ)دا، ڕۆژنامەم بە قاچاخی دەخوێندەوە، لەچاخانەی حەمەڕەق بە بەرگی فەقێیەتییەوە بە سەری ڕووت دادەنیشتم ،دەچووم بۆ سینەما،گوێم لە ڕادیۆ دەگرت،!! هاموشۆی باخی گشتیم دەکرد، هاوبەشی موسابەقەو پێشبڕکێو وەرزشم دەکرد، قژە سەرم درێژ دەکرد، دەی ئەگەر ئەمە حورییەتو سەربەستی نەبێ دەبێ سەربەستی چی تربێ؟!

مامۆستا مەلا سەی غەفوور ھەبوو،مەلای مزگەوتی سەی حەسەن بوو، مرۆڤێکی زاناودانا بوو، لەسەرگورووپی زانایانی سەربەست حلێب دەکرا، لەم کاتەدا بەوردی سەرنجی ئەم فلیمەی دەدا، جاکاتێ سەفوەت وپێرەکەی کۆڕەکەیان بەجێ ھێشت، بە دەنگێکی بەرزی کاریگەر،کە ھەموو لایێ گوێیان لێ بێ، بە سەفوەت ودەستەکەی گوت: (وَامْتَازُوا الیَوْمَ ایّهَا المجرمون!).

ئیترکۆڕەکە بوو بەکۆڕی (بژیو بمرێو بڕوخێ!) من کاتێ گەڕامەوە چووم بۆ خزمەتی مامۆستا مەلا ئەسعەدی مەحوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، گوێم لێ بوو حاجی عەلی خەلیفە بەپەرۆشەوە دەنگوباسەکەی بنتەبەقی بۆ دەگێڕایەوە، دەیگوت: (.. قوربان! دەردەگاکە کەوتۆتە ناو مەلاکانیشەوە، ھەیانە مۆسکۆ بەقیبلەگا دەزانێ، فەقێ سیسەڵەکەی لای تۆیش لەوانە.. ڕەنگ بێ ئێستا گیرابێ، ئای خۆ ئەوەتە ھاتەوە..) مامۆستایش فەرمووی: فەقێ نووری چایەکە گەرمە چایێ بۆ خۆت تێکە..).

قەت قەت مەبەستم لەم قسانە تانە نییە، لەمردوو یا لەزیندوو، خوا یاربێ من لەشتی واوە دوورم، مەبەستم خزمەتە، کەبیکەم تا هەل لە دەستە، چونکە لەزۆر رۆشنبیران دەبیستمەوە، کەئەم جۆرە یادگارانە زۆر بەسوودن، بەتایبەت لەم جۆرە بابەتانە کەوەك ئاوێنەی ئەو کاتەیە وان.

**جا هەر لەم بابەتەیە ئەم چەند یادگارانە :**

مامۆستا شێخ ئەمجەد زەهاویو شێخ صەوواف هاتن، شەو لەنادی مووەزەفین بوون، منو مەلا کەریمی گوڵپیو چەند فەقێیەکی تر، دێنیمان کردن، سکاڵای حاڵی خۆمان لەلاکردن، داوای یارمەتیمان لێ کردن بۆ کردنەوەی فێرگەی ئایینی، ئامادەیی خۆمان دەربڕی بۆ بەشداری کردن لەغەزای جەزائیردا.

جارێ لەسەردەمی عومەر عەلی دا[1] وا دەزانم مەلیك، یا پیاوێکی گەورە هات، ئەرزەو حاڵمان دا پێ ی، بۆ کردنەوەی قوتابخانەی ئایینی، لەسەرا کۆیان کردینەوە، لەئەنجاما من لەگەڵ بارچاوەشێکا لەسەر مەسەلەکە دەممان تێك گیرا، منیان گرت: فەقێ غەفووری کانی سپی کەیی و فەقێ رەئووف شانەخسەییو فەقێ کەریمی سێتەلانی چوون بۆ خزمەتی قازی شێخ محەممەدی خاڵ، گوتیان: قوربان! فەقێ نوری لەسەر مەدرەسە گیراوە،

---

(١) وەك دەزانین پیرۆز خانی دایکی خولە پیزە بانگ کرا بۆشایەتی دان لەسەر عومەر عەلی، بۆ مەحکەمەی شەعب لەبەغدا، تەلەفیزیۆن قسەکانی میمی پیرۆزی نەقڵ کرد، هەر لەیادمە کەوەك ژنێکی کوردی ئازای گوساغ بەعومەر عەلی گوت: دەك ماڵ و مناڵت بە قاورمە بێ وەك جەرگی منت دا بەتەنوورەوە، جالەپاش رۆژگارێ نزاکەی میم پیرۆز گیرابوو، خۆم بەچاوی خۆم لە مزگەوتی ئیبراهیم بەگ، لەکەر کووك تەرمی عومەر عەلی و ژنەکەی و دوو منالیم بینی، لەرێگەی بەغا وەرگەڕابوون، بوو بوون بەقاورمە. ڕاستە کە دوعای مەزلوم رەت نابێتەوە (وەرگێڕ).




کردوویانه به شیوعی لەسەر قسەی حەق، قازی تەشریفی هات، هەر لەیادمە بەموعاون سەرای فەرموو: (ئەمانە ئەهلی عیلمن، سبەینێ دێنە جێگەی ئێمە، بەچاوی سووك تەماشایان مەکەن..) ئیتر بەریان دام.

ئای دنیا! ئێستا لەم مێژووەدا (١٩٩٩) فەقێ نوری، بەرهەمی ئەو کۆششەی دەدووریتەوە، لەپەیمانگەی ئیسلامی کوردستان وانەبێژە، دەرس بەفەقێ دەڵێتەوە، خوایە! هەموو ئاواتێکمان ئاوا بهێنیتەدیو پیتو فەڕ بخەیتە ئەم فێرگە ئیسلامییانە. ئامین. خوایە! بەرەحمەتی خۆت نموونەی ئەزهەری شەریف لەم کوردستانەدا زۆربکەی. ئامین.

## (٥) باب: جواز الجمع بين الصلاتين في السفر
## کۆکردنەوەی دوو نوێژ لە ڕێبواریدا دروستە

٤٠٩- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذا أَعْجَلَهُ السَّيْرُ فِي السَّفَرِ يُؤَخِّرُ صَلاَةَ الْمَغْرِبَ فَيُصَلِّيهَا ثَلَاثا، ثمَّ يُسَلِّمُ، ثمَّ قَلَّمَا يَلْبَث حَتَّى يُقِيمَ الْعِشَاءَ فَيُصَلِّيهَا رَكْعَتَيْنِ، ثمَّ يُسَلِّمُ، وَلَا يُسَبِّحُ بَعْدَ الْعِشَاءِ، حَتَّى يَقُومَ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ. (الحديث: ١٠٩٢).[٤٠٩]

ئیبنو عەمەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەردا سەرنجی پێغەمبەرم دەدا، ئەگەر پەلەی ڕۆشتنی بوایە، نوێژی شێوانی دوادەخست، لەپاشا سێ رکاتی تەواوی نوێژی شێوانی دەکردو سلاوی دەدایەوە، ئیتر بەبێ دواخستن نوێژی خەوتنانی دادەبەستو بەدوورکات دەیکردو سلاوی دەدایەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەفەردا لەپاش نوێژی خەوتنانەوە نوێژی سوونەتی نەدەکرد، هەتا نیوەشەو هەڵ دەسا بۆشەونوێژ!.

---

[٤٠٩] تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٥٥٠، بخاری: ١٠٩٢، مسلم: ١٦٢٢، ١٦٢٥ شیحا.

ئەمەیش دەقی ژمارە: (٤٣٨)ی پوختەی موسلیمە، جوانترین نموونەیە بۆ ئەم بابەتی نوێژ کۆکردنەوە:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوا بوو: ئەگەر زوو بچوایە بۆ سەفەرو پەلەی بووایە، نوێژی نیوەڕۆی دوادەخست، تا کاتی عەصر، ئەوجا هەردووکیانی پێکەوە، بە جەمعە تەئخیر (بە کۆکردنەوەی دواخراو) دەکرد، وە هەروەها شێوانیشی دوا دەخست تا لەگەڵ نوێژی خەوتناندا پێکەوە کۆی دەکردنەوە، ئەوکاتە دەیکردن کە سوورایی کەناری ئاسمان گوم دەبێ!). {تاج/١، زنجیرە: ١٥٦، ژمارە: ٨٩٥}.

٤١٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ - رضي الله عنه - قَالَ كَانَ النَّبِيُّ - صلى الله عليه وسلم - إِذَا ارْتَحَلَ قَبْلَ أَنْ تَزِيغَ الشَّمْسُ أَخَّرَ الظُّهْرَ إِلَى وَقْتِ الْعَصْرِ ، ثُمَّ نَزَلَ فَجَمَعَ بَيْنَهُمَا ، وَإِذَا زَاغَتْ الشمسُ قَبْلَ أن يَرْتَحِلُ صَلَّى الظُّهْرَ ثُمَّ رَكِبَ.[٤١٠]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەسەفەردا وابوو، لەسەر ئەم شێوەیە بوو: ئەگەر بەر لەهاتنی کاتی نیوەڕۆ، کە خۆر بەدیمەن لەناوەڕاستی ئاسمان لادەدا بکەوتایەتە ڕێ، ئەوە نوێژی نیوەڕۆی دوادەخست هەتا کاتی نوێژی عەصر، ئەوجا لە وڵاخەکەی دادەبەزی، وە نوێژی نیوەڕۆو نوێژی عەصری بە جەمع (واتە: بە کۆکردنەوە) دەکرد، بەڵام ئەگەر لەپاش نیوەڕۆ بکەوتایەتە ڕێو دەرچوایە، ئەوا نوێژی نیوەڕۆی بەتەنیا، بەبێ جەمع دەکرد، ئەوجا سواردەبوو، وە دەکەوتەڕێو، لەرێگە دادەبەزیو نوێژی عەصریشی بەتەنیا، بەبێ کۆکردنەوە لەکاتی خۆیدا دەکرد.

---

[٤١٠] بخاری: ١١١١، ١١١٢، مسلم: ١٦٢٣.




## (٦) باب: الجمع بين الصلاتين في الحضر
## كۆكردنەوەی دوو نوێژ لەماڵەوە

٤١١- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى بِالْمَدِينَةِ سَبْعًا وَثَمَانِيًا الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ). (الحديث ٥٤٣- طرفاه في: ٥٦٢، ١١٧٤).[٤١١]

**گێڕانەوەی ئەصڵەکە ئاوایە: قال ابن عباس: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ الله (صلى الله عليه وسلم) ثَمَانِياً وَسَبْعاً جميعاً:**

**ئیبنوعەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارەجارە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینە، نوێژی نیوەڕۆو عەصری کۆدەکردەوەو بەجەمع هەشت ڕکاتی دەکرد، بەڵام بەدووجار، لەپێشا چوار ڕکات نوێژی نیوەڕۆی دەکردو سڵاوی دەدایەوە، دوابەدوای ئەوە یەکسەر چوار ڕکات نوێژی عەصری دەکردو سڵاوی دەدایەوە، هەروەها شێوانو خەوتنانیشی کۆدەکردەوەو بەکۆکردنەوە حەوت ڕکاتی دەکرد بەڵام بەدوسڵاو دانەوە). (ت/١/٢٠٢/٥ ز-٤٩ ژ-٣٧٠ چ-٤ ش/د/ت/ن).**

### ڕوونکردنەوە:

**پێشەوا عەسقەلانی لەفەتحولباریدا، دەفەرموێ: کۆمەڵێ لەپێشەوایانی شەریعەت، بەپێی ڕواڵەت (ظاهیر) ی ئەم فەرموودەیە، بڕیاریان داوە، کەجەمعو کۆکردنەوەی دوو نوێژ لەماڵەوە بۆ نیشتەجێ، بەبێ بەهانە، جاروبار دروستە، بەمەرجێ ئەم جەمعە نەکا بەپیشەی هەمیشەیی، وەك ئیبنوسیرینو ڕەبیعەو**

---

[٤١١] تجريد/١، ژمارە: ٣١٩، بخاری: ٥٤٣، ٥٦٢، ١١٧٤، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٤٣٩ - ١٦٣٢، ١٦٣١.




ئەشھەبو ئیبنولمونذیرو قەففالی کەبیر، خەطابی دەفەرموێ: کۆمەڵێ لەدەستەی فەرموودە (ئەصحابی حەدیث) یش هەمان رایان هەیە، بەڵگەشیان فەرموودەی ژمارە: (٣١٥)ی پوختەی موسلیمە، کەلەکۆتای یەکەیدا دەفەرموێ: عەرزی ئیبنووعەبباسم کرد: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەرچی ئاوای کردوە، بەبێ ئەوە کەلەسەفەردا بێ، یاترسی دوژمنی هەبێ، یاباران بێ، نوێژی کۆکردۆتەوە؟ فەرمووی: مەبەستی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم کۆکردنەوە ئەوەبوو نەتەوەکەی تووشی سەراسێو نارەحەتی نەکا. فەرمایشتی عەسقەلانی هاتە کۆتایی. منیش کەوەرگێڕم دەڵێم: کارکردن بەم رایە بۆهەموو کەسێ دروستە، چونکە ئەم زانایانە هەمووخاوەن پایەی بەرزن، بەلاَم بەمەرجێ، وەك ئەوزانایانە دەفەرموون، کۆکردنەوەکە لەبەرپێویستی بێ، واتە: لەبەرحاجەت، وەك ئەوە نوێژکەر لەوکاتەدا کارێکی گرنگی هەبێ، مەسەلا پزیشك بێو خەریکی عەمەلیات بێ، کرێکاربێو سەرگەرمی کاربێو دەستی نەپەرژێ دەست لەکارەکەی هەڵبگرێ.

ئەمەیش دەقی ژمارە: (٣١٥)ی پوختەی موسلیمە:

ئیبنو عەباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارە جارە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە مەدینە، نوێژی نیوەڕۆو عەصری کۆدەکردەوەو بە جەمع هەشت رکاتی دەکرد، بە دوو سلاَو، هەرچوار رکاتەی بە سلاَوێ، هەروەها شێوانو خەوتنانیشی کۆدەکردەوەو بە جەمع حەوت رکاتی دەکرد، بەدوو سلاَو، سێ رکات بەجیا بە سلاَوێو، چوار رکاتیش بەجیا بە سلاَوێ. لە گێڕانەوەی وەکیعا، سەعیدی کوڕی جوبەیر دەفەرموێ: عەرزی ئیبنو عەباسم کرد: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەرچی ئاوای کردووە؟ فەرمووی: هەتا گەلی ئیسلامی خۆی تووشی ئەرك‌و رەنج نەکا. لە گێڕانەوەی ئەبو

موعاوییەدا سەعیدی کوڕی جوبەیر دەفەرموێ: بە ئیبنو عەباس گوترا: مەبەستی چی بوو لەم کۆکردنەوەیە؟ فەرمووی: مەبەستی ئەوە بووە کە ئۆمەتی، تووشی ناڕەحەتی نەکا. {تاج/١، زنجیرە: ٤٩، ژمارە: ٣٧٠}.

**ڕوونکردنەوە:**

١. ئەم فەرموودەیە لە صەحیحی موسلیما، ئەم دوو ڕشتەیەی هەیە:

أ- ئیمامی موسلیم لە ئەبوبەکری کوڕی ئەبو شەیبەوەو لە ئەبو کوڕەیبەوە، ئەم دوانەیش لە ئەبو موعاوییەوە.

ب- ئیمامی موسلیم لە ئەبو کوڕەیبو لە ئەبو سەعیدی ئەشەججەوە، ئەم دوانەیش لە وەکیعەوە.

موعاوییەو وەکیعیش هەردوکیان: لە ئەعمەشەوە، لە حەبیبی کوڕی ئەبو ثابیتەوە، لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، لە ئیبنو عەباسەوە.

جا ئەبو موعاوییەو وەکیع بەشی یەکەمی فەرموودەکەیان وەك یەك گێڕاوەتەوە، بەڵام بەشی دووەمی فەرموودەکە کەمێ بە جیاوازییەوە گێڕاوەتەوە، وەك لە پێشەوە ڕۆیشت.

٢. شێوانو بەیانی کورت ناکرێنەوە، نوێژی بەیانی کۆناکرێتەوە.

٣. ئەوەوی لە شەرحی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرموێ: کۆمەڵێ لە پێشەوایانی ئایین، دەفەرموون: نوێژ کۆکردنەوە بۆ نیشتەجێ، بەبێ مەهانە ناوبراوەکانیش، وەك بارانو سەفەرو نەخۆشی، دروستە، لەبەر هەندێ کاری پێویست بەڵام بەمەرجێ نەیکەیت بە عادەتو پیشەی هەمیشە.

## (٧) باب: جواز الأنصراف من الصلاة عن اليمين والشمال

## هەڵسانو بەجێ هێشتنی جێنوێژ لەلای ڕاستو لەلای چەپەوە دروستە

٤١٢- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لاَ يَجْعَلَنَّ أَحَدُكُمْ لِلشَّيْطَانِ مِنْ شيئا من صلاتِهِ يَرَى أَنَّ حَقًّا عَلَيْهِ أَنْ لاَ يَنْصَرِفَ إِلاَّ عَنْ يَمِينِهِ، لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كثيراً يَنْصَرِفُ عَنْ شِمَالِهِ). {الحديث/١٦٣٦ = ١٦٠٢ فَتْحُ الْمُلْهِمِ} + {تجريد/١/٤٣٥، رقم: ٤٥٨ = ٨٥٢ فتح الباری}: [٤١٢]

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کەستان کارێکی وامەکەن، کە بەشی شەیتان بکەوێتە نوێژەکەیەوە، بەهۆی ئەوەوە کەوا بزانێ دەبێ هەر لەلای ڕاستەوە لەنوێژ دەرچێ، چونکە من بەچاوی خۆم دیومە کە زۆرجار پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەلای چەپیەوە لە نوێژ دەرچووەو جێ نوێژەکەی بەجێ هێشتووە). {تاج/١/٤٠٣، زنجیرە: ١٣٦، چاپی/١، ژمارە: ٨٠٦، ٨٠٧، ٨٠٨}.

### ڕوونکردنەوە:

١. شەرحەکان دەفەرموون: واباشە کارەکەی لەکوێوە بوو لەو لایەوە دەرچێ، وە دەرچوون لەلای ڕاستەوە، یا لەلای چەپەوە ناپەسەندیو ناباشیی نییە، بەڵام ئەگەر هەردوولا یەکسان بوون، دەرچوون لەلای ڕاستەوە خێرترە.

٢. جاری وا هەیە جێگەو ڕێگە ڕۆڵ دەبینن‌و ڕۆیشتن لە لایەکەوە ناچارییە.

---

[٤١٢] تجريد/١، ژمارە: ٤٥٨ = ٨٥٢، مختصر صحيح مسلم/١، ٣١٥ = ١٦٣٦ شيحا.

## (٩) باب: كراهة الشروع في النافلة بعد شروع المؤذن
## كاتیٚ بانگدەر دەست دەکا بە بانگدان، ئیتر دابەستنی نوێژی سوننەت ناباش و ناپەسەندە

٤١٣- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) ابْنِ بُحَيْنَةَ رجل من الأزدِ قَالَ: (أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى رَجُلًا وَقَدْ أُقِيمَتْ الصَّلَاةُ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ فَلَمَّا انْصَرَفَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَاث بِهِ النَّاسُ وَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الصُّبْحَ أَرْبَعًا الصُّبْحَ أَرْبَعًا). (الحديث ٦٦٣).[٤١٣]

عەبدوڵڵای کوڕی مالیك (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ قامەتی نوێژی بەیانی کرا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕوانی واپیاوێ دوورکات نوێژی سوننەت دەکا، جاکاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەرنوێژیی نوێژی بەیانی بۆوە، نوێژکەرەکان دەورەیان لێ دا، حەزرەت (دروودی خوای لێ بێ) بەپیاوەکەی فەرموو: (چۆن شتی وادەکەی؟ ئەمە لەشێوەی ئەوەیە کەنوێژی بەیانی بەچوار ڕکات بکەی!).

## (١١) باب: إستحباب تحية المسجد بركعتين، وكراهة الجلوس قبل صلاتهما، وأنها مشروعة في جميع الأوقات
## کاتیٚ چوونە ناو مزگەوت سوننەتە بەدوو ڕکات نوێژی سڵاوی مزگەوت دەست پێ بکریٚ، ناباشە دانیشتن بەر لەکردنی ئەم دوو ڕکاتە، وەئەم نوێژی سڵاوی مزگەوتە کاتی دیاریکراوی بۆ نییە، گشت کاتیٚ سوننەتە

٤١٤- عَنْ أَبي قتادةَ السلمي (رَضي اللهُ عَنْهُ) أنَّ رسول الله (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِذا دَخَلَ أَحَدُكُمْ الْمَسْجِدَ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ). (الحديث: ٤٤٤، طرفه في: ١١٦٣).[٤١٤]

---

[٤١٣] تجريد/١، ژمارە: ٣٧٦، بخاری: ٦٦٣، مسلم: ٧١١ - ١٦٤٧.

[٤١٤] تجريد/١، ژمارە: ٣٧١، بخاری: ٤٤٤، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٢٤٨، مسلم: ٧١٤ - ١٦٥٢.




ئـەبو قـەتادە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: سـەروەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکاتێ چوونە ناو مزگەوت، لەپێش ئەوەدا کەدابنیشن دوو ڕکات نوێژی دیاری مزگەوت بکەن). ( ت/١/٣٥٦/ ٥ ز-١١٨ ژ-٧١٠ چ-٤ = ش/ د/ ت/ ن).

## ڕوونکردنەوە:

ئـەبو قـەتادەی ئـەل سـولەمی (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) ناسـراوە بەشاسـواری پێغەمبەری خودا (فـارس رسـول الله) سـەدو حـەفتا فـەرموودەی لـە حـەزرەتـەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) گێڕاوەتەوە، سیازدە فەرموودەی لەبوخاریـدا هەیـە، ئەبوقەتادە دەفەرموێ: ( لەڕۆژی غەزای ذی قـەرەدا، حـەزرەت (دروودی خـوای لـێ بێ) پێی فەرمووم: ( ئەوە چییە بەدەمو چاوتەوە؟) گـوتم: ئـەوە زامـی تـیرە بەرم کەوتووە ئەی پێغەمبەری خـودا! فـەرمووی (دروودی خـودای لەسـەر بـێ): (دە وەرە نزیکمـەوە) منـیش ڕۆیـشتمە بـەردەمی، تفـی پـیرۆزی دا لەجێگـەی تیرەکە، ببڕای ببڕای نەپلی داو نەکولایەوە! لەپـەنجاو چـواری کۆچیدا لەمەدینـە مرد، بێژراویشە: لە (٣٨) دا مـردووە، عەلی نوێژی مردووی لەسەر کردوە.

ئەمەیش فەرموودەیەکی تری (مُتفقٌ علَیهِ) سەبارەت بەم بابەتە:

عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ)، قَالَ: ( دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ وَرَسُولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جَالِسٌ بَيْنَ ظَهْرَانَيِ النَّاسِ، قَالَ: فَجَلَسْتُ، فَقَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « مَا مَنَعَكَ أَنْ تَرْكَعَ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ تَجْلِسَ؟». قَـالَ: فَقُلْـتُ: يَـا رَسُـولَ اللَّهِ رَأَيْتُكَ جَالِسًا وَالنَّاسُ جُلُوسٌ، قَالَ: « فَإِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَـلاَ يَجْلِـسْ حَتَّـى يَرْكَعَ رَكْعَتَيْنِ». {الحديث/١٦٥٢. تجريد/١/٢٨١، رقـم: ٢٧١ = ٤٤٤، ١١٦٣ فـتح الباری} :

ئەبو قەتادە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ، رۆیشتم بۆ مزگەوت، روانیم وا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو خەڵکەکەدا دانیشتووە، ئیتر منیش دانیشتم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: (ئەوە بۆچی لەپێش ئەوەدا کە دابنیشیت دوو رکات نوێژی سوننەتی مزگەوتت نەکرد؟). عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! کەدیم تۆ دانیشتووی و مەردومەکەیش لە خزمەتتا دانیشتوون ئیتر منیش چاوم لە ئێوە کردو یەکسەر دانیشتم. فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (دەی هەرکاتێ کەسێ لەئێوە کە دەچێتە ناو مزگەوتەوە، لەپێش ئەوەدا کە دابنیشێ، با دوو رکات نوێژی دیاری مزگەوت بکا).

**( نزای کاتی هاموشۆی مزگەوت )**

عَنْ أَبِى حُمَيْدٍ - أَوْ عَنْ أَبِى أُسَيْدٍ - قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيَقُلِ: (اللَّهُمَّ افْتَحْ لِى أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ) وَإِذَا خَرَجَ فَلْيَقُلِ: (اللَّهُمَّ إِنِّى أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ)». {الحديث/١٦٤٩}:

ئەبو حومەید (یا ئەبو ئوسەید) (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ دەچنە ناو مزگەوت، لەپێشا سڵاو لە پێغەمبەر بکەن، ئنجا بڵێن: (أَللّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ: خودایە! دەرگاکانی رەحمەتو میهرەبانی خۆتم لێ بکەرەوە) کاتێ چوونە دەرەوە بڵێن: (أَللّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ: خودایە! داوای بەخششو بەهرەی خۆتت لێ دەکەم). {تاج/١/٣٥٥، چاپی یەکەم، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٧٠٦، چاپی دووەم}.

**ڕوونکردنەوە:**

**ئیمامی نەوەوی (پڕ گۆڕی پیرۆزی لە نووری خودا بێ) دەفەرموێ: پوختەی کۆی ئەو زیکرو یادانەی کە لەم کاتەدا سوننەتە بگوترێن ئەمەیە: (أَعُـوذُ بِاللّـهِ العَظِيمِ، وَ وَجْهِهِ الكَرِيمِ، وَسُلْطَانِهِ القَدِيمِ، مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، بِسْمِ اللهِ، وَالحَمْـدُ لِلّـهِ، اللّهُمَّ صَلِّ عَلَى محمد وَعَلى آلِ محمدٍ وَسَلِمْ، أللّهُمَّ اغْفِـرُ لِـي ذُنُـوبِي، وَافْـتَحْ لِـي أَبْـوَابَ رَحْمَتِكَ). واتە:**

**پەنا دەگرم بـە خـودای گـەورە، بـەزاتی پـیرۆزی، بـە دەسـەڵاتی دێرینـی، لـە شەیتانی بەشبڕاو لە ڕەحمەتی خودا، بەناوی خـودا، سوپاس بـۆ خـودا، خودایـە! درووودو سـڵاو برژێنــە بەســەر موحەممــەدو بەســەر کەســوکاری موحەممــەدا، خودایە! لە گوناهەکانم خۆش بە، هـەموو دەرگاکـانی سـۆزو ڕەحمـەتی خـۆتم لێ بکەرەوە). دەفەرموێ: لەکاتی دەرچوونیشا لە مزگەوت هەمان شت بڵێ، بەڵام لە کۆتایدا، لـەباتی (وَافْـتَحْ لِـي أَبْـوَابَ رَحْمَتِـكَ) ئـەمـە بڵـێ: (أللّهُـمَّ إِنّـي أَسْـأَلُكَ مِـنْ فَضْلِكَ). {تاج/١، لاپەڕە: ٣٥٦، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٧٠٨}.**

### (١٢) باب: إستحباب الركعتين في المسجد لمن قدم من سفر أول قدومه
### وا سوننەتە کە ڕێبوار گەیشتەجێ، لەپێشدا بچێ بۆ مزگەوت، لەوێ دوو ڕکات نوێژی هاتنەوە لە سەفەر، لەمزگەوت بکا

**٤١٥- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ كُنْتُ مَـعَ النَّبِـيِّ(صَـلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي غَزَاةٍ فَأَبْطَأَ بِي جَمَلِي وَأَعْيَا فَأَتَى عَلَيَّ النَّبِيُّ(صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ جَابِرٌ: فَقُلْتُ: نَعَمْ قَالَ: (مَا شَأْنُكَ قُلْتُ أَبْطَأَ عَلَيَّ جَمَلِـي وَأَعْيَـا فَتَخَلَّفْـتُ فَنَـزَلَ يَحْجُنُهُ بِمِحْجَنِهِ) ثُمَّ قَالَ: (ارْكَبْ) فَرَكِبْتُ فَلَقَدْ رَأَيْتُهُ أَكُفُّهُ عَنْ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (تَزَوَّجْتَ) قُلْتُ: نَعَمْ قَالَ: (بِكْرًا أَمْ ثَيِّبًا؟) قُلْتُ: بَلْ ثَيِّبًا قَالَ: (أَفَـلا جَارِيَةً تُلاعِبُهَا وَتُلاعِبُكَ) قُلْتُ: إِنَّ لِـي أَخَـوَاتٍ فَأَحْبَبْـتُ أَنْ أَتَـزَوَّجَ امْـرَأَةً تَجْمَعُهُـنَّ**

وَتَمْشُطُهُنَّ وَتَقُومُ عَلَيْهِنَّ قَالَ: (أَمَّا إِنَّكَ قَادِمٌ فَإِذَا قَدِمْتَ فَالْكَيْسَ الْكَيْسَ) ثُمَّ قَالَ: (أَتَبِيعُ جَمَلَكَ؟) قُلْتُ: نَعَمْ، فَاشْتَرَاهُ مِنِّي بِأُوقِيَّةٍ ثُمَّ قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَبْلِي وَقَدِمْتُ بِالْغَدَاةِ فَجِئْنَا إِلَى الْمَسْجِدِ فَوَجَدْتُهُ عَلَى بَابِ الْمَسْجِدِ قَالَ: (أَالآنَ قَدِمْتَ؟) قُلْتُ: نَعَمْ قَالَ: (فَدَعْ جَمَلَكَ فَادْخُلْ فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ) فَدَخَلْتُ فَصَلَّيْتُ فَأَمَرَ بِلالاً أَنْ يَزِنَ لِي أُوقِيَّةً فَوَزَنَ لِي بِلالٌ فَأَرْجَحَ لِي فِي الْمِيزَانِ فَانْطَلَقْتُ حَتَّى وَلَّيْتُ فَقَالَ: (ادْعُ لِي جَابِرًا) قُلْتُ: الآنَ يَرُدُّ عَلَيَّ الْجَمَلَ وَلَمْ يَكُنْ شَيْءٌ أَبْغَضَ إِلَيَّ مِنْهُ قَالَ: (خُذْ جَمَلَكَ وَلَكَ ثَمَنُهُ) (الحديث ٢٠٩٧).[٤١٥]

جابیری كوڕی عەبدوڵلا فەرمووی: لەغەزایەكا لەخزمەتی پێغەمبەردا بووم، وشترەكەم لەژێرما وەستاو لەسوپاكە بەجێ مام، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەدوای سوپاكەوە بوو، تەشریفی هاتو منی گرتەوەو فەرمووی: (جابیر) عەرزم كرد: بەڵێ فەرمووی: (ئەوە چیتە وا جێماوی؟) گوتم: وشترەكەم پەكی كەوتووەو وەستاوە، لەبەر ئەوە بەجێماوم، جا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەوڵاخەكەی خۆی دابەزیو بەگۆچانەكەی خۆی چەند گۆچانێكی دا لەوشترەكەی من، ئەوجا فەرمووی: (سواربە) منیش سواربوومەوە سەرنجم دا وشترەكە واخێرا بوو، ناچاربووم كە جڵەوی بگرمەوە مەبادا پێش وشترەكەی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بكەوێ، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی جابیر! ژنت هێنا؟) گوتم: بەڵێ، فەرمووی: (چیت هێناوە، كچ یا بێوەژن؟) عەرزیم كرد: نەء، بێوەژنێكم هێناوە، فەرمووی: (ئەی بۆچی كچێكت نەهێنا، پێكەوە یاریو دەسبازی بكەن؟!).

[٤١٥] تجريد/١، ژمارە: ٩١٥، بخارى: ٢٠٩٧، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٤٤٣ = ١٦٥٤، ١٦٥٥.




گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆت دەزانی کە عەبدوڵڵای باوکم لە غەزای ئوحوددا شەهید بوو، (بڕ: تاج/٥/١٨٢ف –١ز –٥١) باوکم کەمرد حەوت خوشك، یا هەشت خوشکی سەروقنگی منالکاری بەسەردا بەجێی هێشتم، لەبەر ئەوە بێوەژنێکم هێنا کەکارامە بێ، ماڵو مێردی دیبێ وەك خۆیان کۆڵیو دەسەوسان نەبێ، هەتا سەرپەرشتیان بکاو کۆمەڵیان کۆبکاتەوەو، نەهێڵێ سەریان لێ بشێوێو سەریان شانە بکاو سەرەوکارییان بکا..

جا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) نزای باشی بۆم کردو فەرمووی: (ئەوا دەڕۆیتەوە، کەچویتەوە هۆشیاربە هۆشیار! نەکەی بەهۆی دوورییەوە، بۆسەرجێیی، جڵەوی هۆش لەدەست بدەی!).

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئایا وشترەکەت دەفرۆشیت؟!) گوتم: بەلێ، جا بەئۆقیەیەك کەدەکاتە چل درەمی زیو لێی کریم. ئەنجا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەپێش منەوە گەیشتە ماڵەوە، منیش بۆ سبەینێ گەیشتمەجێو رۆیشتم بۆ مزگەوت، تەماشام کرد پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەبەردەرگای مزگەوت بوو، فەرمووی: (ئێستاکە گەیشتیتەجێ؟) وتم: بەلێ، فەرمووی: (دە وشترەکەت بەردەو بچۆرە ناو مزگەوتو دوو رکات نوێژی سوننەتی گەڕانەوە لەسەفەر لەناو مزگەوتدا بکە) منیش چوومە ژوورەوەو نوێژەکەم کرد. ئەوجا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی بەبیلال کرد ئۆقیەیێ زیوی لەباتی وشترەکەم بۆم کێشاو لەکێشانەکەیشا سلاوی دایەوەو قورس کێشای. منیش پارەکەم وەرگرتو رۆیشتم، تاپشتم هەڵکرد لەوان بەرەو ماڵ کەوتمەڕێ، کەچی گوێم لێی بوو فەرمووی: (ئادەی جابیرم بۆ بانگ بکەرەوە!) منیش لەدڵی خۆما گوتم: ئەی! ئێستا وشترەکەم دەداتەوە بەسەردا وەلەدڵەوە لەوەم پێ ناخۆشتر نەبوو کە

وشـترەکەم بداتـەوە بەسـەردا، کەچـی پێغەمبـەر(دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فەرمووی: (وشترەکەت بەرەوە بۆ خۆت و پارەکەیشی هەر بۆ خۆت) (تاج/٣/٥٥ف ـعز- ٢٥).

## (١٣) باب: إستحباب صلاة الضحى وأن أقلها ركعتان
## نوێژی چێشتەنگاو سوننەتە، لای کەمەکەی دوو ڕکاتە

٤١٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: (إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيَدَعُ الْعَمَلَ وَهُوَ يُحِبُّ أَنْ يَعْمَلَ بِهِ خَشْيَةَ أَنْ يَعْمَلَ بِهِ النَّاسُ فَيُفْرَض عَلَيْهِمْ وَمَا سَبَّحَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُبْحَةَ الضحَى قَط وَإِنِّي لَأُسَبِّحُهَا). (الحديث ١١٢٨- طرفه في: ١١٧٧).[٤١٦]

عائیـشەی هاوسـەری پێغەمبـەر (درودی خـودا لەپێغەمبـەرو ڕەزای خـودا لەکـەس و کـارو هاوسـەرو هاوڕێکـانی) دەفـەرموێ: (گـەلێ جـار وادەبـوو کـە پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) بەردەوام دەبوو لەسەر کارێ، وەحەزیـشی لـەوەبوو کەبـەردەوام بـێ لەسـەری، هـەموو کـاتێ لەسـاتی خۆیـدا ئـەنجامی بـدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەیش دا وازی لەو کـارە دەهێنـا، لەترسـی ئـەوەی کەموسـوڵمانان سەری تێ بکەن و بەرە بەرە فەرزببێ لەسەریان. وەبەپێی زانیاری من، من خـۆم هەرگیز نەمدیوە کە پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بـێ) نوێـژی چێـشتەنگاو بکا، بەڵام من خۆم نوێژی سوننەتی چێشتەنگاو دەکـەم، چونکە هـەواڵم زانیـوە کـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) کردوویـەتی) بڕوانـە: (ریاضـی صالحین بەرگی /٣/ل/٦٩ فەرموودەی ژمارە/ ١١٤١).

---

[٤١٦] تجرید/١، ژمارە: ٥٦٢، بخاری: ١١٢٨، ١١٧٧، مسلم: ٧١٨ = ١٦٥٩ شیحا.





راڤـەو شـیکردنەوە: وەك ڕێـسایەکی گـشتی زاناکـان دەفـەرموون: ( سـوننەت دەریایـەکی گـەورەی فـرە بابەتـە، کـەم کـەس پـەی بەهـەمووی دەبـا، بەتایبـەتی لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا).

ئەمـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ سروشـتی ڕاگەیانـدنی بەرنامـەی ئیـسلامی پـیرۆز، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەفەرمانی خودای گەورە، لەبـەر حیکمـەتێ کـەخودا خـۆی دەیزانـێ، بـەپێی کـاتو شـوێنو بۆنـەو بـوار، لـەکۆڕو دانیشتن و وتارو فەرموودەکانیـدا، بـەگوتارو بـەکردارو بـەڕەزا دەربـڕین لەسـەر شتێ، بەهۆی هۆکاری لەبار بـەپێی سـەردەمی خـۆی، وەك نووسـینو فێرکـردنو پـێ لەبـەرکردن، لەڕێگـەی هاوڕێیـانی یـەوە، بەرنامـەی ئیـسلامی بـەناو گـەلی ئیسلام دا پەخش دەکردەوە.

جا بەبێ گومان، زوربەی یاران، کەم تا زۆر، لەم کارە پـیرۆزەدا هاوبەشـی یـان کردووە، بەڵام کەسیان ئاگایـان لەسـەرجەمی سـوننەت بەتـەواوی نـەبووە، بگـرە زوربـەیان لەبابـەتێکی تایبەتـدا پـسپۆڕی یـان هـەبووە، بـەڵام ئـەوەی لـەکیس ئەمیان چووە، بەنصیبی ئەوی تریـان بـووە، جـا لەسـەر ئـەم بنیاتـە ئـەم چـەند یاسایە دامەزراوە:

١- (چەسپاندن پێش دەخرێ لەسەر نەفیکردن) بۆ نموونە: حەزرەتی عائیشە (ڕەزای خوای لـێ بێ) نەفی ئەوە دەکا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بـێ) نوێژی چێشتەنگاوی کردبێ، بەڵام کەسانی تر لـەهاوڕێیانی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ)، ئەوەیان چەسپاندووە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بێ) نوێژی چێشتەنگاوی کردووە. دەی لـەم بابەتـەدا کـار بـەڕای ئەوانـە دەکـرێ کـەدەڵێن: (نوێـژی چێـشتەنگاو سـوننەتە، چـوونکە پێغەمبـەر خـۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) کردوویەتیو فەرمانیشی کردووە بەکردنی).

وەبایستی رای عائیشەیش ئاوا روون دەکرێتەوە:

(بۆیـە ئاگـای لـەم نوێـژەی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) نـەبووە، چـونکە زوربـەی کـات پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەکاتی چێشتەنگاودا لـەدەرەوەی ماڵەوە بـووە، لـەناو پیاوانـدا بـووە، لەمزگـەوت بـووە، لەسەفەر بووە، لەغەزا بووە، چونکە پیاو کەمتر لـەکاتی چێشتەنگاودا لەماڵەوە دەبـێ، سـەرە رای ئـەوەیش سـوننەت چـەند جـۆرێکی هەیـە، هەنـدێ سـوونەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) جـارێ دوان کردوویـەتی هـەر شـتێکیش یەك جار بفەرموێ بیکەن، یاخۆی بیکا بەسە بۆ کردنی.

**جۆری یەکەم:** بەڵگـەی زۆرو روون لەئایەت‌وفـەرمووده هەیـە لەسـەری، وەك: شـەونوێژو رۆژوی سـوننەت و خێـرو صـەدەقەکردن‌و زۆر شـتی تـری لـەم چەشنانە، کە بەزۆری پێغەمبەر کردونی.

**جـۆری دووەم:** پێغەمبـەر خـۆی (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) چـەند جـارێ لەژیانیدا بۆ تەشریع کردوونی‌و بەس. وەك نوێژ کردن لەناو ماڵی کەعبەدا.

**جۆری سێیەم:** خۆی نەیکردووە، بەڵام بەیارانی خـۆی فـەرمووە بیکـەن، وەك: (بانگدان‌و قامەت کردن‌و ئەو جۆرە سوننەتانەی کەبۆ ئوممەتی سـوننەت بـوون کەبەرابـەر بـەو بیکـەن، لـەرێزو خۆشەویـستی‌و ئـەدەب‌و شـەرم‌و شـکۆ کـردن لـەخۆی‌و کەسوکاری) وەك قورئـان دەفـەرموێ: (يـا أيهـا الـذين آمنـوا لا ترفعـوا أصواتكم فوق صوت النبي) مەبەست لـەوە کـەدەڵێین: ( پێغەمبـەر خـۆی بـانگ‌و قامەتی نەداوە) شێوەی هەمیشەیی یە. چونکە لەسەفەردا جارێ بانگی داوە.

٢- ( کار بەکۆی بەڵگەکان دەکرێ، بەمەرجێ کۆبوونەوەیان دەست بدا)

٣- (زیادەی ثیقە مەقبووله).

تێبینی: پاش ئەوەی کتێب پەیدا بوو زۆر لە زاناکان شارە زایی یان لە زوربەی سوننەتدا پەیدا کرد.

٤١٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ نَوْفَلٍ قَالَ: سَأَلْتُ وَحَرَصْتُ عَلَى أَنْ أَجِدَ أَحَدًا مِنَ النَّاسِ يُخْبِرُنِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَبَّحَ سُبْحَةَ الضُّحَى، فَلَمْ أَجِدْ أَحَدًا يُحَدِّثُنِي عَنْ ذَلِكَ، غَيْرَ أَنَّ أُمَّ هَانِئٍ بِنْتَ أَبِي طَالِبٍ أَخْبَرَتْنِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعْدَ مَا ارْتَفَعَ النَّهَارُ يَوْمَ الْفَتْحِ، فَأُتِيَ بِثَوْبٍ فَسُتِرَ عَلَيْهِ، فَاغْتَسَلَ ثُمَّ قَامَ، فَرَكَعَ ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ، لاَ أَدْرِي أَقِيَامُهُ فِيهَا أَطْوَلُ أَمْ رُكُوعُهُ أَمْ سُجُودُهُ، كُلُّ ذَلِكَ مِنْهُ مُتَقَارِبٌ، قَالَتْ: فَلَمْ أَرَهُ سَبَّحَهَا قَبْلُ وَلاَ بَعْدُ). {الحديث/١٦٦٥ = ١٦٣٢. بخاري/١١٠٣، ١١٧٦، ٤٢٩٢}:[٤١٧]

عەبدوڵڵای کوڕی حاریثی کوڕی نەوفل فەرمووی: پرسیاری زۆرم کرد، وە زۆر مەبەستم بوو کە کەسێکم دەست بکەوێ، کە لێی بپرسم: کە ئایا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی سوننەتی چێشتەنگاوی دەکرد یانا؟ کەسم دەست نەکەوت کە لەم بارەیەوە قسەی لێ بکا، تەنیا ئوم هانیئی کچی ئەبو طالیب نەبێ، ئەو هەواڵی پێمدا: کە لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا، کاتێ خۆر بەرزەوە بوو، چووم بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) سلاوم لێکرد، ڕوانیم کەوا خەریکە خۆی ئەشۆرێ، فاتیمەی کچی بەجلکێ پەردەی بۆ گرتبۆوە، جا کە لە خۆشۆردنەکەی بۆوە، هەشت ڕکات نوێژی سوننەتی بە دوو ڕکات، دوو ڕکات کرد، ئەو حەلەش ڕێك چێشتەنگاو بوو، نازانم تیا ڕاوەستانی بۆ قورئان خوێندنو ڕوکووع بردنیو کوڕنووش بردنی، کامیان درێژتر بوون، هەموویانی لەیەکەوە لە کورتیو درێژیدا لە یەکترەوە

---

[٤١٧] بخاری: ١١٠٣، ١١٧٦، ٤٢٩٢، مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٣٦٦ = ١٦٦٥، ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا: ١٦٦٥.

نزيك بوون. ئوم هانيئ فەرمووی: من بەش بەحاڵی خۆم نە لەوەپێش، نە لەوە پاش نەمبینیوە کە پێغەمبەر ئەم نوێژی چێشتەنگاوەی کردبێ). {بڕوانە: ریاض/٣، لاپەڕە: ١١٧، زنجیرە: ٢٠٦ و ٢٠٧ لە ژمارە: ١١٣٩ وە هەتا ژمارە: ١١٤٣}. {تاج/ ژمارە: ٩٥٦}.

ئەمە دەقی ژمارە (٣٦٦)ی (مختصر صحيح مسلم)ە، ئەمەیش لەدواوە دەقی ژمارە (١١٠٣)ی صەحیحی بوخاریە، کە دانەری ئەم پەڕاوی (اللؤلؤ والمرجان) ڕاگوێزی کردووە لەم شوێنەدا:

حەفصی کوڕی عومەر فەرمووی: شوعبە فەرمووی: ئیبنو ئەبو لەیلا فەرمووی: (کەسێ بەئێمەی ڕانەگەیاندووە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی چێشتەنگاوی کردووە، تەنیا ئوم هانیئی کچی ئەبو تالیب نەبێ، کە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا، لەماڵی ئوم هانی خۆی دەشۆرێ، ئەوجا هەشت ڕکات نوێژی سوننەتی چێشتەنگاو دەکات، نەمدیوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی سووکەڵەی تری وابکا، بەڵام چەمینەوەو کوڕنووشەکانی بەتەواوی ئەنجام دەدا).

٤١٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي بِثَلَاث، لَا أَدَعُهُنَّ حَتَّى أَمُوتَ: صَوْمِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَصَلَاةِ الضحَى، وَنَوْمٍ عَلَى وِتْرٍ.[٤١٨]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دۆستی ئازیزم پێغەمبەری خۆشەویستم (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم سێ ئامۆژگاریەی کردوم، هەتا دەمرم تەرکیان ناکەم: لەهەموو مانگێ سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبم، وەهەموو ڕۆژێ

[٤١٨] تەجرید/١، ژمارە: ٥٨٣، بخاری: ٦١٨، ١١٧٣، ١١٨١، مسلم: ١٦٦٩، ١٦٧٠، ١٦٧١.

بەلایەنی کەمەوە دوورکات نوێـژی چێشتەنگاو بکـەم، وەهـەموو شـەوێ لـەپێش خەوتندا نوێژی وەتر بکەم. (ت/١/٤٨٥-ش/د/ت/ن). (الحديث: ١١٧٦ فتح الباري).

## (١٤) باب: إستحباب ركعتي سنة الفجر والحث عليهما
## دوو ڕکات نوێژی سوننەت لەپێش نوێژی بەیانیدا زۆر سوننەتە

٤١٩- عَنْ حَفْصَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْها) (أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ كَانَ إِذا اعْتَكَفَ الْمُؤَذنُ لِلصُّبْحِ وَبَدَا الـصُّبْحُ صَـلَّى رَكْعَتَـيْنِ خَفِيفَتَـيْنِ قَبْـلَ أَنْ تُقَـامَ الصَّلَاةُ). (الحديث٦١٨ ـ طرفاه في: ١١٧٣، ١١٨١).[419]

حەپسە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: کـاتێ بـەیانی دەداو بانگـدەر لـەبانگ دەبـۆوە، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دوورکـات نوێـژی سوننەتی سووکەڵەی دەکرد، بەرلەوە قامەت بکرێ بۆنوێژی بەیانی.

روونکردنەوە:

حەفـصە هاوسـەری پێغەمبـەری خودایـە، لەسـاڵی سـێیەمی کۆچـیدا بەبێوەژنی لەدوا عائیشە شووی کرد بـە پێغەمبـەر، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (جوبرائیـل پـێ ی فـەرمووم: حەفـصە ڕۆژووەوانێکـی باش و شەونوێژکەرێکی زۆرچاکە، لەبەهەشتیشا هاوسەری تۆیە!) حەفصە هـەتا مرد هەمیشە بەرۆژووبوو، کچی عومەری کوڕی خەطاب بـوو،لەژنەکۆچکارەکان بوو، سەروەسێتی باوکی بوو. پێنج فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە خوێنەوار بوو، بڕوانـە: بـەرگی پێنجـەمی تـاجول ئوصـولّ بـەکوردی لاپـەڕە/ ١٦٢ ە= تـاج-٣ ز-٣٥ هەتا زنجیرە ٤١.

---

[419] تەججرید/١، ژمارە: ٣٥٩، بخاری: ٦١٨، ١١٧٣، ١١٨١، مسلم: ٧٢٣ - ١٦٧٣.

٤٢٠- عَنْ عَائِشَةَ كَانَ النَّبِيُّ - صلى الله عليه وسلم - يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ بَيْنَ النِّدَاءِ وَالإِقَامَةِ مِنْ صَلاَةِ الصُّبْحِ.[٤٢٠]

**عائيشه فەرمووى: (جاران دەستووری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وابوو، لەنێوانی بانگی بەیانیو قامەتدا، دوورکات نوێژی سووکەڵەی سوننەتی دەکرد).**

٤٢١- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُخَفِّفُ الرَّكْعَتَيْنِ اللَّتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ الصُّبْحِ حَتَّى إِنِّي لَأَقُولُ هَلْ قَرَأَ بِأُمِّ الْكِتَابِ. (الحديث: ١١٦٥).[٤٢١]

**عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) ئەوەندە بەگورجی دووڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی دەکرد، تەنانەت لەدڵی خۆمەوە دەم گوت: چۆن فریای خوێندنی فاتیحا دەکەوێ! (ت/١/٣٠٦-ش/د/ن).**

٤٢٢- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: لَمْ يَكُنْ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى شَيْءٍ مِنْ النَّوَافِلِ أَشَدَّ مِنْهُ تَعَاهُدًا عَلَى رَكْعَتَيْ الْفَجْرِ. (الحديث: ١١٦٣).[٤٢٢]

**عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) هیچ سوننەتێکی تری وەك دووركاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی ئاوابەباشی سەرەوکاری نەدەکرد! . (ت/١/٣٠٦-ش/د).**

---

[٤٢٠] **بخاری: ٦١٩، مسلم: ١٦٨٠.**

[٤٢١] **تجرید/١، ژماره: ٥٨٢، بخاری: ١١٦٥، مسلم: ٧٢٣ = ١٦٨١.**

[٤٢٢] **تجرید/١، ژماره: ٥٨١، بخاری: ١١٦٣، مسلم: ٥٢٤ = ١٦٨٢.**

## (١٥) باب: فضل السن الراتبة قبل الفرائض وبعدهن وبيان عددهن
## خێری سوننەتە دامەزراوەکانی پێش‌و پاشی نوێژە فەرزەکان

٤٢٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَبْلَ الظُّهْرِ سَجْدَتَيْنِ، وَبَعْدَهَا سَجْدَتَيْنِ، وَبَعْدَ الْمَغْرِبِ سَجْدَتَيْنِ، وَبَعْدَ الْعِشَاءِ سَجْدَتَيْنِ، وَبَعْدَ الْجُمُعَةِ سَجْدَتَيْنِ، فَأَمَّا الْمَغْرِبُ وَالْعِشَاءُ وَالْجُمُعَةُ، فَصَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَيْتِهِ». {الحديث/١٦٩٥ = ١٦٦٢ فَتْحُ الْمُلْهِمِ. تجريد/١/٤٦٩، رقم:٤٩٥ = ٩٣٧، ١١٦٥، ١١٧٢، ١١٨٠}:[٤٢٣]

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرموی: بۆ خۆم، لە خزمەتی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) ئەم نوێژە سوننەتانەم ئەنجام داوە: دوو رکاتم لەپێش نوێژی نیوەڕۆوە کردووە، وە دوو رکات لەپاشیەوە، وە دوو رکات لەپاش نوێژی شێوانەوە، وە دوو رکات لەپاش نوێژی خەوتنانەوە، وە دوو رکات لەپاش نوێژی هەینییەوە، ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) دەیفەرموو: (بەڵام سوننەتەکەی پاش شێوان‌و سوننەتەکەی پاش خەوتنان‌و سوننەتەکەی پاش نوێژی هەینیم، لە خزمەت حەزرەتدا، لە ماڵەکەی ئەودا دەکرد، نەك لە مزگەوت). {تاج/١/٣٠٨، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: ٦٠٣. {ریاض/٣/٩٥، زنجیرە: ١٩٥، ژمارە: ١٠٩٨} .

### روونکردنەوە:

١. وا دەردەکەوێ، لە رووکاری فەرموودەکەوە، کە مەبەست لەوەی کە ئیبنو عومەر دەفەرموێ: (لە خزمەت پێغەمبەردا، ئەم نوێژە سوننەتانەم ئەنجام داوە) مەبەست مەعییەتی شوێن‌و کاتە، وە مەبەست کردنیان بە جەماعەت

---

[٤٢٣] مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٦٩٥، تجرید/١، ژمارە: ٤٩٥ - ٩٣٧.

نییە لە پشتیەوە، هەڵیش دەگرێ کە مەبەست کردنیان بە جەماعەت بێ لەگەڵ پێغەمبەردا،

٢. **کورت و پوخت:** (نوێژە سوننەتەکانی پاش و پێشی نوێژە فەرزەکان، لە مزگەوت بکرێن مسۆگەر ترن، ئەگەر ترسی ئەوەی هەبوو، کە لە ماڵەوە، لەبەر بێ جێگەیی و بێ رێگەیی و میوان و شتی وا بۆی نەکرێ، یا مەلای مزگەوت بێ، لە بردنەوەی سوننەتەکان بۆ ماڵەوە، ئاژاوەیێ دروست ببێ، وەك ئەوە نوێژ خوێنەکان بە هەڵە لە حاڵەکە حاڵی ببن و بڵێن: کە مەلاکە ئەم نوێژە سوننەتانە نەکا ئیتر من بۆ بیکەم، بەهەر حاڵ کردنی ئەم سوننەتانە، لە مزگەوت هیچ ناباشییەکی تیادا نییە، وە کەسێ بڵێ: ئەم جۆرە سوننەتانە یا دەبێ لە ماڵەوە بکرێن، یا دەبێ هەر نەکرێن، ئەوە بوختانە بەدەم یاسا نامەی خوداوە!).

## (١٦) باب: جواز النافلة قائما وقاعدا وفعل بعض الركعة قائما وبعضها قاعدا
## شەونوێژ بەڕاوەستانەوەو بەدانیشتنەوە دروستە

٤٢٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْرَأُ فِي شَيْءٍ مِنْ صَلاَةِ اللَّيْلِ جَالِسًا، حَتَّى إِذَا كَبِرَ قَرَأَ جَالِسًا حَتَّى إِذَا بَقِيَ عَلَيْهِ مِنَ السُّورَةِ ثَلاَثُونَ أَوْ أَرْبَعُونَ آيَةً قَامَ فَقَرَأَهُنَّ، ثُمَّ رَكَعَ». {الحديث/١٧٠١ = ١٦٦٨ فم. تجريد/١/٥٣٣، رقم: ٥٥٧ = ١١١٨، ١١١٩، ١١٤٨، ١١٦١، ١١٦٨، ٤٨٣٧}:[٤٢٤]

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هەرگیز نەمدیوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە دانیشتنەوە شەو نوێژ بکا، هەتا کاتێ چوو

---

[٤٢٤] تجرید/١، ژمارە: ٥٥٧ = بخاری: ١٠١٩، مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٣٨٤ = ١٧٠١ شیحا.

بەسالاّ، ئیتر بە دانیشتنیشەوە قورئانی ناو نوێـژی شـەو نوێـژی دەخوێـنـد، هـەتا دەیویست کە روکوع ببا، ئەوسا هەڵدەستایە سەرپێ، بەراوەستانیشەوە دەوری سیی چل ئایـەتی تریـشی دەخوێنـد ئەوسا روکوعی دەبـرد، لـەرکاتی دووەمیـشا هەمان شتی دەکرد).

٤٢٥- عَنْ عَائِشَةَ، أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ، (رَضي الله عَنْهـا) (أَنَّهَـا لَـمْ تَـرَ رَسُـولَ اللهِ (صَلِّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلِّمَ) يُصَلِّي صَلاَةَ اللَّيْلِ قَاعِداً قَط حَتَّى أَسَـنَّ، فَكَـانَ يَقْـرَأُ قَاعِـداً، حَتَّى إِذا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ قَامَ، فَقَرَأَ نَحْـواً مِـنْ ثلاَثـينَ آيَـةً أَوْ أَربَعِـينَ آيَـةً، ثـمَّ رَكَـعَ). (لحديث: ١١١٨- أَطرَافُهُ فْي: ١١١٩، ١١٤٨، ١١٦١، ١١٦٨، ٤٨٣٧).

وَعَنْهَا (رَضي الله عَنْها) فِي رِوَايَةٍ: (ثمَّ يَفْعَلُ فِي الرَّكْعَةِ الثانِيَةِ مِثلَ ذالِكَ فَإِذا قَضى صَلاَتَهُ نَظرَ: فَإِنْ كُنْتُ يَقْظى تَحَدَّث مَعِي، وَإِنْ كُنْتُ نَائِمَةً اِضطجَعَ (صَلِّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلِّمَ). (الحديث: ١١١٩).[٤٢٥]

عائیشە، دایکی موسوڵمانان (ڕەزای خوایان لـێ بـێ) فـەرمووی: هـەرگیز نەمدیوە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بەدانیـشتنەوە شـەو نوێـژبکا، هـەتا کاتـێ چـوو بەسـالاّ، ئـیتر بەدانیـشتنەوە قورئـانی نـاو نوێـژی شـەونوێژی دەخوێنـد، هـەتا دەیویـست کـە ڕوکـوع ببـا، ئەوسـا هەڵدەسـتایە سـەرپێ، بەراوەستانیـشەوە دەوری سـی چـل ئایـەتی تریـشی دەخوێنـد ئەوسـا روکـوعی دەبـرد. لەگێڕانەوەیـەکی تـردا عائیـشە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرموی: ئـیتر لـەرکاتی دووەمیـشا هـەمان شـتی دەکـردەوە، جاکاتـێ لەشـەو نوێژەکـەی دەبـۆوە تەماشـای دەکـرد: ئەگـەر مـن بەخەبـەر بومایـە ئەواقـسەی لەگـەڵ دەکـردم، ئەگەرمن خەوتوو بومایە ئەوا ئەویش ڕادەکشا (دروودی خودای لەسەر بێ).

---

[٤٢٥] تجرید/١، ژمارە: ٥٥٧، بخاری: ١١١٨، ١١١٩.

## (١٧) باب: صلاة الليل وعدد ركعات النبي صلى الله عليه وسلم في الليل وأن الوتر ركعة، وأن الركعة صلاة صحيحة

## باسی شەونوێژو ژمارەی ڕکاتەکانی شەونوێژی پێغەمبەرو ئەوەیش کە وەتر بەیەك ڕکاتیش دەبێ، وە تاقە ڕکاتێ دائەنرێ بەنوێژێکی دروستی تەواو

٤٢٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) أنّها (سئلت: كَيْفَ كَانَتْ صَلَاةُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي رَمَضانَ؟ فَقَالَتْ: مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَزِيدُ فِي رَمَضانَ وَلَا فِي غَيْرِهِ عَلَى إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً يُصَلِّي أَرْبَعًا فَلَا تَسَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطولِهِنَّ ثمَّ يُصَلِّي أَرْبَعًا فَلَا تَسَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطولِهِنَّ ثمَّ يُصَلِّي ثلَاثا قَالَتْ عَائِشَةُ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَتَنَامُ قَبْلَ أَنْ تُوتِرَ؟ فَقَالَ يَا عَائِشَةُ إِنَّ عَيْنَيَّ تَنَامَانِ وَلَا يَنَامُ قَلْبِي). (الحديث: ١١٤٧ طرفاه في: ٢٠١٣، ٣٥٦٩):[٤٢٦]

ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرمووی: لەعائیشەی هاوسەری پێغەمبەرم پرسی: لەشەوانی مانگی ڕەمەزانا، شەونوێژی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چۆن بوو؟ فەرمووی: (بەپێی ئاگاداری من بەشێوەی گشتی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نە لەشەوانی مانگی ڕەمەزاناو، نە لەشەوانی مانگی تردا، لە یازدە ڕکات شەونوێژ، زیاتری نەدەکرد، لەپێشا چوار ڕکاتی دەکرد، مەپرسە لەجوانیو درێژی یان، ئنجا چوار ڕکاتی تریشی دەکرد، مەپرسە لەجوانیو درێژییان، ئنجا سێ ڕکاتی تریشی دەکرد. عائیشە فەرمووی: عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! بەرلەوە وەتر بکەی جار جارە دەتبینم دەخەوی؟ فەرمووی: ( ئەی عائیشە! چاوەکانم دەخەون بەڵام دڵم ناخەوێ!). (ت/ ١/ ٤٩٨/ ٥ ز-١٨٢ ژ-٩٨٢ = ش/ د/ ت/ن).

---

[٤٢٦] تجريد/١، ژمارە: ٥٧٤، بخاری: ١١٤٧، مسلم: ٧٣٨ = ١٧٢٠، ترقيم شيحا لصحيح مسلم.

**ڕوونکردنەوە:**

**ئەمە مانای وانییە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمانگی ڕەمەزانا زیاتر لەمانگەکانی تر سەرگەرمی تاعەت نەبووە، ڕاستە کە کردەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەمیشەیی بووە، بەڵام فەرموودەی تری دروست زۆرە کەبەڵگەن لەسەر:**

**١- پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمانگی ڕەمەزاندا سەرگەرمی طاعەتو شەونوێژو قورئانخوێندنو ڕەوان کردنی قورئانو خێرو صەدەقە کردنو خەڵوە کردن بووە، بەتایبەتی لەدەی دوایی ڕەمەزاندا، بەپێ ی فەرموودەی ژمارە شەشی تەجریدی بوخاری، لەهەموو شەوەکانی ڕەمەزانانا، حەزرەتی جوبرائیل (سەلامی خوای لەسەر بێ) تەشریفی دەهات بۆ خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قورئانی پێ ڕەوان دەکرد، وە بەپێی فەرموودەی ساخ، شەوی وابووە لەرەمەزانا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەرەتای شەوەوە، ماڵو منداڵو خێزانی خۆیو موسوڵمانانی لەمزگەوت کۆ کردۆتەوەو هەتا نزیکی بەیانی تەراویحی بەجەماعەت بۆ کردوون، تەنانەت مەترسی ئەوەیان بووە کە فریای پارشێو نەکەون، پێغەمبەر ئەوەندە لەشەونوێژا ڕاوەستابوو لاقەکانی پەنەمابوون، شەوی وابووە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سێ جار لەخەو هەڵساوە بۆ شەونوێژ. کەواتە: ئەگەر کەسێ، هەتا دەتوانێ شەونوێژێکی زۆری دوورو درێژ بکا، جێگەی خۆیەتی، چونکە شتی وا لەسوننەت دا چەسپاوە. (بڕوانە: تاج١ ز-١٨٢ ژ-٩٧٨ هەتا ژمارە ١٠٠١ بەتایبەتی ژمارە ٩٨٤، ٩٩٤).**

٤٢٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللَّهُ عَنهَا) قَالَتْ: (كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي مِنْ اللَّيْلِ ثلَاث عَشْرَةَ رَكْعَةً مِنْهَا الْوِتْرُ وَرَكْعَتَا الْفَجْرِ). (الحديث: ١١٤٠).[٤٢٧]

**عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرو هاوەڵەکانی) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەوەترو دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش بەیانییەوە، بەشەو سیازدە ڕکات نوێژی سوننەتی دەکرد). (تاج/١، زنجیرە: ١٨٢، ژمارە: ٩٨١ = ش/د/ت/ن).**

٤٢٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللَّهُ عَنهَا) أنها سألت: (كَيْفَ كَانَتْ صَلَاةُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِاللَّيْلِ؟ قَالَتْ: كَانَ يَنَامُ أَوَّلَهُ وَيَقُومُ آخِرَهُ فَيُصَلِّي ثمَّ يَرْجِعُ إِلَى فِرَاشِهِ فَإِذا أَذنَ الْمُؤَذنُ وَثبَ فَإِنْ كَانَ بِهِ حَاجَةٌ اغْتَسَلَ وَإِلَّا تَوَضأَ وَخَرَجَ). (الحديث: ١١٤٦).[٤٢٨]

**ئەسوەد (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لە حەزرەتی عائیشەم پرسی: بەشەو شەونوێژی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چۆن بوو؟ فەرمووی: ( زۆر جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەرەتای شەوەوە دەخەوت، لەکۆتایی شەوەوە هەڵدەستا بۆ شەونوێژ، دەسنوێژێکی جوانی دەشۆردو دەستی دەکرد بەشەونوێژ، کاتێ شەونوێژەکەیی تەواو دەکرد، دەگەڕایەوە بۆ ناو نوێنی نوستنەکەی، جا کاتێ کەبانگبێژ بانگی بەیانی دەدا، لەناو نوێنەکە رادەپەڕی، ئەگەر کاری بەخۆشۆردن هەبوایێ خۆی دەشۆردو غوسڵی دەکرد، دەنا دەسنوێژی دەگرتو دەردەچوو بۆ مزگەوت، لەوێ پێشنوێژی نوێژی بەیانی بۆ هاوڕێیانی دەکرد).**

---

**[٤٢٧] تجرید/١، ژمارە: ٥٦٨، بخاری: ١١٤٠، مسلم: ١٧١٧، ١٧١٣ شیحا.**

**[٤٢٨] تجرید/١، ژمارە: ٥٧٣، بخاری: ١١٤٦، مسلم: ٧٣٩ = ١٧٢٥.**

٤٢٩- عَنْ مَسْرُوق قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهَا) (أَيُّ الْعَمَلِ كَانَ أَحَبَّ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَتْ: الدَّائِمُ، قُلْتُ: مَتَى كَانَ يَقُومُ؟ قَالَتْ: كَانَ يَقُومُ إِذا سَمِعَ الصَّارِخَ) (الحديث: ١١٣٢).[٤٢٩]

مەسرووق دەفەرموێ: عەرزی عائیشەم کرد: کام کاری باش لەلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆشەویست بوو؟ فەرمووی: (خۆشەویسترین کردەوەی باش بەلای پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) کردەوەی باشی هەمیشەیی بوو. واتە: باشترین ئایینداری لەلای خودا ئەوەیە کەخاوەنەکەی بەردەوام بێ لەسەری) عەرزیم کرد: ئەی کەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخەو هەڵدەسا بۆ شەونوێژ؟ فەرمووی: ( کاتێ گوێی لەکەڵەشێری نیوە شەو دەبوو دەیخوێند هەڵدەسا بۆ شەونوێژ) (وفي رواية عنها قالت: ما ألفاه السحر عندي إلا نائماً. تعني النبيُّ (دروودی خودای لەسەر بێ).

لەم گێڕانەوەیەدا عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ( ئەو شەوانەی کە پێغەمبەر لەنۆرە شەوی خۆما لەلای من دەبوو، لەنیوە شەودا، کەکەڵەشێری نیوە شەو دەیخوێند هەڵ دەسا بۆ شەونوێژو نوێژێکی زۆری جوانی دەکرد، لەپاشا دەخەوتەوە، ئیتر هەتا بەرەبەیان زۆربەی کات دەخەوتەوە).

٤٣٠- عَنْ عَائِشَةَ - رضى الله عنها - قَالَتْ مَا أَلْفَاهُ السَّحَرُ عِنْدِى إِلاَّ نَائِمًا . تَعْنِى النَّبِىَّ (صلى الله عليه وسلم).[٤٣٠]

عائیشە فەرمووی: (پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەگەر بەشەو لەلای من بوایە، دەمبینی لەبەرەبەیانا دەخەوت).

---

[٤٢٩] تجرید/١، ژمارە: ٥٦٥، بخاری: ١١٣٢، مسلم: ٧٤١ = ١٧٢٧.

[٤٣٠] بخاری: ١١٣٣، مسلم: ١٧٢٨ شیحا.

٤٣١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) قَالَتْ: مِنْ كُلِّ اللَّيْلِ قَدْ أَوْتَرَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، مِنْ أَوَّلِ اللَّيْلِ وَأَوْسَطِهِ، وَآخِرِهِ فَانْتَهَى وِتْرُهُ إِلَى السَّحَرِ. {الحديث/١٧٣٣ = ١٧٠١ فم. تجريد/١، لاپەڕە: ٤٨٧، رقم: ٥١٢ = ٩٩٦}:[٤٣١]

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەپاش کردنی نوێژی خەوتنان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەهەموو کاتێکی شەودا، وەتری دەکرد، هەندێ جار لە سەرەتای شەوەوە دەیکرد، هەندێ جار لە ناوەڕاستی شەودا دەیکرد، وە هەندێ جاریش لە دوادوای شەودا، لەپێش بانگی بەیانیدا دەیکرد، بەڵام لەپێش مردنیدا هەر بەرەبەیان وەتری دەکرد). {تاج/١، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٦١٣}.

## (٢٠) باب: صلاة الليل مثنى مثنى، والوتر ركعة من آخر الليل
## شەونوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە، وەتریش یەك ڕکاتە لەکۆتایی شەوەوە

٤٣٢- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما) أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ صَلَاةِ اللَّيْلِ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (درووودی خودای لەسەر بآ) (صَلَاةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذا خَشِيَ أَحَدُكُمْ الصُّبْحَ صَلَّى رَكْعَةً وَاحِدَةً، تُوتِرُ لَهُ مَا قَدْ صَلَّى). (الحديث: ٩٩٠).[٤٣٢]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لەپێغەمبەری پرسی: شەو نوێژچۆنە؟ پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (شەونوێژ دووركات دووركاتە، كەترسی هەڵهاتنی بەیانت هەبوو، تاقەیەك ركات

---

[٤٣١] تجريد/١، ژمارە: ٥١٢، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٣٩١ - ٧٤٥ = ١٧٣٣، مسلم ترقيم شيحا.

[٤٣٢] تجريد/١، ژمارە: ٥١٠، بخاری: ٩٩٠، مسلم: ١٧٤٥، ١٧٤٦.

بکە، ئەوەدەبی بەوەتری ئەونوێژانەی کەکردووتن). (ت/١/٣١٢،٤٩٧ ز-١٨ ژ-٩٧٩ = ش/د/ت/ن).

٤٣٣- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ اجْعَلُوا آخِرَ صَلَاتِكُمْ بِاللَّيْلِ وِتْرًا. (الحديث: ٩٩٨).[٤٣٣]

ئیبنوعومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: (وەتربکەن بەدواترین نوژی شەوتان!). (ت/١/٣١١/٣-ش/د/ت).

## (٢٤) باب: الترغيب في الدعاء والذكر في آخر الليل والإجابة فيه
## هاندان لەسەر نزاو پاڕانەوەو یادی خودا لەکۆتایی شەودا، وەنزاو پاڕانەوەو یادی خودا لەوکاتەدا گیرایەو قەبووڵە

٤٣٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) قَالَ: «يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِي كُلِّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرُ، فَيَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ، وَمَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ، وَمَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ». {الحديث: ١٧٦٩ =تجريد البخاري بالكوردى/١، رقم: ٥٧٢ = ١١٤٥، ٦٣٢١، ٧٤٩٤ فتح الباري. أبو داود. صلاة: ١٣١٥. ترمذي. دعوات: ٣٤٩٨. تحفة الأشراف: ١٣٤٦٣}:[٤٣٤]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لە سێیەکی دوایی شەودا، هەموو شەوێ، ساڵ دوازدە مانگە، خودای پەروەردگاری پیرۆزو گەورەمان، دێتە خوارەوە بۆ ئاسمانی خواروو، دەفەرموێ: کێ لەم دەمەدا لێم دەپاڕێتەوە تابچم بە هاوارییەوە، کێ

---

[٤٣٣] تجرید/١، ژمارە: ٥١٣، بخاری: ٩٩٨، مسلم: ١٧٥٢.

[٤٣٤] تجرید/١، ژمارە: ٥٧٢ = بخاری: ١١٤٥، مختصر صحیح مسلم/٥، ژمارە: ١٨٨٠ = ١٧٦٩ شیحا.

لەم دەمەدا داوای شتم لێ دەکا تا بەشی باشی پێ بدەمو بێبەشی نەکەم، کێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەکا تا لێی خۆشم بم!).

**ڕوونکردنەوە:**

شێخی عەسقەلانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لەڕاڤەو ڕوونکردنەوەی ئەم فەرموودەیەدا، زۆر زانایانەو مەلایانە، لە هاتنە خوارەوەی خودا بۆ ئاسمانی خواروو دەدوێ، وەڕاو بۆچوونی زاناو لایەنو کۆمەڵە مەزهەبییەکان باس دەکا. یەکێ لەو زاتانە ئیبنو عەرەبییە، کە دەفەرموێ: (من ڕام لەسەر تەئویلی ئەم جۆرە فەرموودانەیە، کە بۆنی جیهەتو لاو جێگەو شوێنیان لێ دێ).

## (٢٥) باب: الترغيب في قيام رمضان وهو التراويح
## هاندان لەسەر کردنی تەراویحی ڕەمەزان

٤٣٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُرَغِّبُ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَأْمُرَهُمْ فِيهِ بِعَزِيمَةٍ، فَيَقُولُ: « مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ ». فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ، ثُمَّ كَانَ الأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ فِي خِلاَفَةِ أَبِي بَكْرٍ، وَصَدْرًا مِنْ خِلاَفَةِ عُمَرَ عَلَى ذَلِكَ». {الحديث/١٧٧٧ = ١٧٤٦ فم. تجريد/١، لاپەڕە: ٥٦، رقم: ٣٦ = ٣٨، ٣٥، ١٩٠١، ٢٠٠٨، ٢٠٠٩، ٢٠١٤}:[٤٣٥]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هانی یارانی خۆی دەدا لەسەر کردنی شەو نوێژی ڕەمەزان، بەڵام لەم لایەنەوە جەختی لێ نەدەکرن،، دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (کەسێ شەو نوێژی ڕەمەزان بکا، بە ئیمانو باوەڕەوە، لەبەر ڕەزای خودا،

---

[٤٣٥] تجريد/١، ژمارە: ٣٦، بخاري: ٣٨، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٣٩٨ = ١٧٧٧.

خودا لە گوناهەکانی لەوەو پێشی خۆش دەبێ، ئیتر هەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆچی دوایی کرد، ئەم کارە لەسەر ئەم بارودۆخە بوو، هەرکەسێ بۆ خۆی بەتەنیا بە ئارەزوی خۆی، چەندێ ئارەزووی لێ بوایە ئەوەندە نوێژی تەراویحی دەکرد، لە پاشیشا لەکاتی جێنشینی (خەلافەت)ی ئەبوبەکرو لەسەرەتای جێنشینی عومەریشەوە ئەم کارە هەروا بوو). {تاج/٢، لاپەڕە: ١٠٠، زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ١٣٤٧}.

**روونکردنەوە:**

پوختەی کۆمەڵێ بڕیاری شەرعی کە لەم فەرموودانەی پێشەوە وەردەگیرێن، لەگەڵ کۆمەڵێ بەهرەیان، بەپێی شەرحی نەوەوی‌و فەتحولولهیم.

١- پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەشەو بەردەوام، یادو زیکری خودای کردووە، وە بۆ ئێمەیش سوننەتە کەوابین، بەتایبەتی کاتێ هەڵ دەسین بۆ شەو نوێژو خواپەرستی.

٢- شەو نوێژ لای کەمەکەی یەك رکاتە، ژمارە نییە بۆلای زۆری، زاناکان دەفەرموون: (إِنَّ صَلاَةَ اللَّيْلِ مِنَ الطَّاعَاتِ الَّتِي كُلَّمَا زَادَ فِيهَا زَادَ الأَجْرُ = هەتا شەو نوێژ زیاتر بکەی خێری زۆرترە). شەو نوێژ دوو رکات دوو رکات بێ خێرترە.

٣- وەتر سوننەتە، لەپاش کردنی نوێژی خەوتنان کاتەکەی دەست پێ دەکا، هەتا بانگی نوێژی بەیانی دەمێنێ، لای کەمی یەك رکاتە، لای زۆری یازدە رکاتە، ئەگەر بفەوتێ دروستە قەزا بکرێتەوە.

٤- نوێژی تەهەجود سوننەتە، ئەو شەو نوێژەیە کە لەپاش خەوتن دەکرێ، واباشە لە هەشت رکات کەمتر نەبێ، بە دوو رکاتیش ئەصڵی سوننەتەکە دێتە دی.

٥- شەو نوێژو نوێژی سوننەت بە دانیشتنیشەوە دەکرێ بەڵام خێری کەمترە، مەگەر دانیشتنەکە لەبەر هۆی رەوابێ. تەنانەت دروستە رکاتێ، هەندێکی بە پێوەو هەندێکی بە دانیشتنەوە بکرێ.

٦- لەپاش وەتر، نوێژی سوننەتو نوێژی ترو نوێژی تەهەجود دەکرێ، وە بەکردنی وەتر شەو نوێژو نوێژی سوننەت قفڵ نابێ. {بڕوانە: ژمارە: ١٧١٤ — ١٧٧٥ شەرحی نەوەویو ژمارە: ١٦٨٨ فتح الملهم شرح صحيح مسلم}.

٧- لەپاش کردنی دوو رکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی راکشان، لەسەر لای راست سوننەتە. {بڕوانە: ژمارە: ٣٦١ی پوختەی موسلیم}.

٨- إِحْيَاءُ مَابَيْنَ الطُّلُوعَيْن کارێ شیرینە. کە ئەوەیە نوێژکەر لەپاش کردنی نوێژی بەیانی لە جێگە نوێژەکەیدا بمێنێتەوە هەتا خۆر بەجوانی دەکەوێ، وە لەو ماوەیەدا خەریکی یادو تەزبیحاتو سەڵاواتدانو شتی تری وابێ. {ژمارە: ١٤٩٠، ١٤٩١، ١٧٥٠ فتح الملهم}.

٩- بۆ باسی شەو نوێژ بڕوانە: تاج/١، لاپەڕە: ٤٧٦، زنجیرە: ١٨١ هەتا زنجیرە: ١٨٦، لاپەڕە: ٤٩٣ چاپی چوارەم + ریاض/٣، لاپەڕە: ١٢٩، زنجیرە: (٢١٢) هەتا (٢١٥).

٤٣٦ – عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عنها): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَرَجَ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ، فَصَلَّى فِي الْمَسْجِدِ، فَصَلَّى رِجَالٌ بِصَلاَتِهِ، فَأَصْبَحَ النَّاسُ يَتَحَدَّثُونَ بِذَلِكَ، فَاجْتَمَعَ أَكْثَرُ مِنْهُمْ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي اللَّيْلَةِ الثَّانِيَةِ، فَصَلَّوْا بِصَلاَتِهِ فَأَصْبَحَ النَّاسُ يَذْكُرُونَ ذَلِكَ، فَكَثُرَ أَهْلُ الْمَسْجِدِ مِنَ اللَّيْلَةِ الثَّالِثَةِ، فَخَرَجَ فَصَلَّوْا بِصَلاَتِهِ، فَلَمَّا كَانَتِ اللَّيْلَةُ الرَّابِعَةُ، عَجَزَ الْمَسْجِدُ عَنْ أَهْلِهِ، فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَطَفِقَ رِجَالٌ مِنْهُمْ يَقُولُونَ: الصَّلاَةَ، فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى خَرَجَ لِصَلاَةِ الْفَجْرِ، فَلَمَّا قَضَى صَلاَةَ الْفَجْرَ، أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ، ثُمَّ تَشَهَّدَ، فَقَالَ: « أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّهُ لَمْ يَخْفَ عَلَيَّ شَأْنُكُمُ اللَّيْلَةَ، وَلَكِنِّي خَشِيتُ أَنْ

تُفْـرَضَ عَلَـيْكُمْ صَـلاَةُ اللَّيْـلِ فَتَعْجِـزُوا عَنْهَـا ». (وفي روايـة): وَذلِـكَ فِـي رَمَـضَانَ».
{الحـديث/١٧٨١ = ١٧٥٠ فـم. تجريـد/٢، لاپـەڕە: ٣٠٣، رقـم: ٩٢١ = ٢٠١٢، ٢٠١١، ٩٢٤}:(٤٣٦)

عائیـشه (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: شـەوێ لـە شـەوەکانی ڕەمـەزان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لـەناو جەرگـەی شـەودا دەرچـوو لـەماڵو چوو بۆ مزگەوتو لەوێ دەستی کرد بەشەو نوێژ، وە چەند پیـاوێ لـە هـاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە پشتیەوە پـەیڕەوی (ئیقتیـدا)یـان پـێ کردو، دەستیان کرد بە نوێژ کردن بە جەماعەت لە گەڵیاو، جا کاتێ ڕۆژ بـۆوەو خەڵـك ئـەم باسـەیان گێڕایـەوە بـۆ یـەکتری، لـە شـەوی دووەمـا خەڵـك زۆرتـر گردەوە بوونو پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) دیسان بەر نوێـژی بـۆ کردنەوە، وە بۆ سبەینێ دیسان ئەم باسە تەواو بڵاوبۆوە، ئیتر بۆ شـەوی سـێیەم خەڵکێـکی زۆر لە مزگەوت کۆوە بوونو، دیسانەوە شەو نوێـژیان بـە جەماعـەت لەپـشت پێغەمبـەرەوە کـردەوە، جـا لەشـەوی چـوارەما، هاوڕێیـانی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ئەوەنـدە زۆر کۆبوونـەوە، مزگـەوت نەیـدەگرتن، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لـەو شـەوەدا نـەهات بـۆ ناویـان بـۆ شەو نوێژ، تەنانەت چەند کەسێ بە دەنگی بەرز، بۆ یاد خستنەوەی پێغەمبـەر، هـەتا بێـت بـەر نوێـژیی تەراویحەکـەیان بـۆ بکـا، دەیـانگوت: کـاتی نوێـژە، کـاتی نوێژە، بـەڵام پێغەمبـەر هـەر نـەهات، جـا سبـەینێ کـە هـات بۆناویـانو، نوێـژی سـبەینێی بـۆ کـردن، ڕووی تـێ کـردنو شـایەتمانی هێنـاو فـەرمووی (دروودی خـودای لەسـەر بـێ): (لـەپاش سـوپاسو ستایـشی خـودای گـەورە، مـن ئەمـشەو ئاگادار بووم لە هاتنی ئێوە بۆ مزگەوتو ئاگام لە حاڵتان بوو، کە چاوەڕوانی من

---

(٤٣٦) تجرید/٢، ژمارە: ٩٢١، بخاری: ٢٠١٢، مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٣٩٧ = ١٧٨١.

بـوون کـه بـەر نوێـژیی تـەراویحتان بـۆ بکـەم، بـەڵام مـن کـه نـەهاتم بۆلاتـان لەبەرئـەوە بـوو نـەبادا ئـەم تەراویحـە فـەرز بکـرێ لەسـەرتان، وە ئێـوەیش پێـی هەڵنەسن‌و بۆتان نەکرێ، ئەوسا لەسەر ئەوە تووشی ئێش‌و ئازار ببن).

ئیتر هەتا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆچی دوایی کرد، شەو نوێـژیی رەمەزان هەر لەسەر ئـەم شێوەیە بـوو، هـەبوو لـە ماڵەوەی دەیکـرد، هـەبوو لـە مزگـەوت دەیکـرد، هـەبوو کۆمـەڵ کۆمـەڵ بەیەکـەوە بـە کۆمـەڵ دەیـانکرد).

{تاج/٢، لاپـەڕە: ١٠١، زنجیرە: ٣٧، ژمـارە: ١٣٤٨} . {بڕوانـە ژمـارە: ٣٧٤ لەمختـصر صحیح مسلم = پوختەی موسلیم} .

## (٢٦) باب: الدعاء في صلاة الليل وقيامه
## نزای ناو شەونوێژو هەڵسان لەخەو بۆ شەونوێژ

٤٣٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) قَالَ: بِتُّ لَيْلَةً عِنْـدَ خَـالَتِي مَيْمُونَـةَ، فَقَامَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنَ اللَّيْلِ، فَأَتَى حَاجَتَهُ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، ثُـمَّ نَامَ، ثُمَّ قَامَ، فَأَتَى الْقِرْبَةَ، فَأَطْلَقَ شِنَاقَهَا، ثُمَّ تَوَضَّأَ وُضُوءًا بَيْنَ الْوُضُوءَيْنِ، وَلَمْ يُكْثِرْ، وَقَـدْ أَبْلَـغَ، ثُـمَّ قَـامَ فَـصَلَّى فَقُمْـتُ فَتَمَطَّيْـتُ كَرَاهِيَـةَ أَنْ يَـرَى أَنِّـي كُنْـتُ أَنْتَبِـهُ إِلَيْـهِ، فَتَوَضَّأْتُ، فَقَامَ فَصَلَّى، فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَأَخَـذَ بِيَـدِي فَـأَدَارَنِي عَـنْ يَمِينِـهِ، فَتَتَامَّـتْ صَلاَةُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنَ اللَّيْـلِ ثَـلاَثَ عَـشْرَةَ رَكْعَـةً، ثُـمَّ اضْـطَجَعَ فَنَامَ حَتَّى نَفَخَ، وَكَانَ إِذَا نَامَ نَفَخَ، فَأَتَاهُ بِلاَلٌ، فَآذَنَهُ بِالصَّلاَةِ، فَقَامَ فَصَلَّى وَلَـمْ يَتَوَضَّـأْ، وَكَانَ فِي دُعَائِهِ: « اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُورًا، وَفِـي بَـصَرِي نُـورًا، وَفِـي سَـمْعِي نُـورًا، وَعَنْ يَمِينِي نُورًا، وَعَنْ يَسَارِي نُورًا، وَفَوْقِي نُورًا، وَتَحْتِي نُورًا، وَأَمَـامِي نُـورًا، وَخَلْفِـي نُورًا، وَعَظِّمْ لِي نُورًا ». قَالَ كُرَيْبٌ: وَسَبْعًا فِي التَّـابُوتِ، فَلَقِيـتُ بَعْـضَ وَلَـدِ الْعَبَّـاسِ، فَحَـدَّثَنِي بِهِـنَّ، فَـذَكَرَ: عَـصَبِي وَلَحْمِـي وَدَمِـي وَشَـعَرِي وَبَـشَرِي. وَذَكَـرَ خَـصْلَتَيْنِ».

{الحـديث/١٧٨٥ = ١٧٥٤ فـم. تجريـد/١، لاپـەڕە: ١١٩، رقـم: ٩٦ = ١١٧، ١٣٨،

١٨٣، ٦٩٧، ٦٩٨، ٦٩٩، ٧٢٦، ٧٢٨، ٨٥٩، ٩٩٢، ٤٥٦٩، ١١٩٨، ٤٥٧٠، ٤٥٧١، ٤٥٧٢، ٥٩١٩، ٦٢١٥، ٧٤٥٢، ٦٣١٦}:(٤٣٧)

**ئیبنـو عـەبباس (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: شـەوێ لـە مـاڵی مەیموونەی پوورم بووم، کە هاوسەری پێغەمبەر بوو، مەیموونە خوشکی دایکم بـوو، لـە دەوری نیـوە شـەودا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) خەبـەری بۆوە، چوو دەستی بەئاو گەیاند، ئەوجا دەموچاوو هەردوو دەستی خۆی شۆردو خەوتـەوە، پاش ماوەیـێ هەڵسا، چوو بۆلای کوندەکەو دەمبێنەکەی کردەوەو دەستنوێژێـکی تـەواوی گـرت، گەرچـی ئـاوی زۆری بـەکار نـەهێنا، بـەڵام دەستنوێژێـکی تـەواوی گـرت، ئـەوجا هەڵسا دەسـتی کـرد بەشـەو نوێـژ، منـیش هەڵسام بـە درۆ خـۆم، وەك کەسـێ تـازە لەخـەو هەڵسێ، کش‌و بـادا، نـەبادا پێغەمبەر وابزانێ کە بەخەبەر بووم‌و ئاگام لـەو بـووە، کەچی کـردووە، منـیش دەسـتنوێژم گـرت، پێغەمبـەر دەسـتی کـرد بـە شـەو نوێـژ، منـیش چـووم لـەلای چەپیەوە ڕاوەستام‌و نوێژم بە جەماعەت لە پشتیەوە دابەست، جا خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی ڕاستی نایە سەر سەرم‌و گوێی ڕاستی گرتم‌و بردمی بۆلای ڕاستی خۆی، وە بە سیازدە ڕکات شەو نوێژ کۆتایی بە شەو نوێژی ئەو شەوە هێنا، ئەوجا ڕاکشایەوەو خەوتـەوە، تەنانـەت دەسـتی کـرد بـە پرخـە پرخ، دەستووری وابوو کە دەخەوت پرخەی لێوە دەهات، جا بیلال هات ئاگاداری کردەوە کەوا کاتی نوێژی بەیانییـە، تەشـریفی هەڵسا نوێـژی کـرد، دەسـتنوێژی تازە نەکردەوە، ئەمەیش بەشێکە لە نزاو پاڕانەوەی ئەو شەوەی: (اللَّهُـمَّ اجْعَـلْ فِي قَلْبِي نُورًا وَفِي بَصَرِي نُورًا وَفِي سَمْعِي نُورًا وَعَـنْ يَمِينِـي نُـورًا وَعَـنْ يَـسَارِي نُـورًا وَفَوْقِي نُورًا وَتَحْتِي نُورًا وَأَمَامِي نُورًا وَخَلْفِي نُورًا وَعَظِّمْ لِي نُورًا).**

---

(٤٣٧) تجرید/١، ژمارە: ٩٩، بخاری: ١١٧، مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٣٧٩ - ١٧٨٥.

واته: ئەی خودایە! پڕ دڵو چاوو گوێچکەم لە نوورو ڕۆشنایی بفەرموو، هەروا راستو چەپو سەرو ژێرو بەردەمو پشتم، هەروەها دڵو دەروونم لە نوور کەیل کەو نوقمی نوورم بفەرموو). سەلەمە فەرمووی: کورەیب (کە ئەم فەرموودەیە لە ئیبنو عەباسەوە، لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە) فەرمووی: لەناو نزاکەدا حەوت وشەی تری فەرموو. کە پەیوەندییان بە ئەندامەکانی ناو قەفەزەی سینگەوە هەیە، ئەوانەم لەیاد نەماوە، سەلەمە فەرمووی: سەبارەت بەو حەوت وشەیە، لە هەندێ لە منداڵەکانی ئیمامی عەباسم پرسی، ئەوانەی پێ گوتم، ئاوا باسی کردن: دەمارمو گۆشتمو خوێنمو موومو پێستم، وە دوو شتی تریشی باس کرد، کە تەواوکەری حەوتەکەن). {بڕوانە: تجرید/١، ژمارە: ١١٢ + ژمارە: ١٣٨ + تاج/١، ژمارە: ٩٨٧، زنجیرە: ١٨٤}.

٤٣٨- عَنْ عَبْدَ اللّٰهِ بْنَ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) (أَنَّهُ بَاتَ لَيْلَةً عِنْدَ مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهِيَ خَالَتُهُ فَاضطَجَعْتُ فِي عَرْضِ الْوِسَادَةِ وَاضطَجَعَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَهْلُهُ فِي طولِهَا فَنَامَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى إِذا انْتَصَفَ اللَّيْلُ أَوْ قَبْلَهُ بِقَلِيلٍ أَوْ بَعْدَهُ بِقَلِيلٍ اسْتَيْقَظ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَجَلَسَ يَمْسَحُ النَّوْمَ عَنْ وَجْهِهِ بِيَدِهِ ثمَّ قَرَأَ الْعَشْرَ الْآيَاتِ الْخَوَاتِمَ مِنْ سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ ثمَّ قَامَ إِلَى شَنّ مُعَلَّقَةٍ فَتَوَضأَ مِنْهَا فَأَحْسَنَ وُضوءَهُ ثمَّ قَامَ يُصَلِّي قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ فَقُمْتُ فَصَنَعْتُ مِثلَ مَا صَنَعَ ثمَّ ذهَبْتُ فَقُمْتُ إِلَى جَنْبِهِ فَوَضعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى رَأْسِي وَأَخَذ بِأُذنِي الْيُمْنَى يَفْتِلُهَا فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ ثمَّ رَكْعَتَيْنِ ثمَّ رَكْعَتَيْنِ ثمَّ رَكْعَتَيْنِ ثمَّ رَكْعَتَيْنِ ثمَّ رَكْعَتَيْنِ ثمَّ أَوْتَرَ ثمَّ اضطجَعَ حَتَّى أَتَاهُ الْمُؤَذنُ فَقَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ ثمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الصُّبْحَ). (الحديث-١٨٣ طرفه في: ١١٧).[٤٣٨]

---

[٤٣٨] تجرید/١، ژمارە: ١٣٨، بخاری: ١٨٣، مسلم: ٧٦٣ = ١٧٨٦.



عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: شەوێ لەلای مەیموونەی پوورم، هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مامەوە، کەخوشکی دایکم بوو، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای بوو، چوونکە شەوی سەرەی خۆی بوو، کەنوێژی خەوتنانی کرد هات بۆماڵەوە، جا کەخەوتین من لەسەر باری پانی ی سەرینەکە سەرم کردە سەری‌و ڕاکشام، پێغەمبەرو هاوسەرەکەیشی سەریان کردە سەرباری درێژی ی سەرینەکەو ڕاکشان، وە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خەوت، هەتا نیوە شەو، یاهەتا بەر لەنیوەشەو بەکەمێ، یاهەتا پاش نیوەشەو بەکەمێ، ئەوجا حەزرەت خەبەری بۆوەو دانیشت‌و بەدەستەکانی چاوەکانی ووڵی‌و خەوەکەی بەدەستی لەڕوخساری دەسڕی تاخەوی بزڕێ، ئەوجا دە ئایەتەکەی کۆتایی سورەتی ئالی عیمرانی خوێند، ئینجا تەشریفی هەڵساو چوو لەکوندەیەکی هەڵواسراو دەسنوێژێکی بەجوانی گرت، ئەمجا هەڵسا بۆشەونوێژ کردن. ئیبنووعەباس فەرمووی: جامنیش هەڵسام‌و چاوم لەو کرد، ئەو چی کرد منیش هەمان شتم کرد، لەگەڵ ئەودا خەوتم‌و لەگەڵ ئەودا لەخەو هەڵسام‌و چاوی خۆم ووڵی‌و، دە ئایەتەکەم خوێندو لەکوندەکە دەسنوێژم گرت‌و ئەوجا چووم لەلای چەپیەوە ڕاوەستام‌و نوێژم بەجەماعەت لەپشتیەوە دابەست، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی ڕاستی نایە سەر سەرم‌و گوێ ی ڕاستی گرتم‌و کەمێ ووڵی‌و بردمی بۆلای ڕاستی‌و دوو ڕکات شەونوێژی کرد، ئنجا دوو ڕکاتی تریشی کرد، ئینجا دووڕکاتی تریشی کرد، هەروا، هەتا (سەرجەمیان کردییە دوازدەرکات) ئینجا بەیەك ڕکات وەتریشی کرد، کەسەرجەمیان دەکاتە سیازدە ڕکات، ئەوجا حەزرەت ڕاکشایەوە هەتا بانگدەر هات‌و بانگی کرد کەکاتی نوێژی بەیانی یە، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵساو دوو ڕکات نوێژی سووکەڵەی کرد، ئەوجا دەرچوو، ڕۆیشت بۆ مزگەوت لەوێ نوێژی بەیانی بۆ

مەردومەكە كرد). (بڕ= بڕوانە: فەرموودەی نەوەدوشەشی تەجرید كەلەنامەی زانست دایە. تاج/ ٦/ ٩٧/ ٣٩ = تاج-٤ ز-٤ ژ-٣٧٩٢).

## راڤەو شیكردنەوە:

بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم فەرموودەیە كەڕیوایاتو طورووقو ووجووهی زۆرە بڕوانە شەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیم، ج/٦ ص ٤٤ هەتا ص ٥٥ لەم فەرموودەدا ئەمانەی تیادایە: دروستە خوێندنی قورئان بەبێ دەستنوێژ، هەركاتێ مرۆڤ بەشەو لەخەو هەڵسا خوێندنی ئەم دە ئایەتە سوننەتە، لەنوێژی سوننەت دا جەماعەت دروستە، بەدوو كەسیش جەماعەت دەكرێ.

٤٣٩- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: (كَانَتْ صَلَاةُ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَلَاث عَشْرَةَ رَكْعَةً يَعْنِي بِاللَّيْلِ) (الحديث: ١١٣٨).[٤٣٩]

ئیبنوعەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەفەرموێ: (شەونوێژی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سیازدە ركات بوو).

٤٤٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عنهما): أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقُولُ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ: « اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَلَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ قَيَّامُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَلَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، أَنْتَ الْحَقُّ، وَوَعْدُكَ الْحَقُّ، وَقَوْلُكَ الْحَقُّ، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ، اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَأَخَّرْتُ، وَأَسْرَرْتُ وَأَعْلَنْتُ، أَنْتَ

---

[٤٣٩] تجرید/١، ژمارە: ٥٦٧، بخاری: ١١٣٨، مسلم: ٧٦٤ = ١٧٨٨.

إلَهِي، لاَ إلَهَ إلاَّ أَنْتَ». {الحديث/ ١٨٠٥ = ١٧٧٤فم. تجريد/١/٥٣٥، ژمـاره: ٥٥٨ = ١١٢٠، ٦٣١٧، ٧٣٨٥، ٧٤٤٢، ٧٤٩٩}:[٤٤٠]

ئیبنـو عـەباس (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لەشەوا هەڵ دەسا بۆ شەو نوێژ، لەسـەرەتاوە دەیفـەرموو: (اللَّهُمَّ لَـك الْحَمْدُ أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَلَـك الْحَمْدُ أَنْتَ قَيَّامُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَلَـك الْحَمْدُ أَنْتَ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَنْ فِـيهِنَّ أَنْـتَ الْحَقُّ وَوَعْـدُكَ الْحَقُّ وَقَوْلُـكَ الْحَقُّ وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ وَالْجَنَّةُ حَقٌّ وَالنَّارُ حَقٌّ وَالسَّاعَةُ حَقٌّ اللَّهُـمَّ لَـك أَسْلَمْتُ وَبِـكَ آمَنْـتُ وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ وَبِكَ خَاصَمْتُ وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَأَخَّرْتُ وَأَسْرَرْتُ وَأَعْلَنْتُ أَنْتَ إِلَهِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ):

واتـە: ئـەی خودایـە! سـوپاس‌و سـتایش هـەر بـۆ تۆیـە، هـەر تـۆی ڕوونـاك کەرەوەی ئاسمانەکان‌و زەوی‌و ئەوەشی لەوانا هەیە، دیسان سـوپاس‌و سـتایش بـۆ تۆ، تۆ هەتا هەتایە پایەداری‌و مایەی بوون‌و مـانی هەموو شتێـکی‌و، پـارێزەرو ڕاگری ئاسمانەکان‌و زەوی‌و ئەومیشی لەوانا هەیە، دیسان سـوپاس‌و سـتایش هـەر بۆ تۆیە، هەر تۆ پەروەردگاری ئاسمانـەکان‌و زەوی‌و ئەوانەشـی لـەوانا هەیـە، تـۆ هەقی‌و ڕاست‌و دروسـتی‌و فەرمایـشتت هەقـەو، بـەڵێنت هەقـەو، شـاد بـوون بـە دیدارت لەپاش مردن حەقـەو ڕاسـتەو بەهەشـت ڕاسـتە، دۆزەخ ڕاسـتە، قیامـەت ڕاستە، ئەی خودایە! خۆم سپارد بەتۆ، بـاوەڕم هەیـە بـە تـۆ، پـشت‌و پـەنام هـەر تـۆی، داڵـدەم هێناوەتـە بـەرتۆ، بـە پـشتی تـۆ دەچـم بەگـژ ناحـەزی خۆمـا، مەحکەمەو دادی خۆم دێنمە لای تۆو، تـۆ دەکـەم بـە حەکـەم‌و دادوەر لـەنێوانی خۆم‌و نەیارما، ساتۆیش بە کەرەم‌و گەورەیی خۆت لە گوناهی بـەرو دوام خـۆش

[٤٤٠] تجریـد/١، ژمـاره: ٥٥٨، بخـاری: ١١٢٠، مختـصر صـحیح مـسلم/١، ژمـاره: ٣٨١، مـسلم: ٧٦٩ - ١٨٠٥، ١٨٠٩.

بە، هەروەها لە گوناهی نهێنیو ئاشکرام، هەر تۆ خودای منیو بەس، خودای تر نییە جگە لەتۆ!). {تاج/١/٤٨٦، ژمارە: ٩٨٦ چاپی چوارەم}.

## (٢٧) باب: إستحباب تطويل القراءة في صلاة الليل
## سوننەتە قورئانخوێندنی ناو شەونوێژ درێژ بکرێتەوە

٤٤١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مَسعود (رَضِي اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: (صَـلَّيْتُ مَـعَ النَّبِـيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيْلَةً فَلَمْ يَزَلْ قَائِمًا حَتَّى هَمَمْتُ بِأَمْرِ سَوْءٍ قُلْنَـا وَمَـا هَمَمْـتَ؟ قَالَ هَمَمْتُ أَنْ أَقْعُدَ وَأَذَرَ النَّبِيَّ ـ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ـ) (الحديث ١١٣٥).[٤٤١]

ئیبنـوو مەسـعود (ڕەزای خودایـان لـێ بـێ) فـەرمووی: شـەوێ شـەونوێژم بەجەماعەت لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکـرد، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەندە بەپێوە ڕاوەستا و بەدوورو درێژی قورئانی خوێند، تەنانەت نیازم بوو ئیشێ خراپ بکەم، عـەرزیمان کـرد: نیـازت بـوو چی بکەیت وا بەخراپی دادەنێیت؟ فەرمووی: نیازم بوو دابنیشمو پێغەمبەر بەپێوە بێو مـن بەدانیشتنەوە جەماعەتەکـەم تـەواو بکـەم لەپشتیەوە، دیـارە کەشتی وایش تەرکی ئەدەبە).

**لەم فەرموودەیە ئەم بەهرانە وەردەگیرێ:**

١- درێژی ڕاوەستان سوننەتە، شەونوێژ بەجەماعەت سوننەتە.

٢- پێچەوانەی پێشنوێژ کارێکی خراپە.

٣- ئەدەب لەپێشنوێژ سوننەتە، بەتایبەتی ئەگەر گەورە بێ.

[٤٤١] تجريد/١، ژمارە: ٥٦٦، بخاري: ١١٣٥، مسلم: ٧٧٣ = ١٨١٢.

٤- دەرسێ، یا قسەیێ تێ ی نەگەیشتی دووبارەی بکەیتەوەلەماموٚستا، ماموٚستایش بەشێنەیی بەبێ توورە بوون روونی بکاتەوە بوٚیان، چونکە ئەوەتا فەقێ و یارانی ئیبنو مەسعوودو، ئیبنو مەسعوود ئاوایان کردووە.

## (٢٨) باب: ما روي فيمن نام الليل أجمع حتى أصبح
## کەسێ شەو تا بەیانی بخەوێ‌و هەڵنەسێ بوٚ شەونوێژ

٤٤٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: ذُكِرَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلٌ نَامَ لَيْلَةً حَتَّى أَصْبَحَ، قَالَ: « ذَاكَ رَجُلٌ بَالَ الشَّيْطَانُ فِى أُذُنِه ». أَوْ قَالَ « فِى أُذُنَيْهِ ». {الحديث/١٨١٤ = ١٧٨٤ فم. تجريد/١/٥٤٧، رقم: ٥٧١ = ١١٤٤، ٣٢٧٠}:[٤٤٢]

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە خزمەتی پێغەمبەردا (درروودی خودای لەسەر بێ) باسی کابرایێ کرا، گوترا: هەتا بەیانەکی هەر نووستبوو، وە نەچوو بوو بەلای شەو نوێژەوە پێغەمبەریش (درروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوە شەیتان گمێزی کردوٚتە ناو گوێچکەیەوە). یا فەرمووی: (ناو هەردوو کونە گوێچکەیەوە). {تاج/١، ژمارە: ٩٧٠}.

٤٤٣- عَنْ عَلِيِّ بْنَ أَبِي طالِب (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) طرَقَهُ وَفَاطمَةَ بِنْتَ النَّبِيِّ عَلَيْهِ السَّلَام لَيْلَةً، فَقَالَ: (أَلَا تُصَلِّيَان). فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنْفُسُنَا بِيَدِ اللَّهِ فَإِذا شَاءَ أَنْ يَبْعَثَنَا بَعَثَنَا، فَانْصَرَفَ حِينَ قُلْنَا ذَلِكَ،

---

[٤٤٢] تجريد/١، ژمارە: ٥٧١، بخاري: ١١٤٤، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٣٨٥ = ١٨١٤.

وَلَمْ يَرْجِعْ إِلَيَّ شَيْئًا، ثُمَّ سَمِعْتُهُ وَهُوَ مُوَلٍّ، يَضرِبُ فَخِذَهُ وَهُوَ يَقُولُ: (وَكَانَ الْإِنْسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا). (الحديث: ١١٢٧- اطرافه في: ٧٤٦٥، ٧٣٤٧، ٤٧٢٤). [٤٤٣]

عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: شەوێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هێنا بۆلای منو فاتیمەی کچی، سەیری کرد: ئێمە نوستوین، فەرمووی: (ئەرێ ئەوە بۆشەونوێژ ناکەن، ئادەی هەڵسن بۆ شەونوێژ).

منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! وەك خودای گەورە لەم ئایەتەدا (اللّٰه يَتَوفى الانفس حين موتِها ..) دەفەرموێ، گیانمان والەدەستی خودا خۆیدا، هەرکاتێ خۆی حەزکا هەڵمان بسێنێ ئەوا هەڵمان دەسێنێ! جاکەوامان گوت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرەودوا گەڕایەوەو هیچ وەڵامی نەدایەوە، لەپاشا کەدوور کەوتەوە گوێم لێ بوو لەپەڕۆشا دەیدا بەڕانی خۆیداو بۆ پەرپەرچی وەڵامەکەی من ئەم ئایەتەی خوێندەوە:(وكانَ إلانسانُ أكثر شيءٍ جدلاً)(٥٤-١٨).

واتە: لەڕاستیدا ئادەمیزاد لەهەموو شتێ زیاتر حەزی لە دەمەوەری‌و دەمبازی یە).

٤٤٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ ثَلاَثَ عُقَدٍ إِذَا نَامَ، بِكُلِّ عُقْدَةٍ يَضْرِبُ عَلَيْكَ لَيْلاً طَوِيلاً، فَإِذَا اسْتَيْقَظَ فَذَكَرَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، وَإِذَا تَوَضَّأَ انْحَلَّتْ عَنْهُ عُقْدَتَانِ، فَإِذَا صَلَّى انْحَلَّتِ الْعُقَدُ، فَأَصْبَحَ نَشِيطًا طَيِّبَ النَّفْسِ، وَإِلاَّ أَصْبَحَ خَبِيثَ

---

[٤٤٣] تجريد/١، ژمارە: ٥٦١، بخاری: ١١٢٧، مسلم: ٧٧٥ = ١٨١٥.

ـنَّفْسِ كَسْلاَنَ». {الحديث/١٨١٦ = ١٧٨٦ فم. تجريد/١/٥٤٦، رقم: ٥٧٠ = ٣٢٦٩}:[٤٤٤]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (كاتێ كە كەسێ لە ئێوە دەخەوێ شەیتان سێ گرێ دەدا لەپشتی سەری‌و، یەكە یەكە دەست دەمالێ بە گرێكاناو دەڵێ: بخەوە شەوگارێكی دوورو درێژت لەسەر بێ، جا ئەگەر خەوت‌و لەپاشا خەبەری بۆوەو یادی خودای كرد، ئەوا گرێیەكیان دەكرێتەوە، خۆ ئەگەر دەستنوێژیشی گرت، ئەوا گرێیەكی تریشیان دەكرێتەوە، وە ئەگەر شەو نوێژیشی كرد، ئیتر هەموو گرێكان بەتەواوی دەكرێنەوە، وە خۆشی چالاك‌و گورج‌و گۆڵ‌و دڵخۆش دەبێتەوە، ئەگینا پەستی‌و دڵگرانی‌و تەمبەڵی دایدەگرێ). {تاج/١، زنجیرە: ١٨١، ژمارە: ٩٦٩}.

## (٢٩) باب: إستحباب صلاة النافلة في بيته وجوازها في المسجد
## وا سوننەتە كە نوێژە سوننەتەكان لەماڵەوە بكرێن، بەڵام لەمزگەوتیش دروستە بكرێن

٤٤٥- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضي اللهُ عَنْها) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (اجْعَلُوا فِي بُيُوتِكُمْ مِنْ صَلَاتِكُمْ وَلَا تَتَّخِذُوهَا قُبُورًا). (الحديث: ٤٣٢ طرفه في: ١١٨٧).[٤٤٥]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوكی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەندێ لەنوێژە سوننەتەكانتان لەماڵەوە بكەن، با ماڵەكانتان نەبێ بە گۆڕستان!).

---

[٤٤٤] تجريد/١، ژمارە: ٥٧٠، بخاری: ٣٢٦٩، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٣٨٧ = ١٨١٦.

[٤٤٥] تجريد/١، ژمارە: ٢٦٧، بخاری: ٤٣٢، مسلم: ٥٣١ = ١١٨٧.

٤٤٦– عَنْ أَبِي مُوسَى رَضِي اللّٰه عَنْه قَالَ قَالَ النَّبِيُّ صَلّٰى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَثَلُ الَّذِي يَذْكُرُ رَبَّهُ وَالَّذِي لَا يَذْكُرُ رَبَّهُ مَثَلُ الْحَيِّ وَالْمَيِّتِ. (الحديث ٦٤٠٧):[٤٤٦]

ئـەبو مووسا (ڕەزای خـوای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمـەر -دروودی خـوای لەسـەر بـێ- دەفـەرموێ: وێنـەی کەسـێ کـەزیکرو یـادی خـودا بکـا، وەك مرۆڤـی زیندوو وایە، وێنەی کەسێ کەزیکرو یادی خودا نەکا، وەك مرۆڤی مـردوو وایـە. (تاج/٩ ل/١٤١ ز/٥٨ ژ/٢ – باسی گەورەیی یادو زیکری خودا).

٤٤٧– عَنْ زَيْدِ بْنِ ثابِتٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (اتَّخَذ حُجْرَةً قَالَ حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ مِنْ حَصِيرٍ فِي رَمَضانَ فَصَلّٰى فِيهَا لَيَالِيَ فَصَلّٰى بِصَلَاتِهِ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِهِ فَلَمَّا عَلِمَ بِهِمْ جَعَلَ يَقْعُدُ فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ فَقَالَ قَدْ عَرَفْتُ الَّذي رَأَيْتُ مِنْ صَنِيعِكُمْ فَصَلُّوا أَيُّهَا النَّاسُ فِي بُيُوتِكُمْ فَإِنَّ أَفْضلَ الصَّلَاةِ صَلَاةُ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ إِلَّا الْمَكْتُوبَةَ). (الحديث ٧٣١ طرفاه في ـ ٦١١٣، ٧٢٩٠):[٤٤٧]

زەیدی کوڕی ثـابیت (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەڕەمەزانا کۆختێ دروست دەکا، ڕاوی فەرمووی: وادەزانم کە فـەرمووی: لەحەسـیر، جـا چـەند شـەوێ لـەو کۆختـەدا شـەونوێژدەکا، کۆمـەڵێ لەیارانی نوێژی تەراویح لەپشتیەوە دەکەن، جاکاتێ حەزرەت (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) بـەم حاڵـەی یـارانی دەزانـێ وازدێنـێ، ئـەوانیش دەنـگ هـەڵ دەبـڕنو سوبحانەڵڵا دەکەنو زیخ دەگرنە دەرگاکە، تـا حـەزرەت تەشـریف بێنـێو نوێـژی تەراویحیان بۆبکا، تەشریفی دەرچوو هات بۆلایان، پێـی فـەرموون: (حـاڵی بـووم لەداواکەتان، بەقەستی نەهاتم، ئەی موسوڵمانینە! لەماڵەوەتان شەونوێژو نوێژی

---

[٤٤٦] تجرید/٥، ژمارە: ١٩٩٥، بخاری: ٦٤٠٧، مسلم: ٧٧٩ = ١٨٢٠، ١٨١٧.

[٤٤٧] تجرید/١، ژمارە: ٤٠١، بخاری: ٧٣١، مسلم: ٧٨١ = ١٧٨٠، ١٧٨١.



سوننەت بکەن، چونکە نوێـژی فـەرزی لـێ دەرچـێ خێرتـرین نوێـژی پیـاو، ئـەو نوێژەیەتی کەلەماڵی خۆیا دەیکا). (ت/١/٥٠٧/١ = ز-٣٧ ژ-١٣٤٨).

**ڕوونکردنەوە:**

**ئەم چەن بەهرەیە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێ:**

١- نوێژی سوننەت بۆپیاوو ژن لەماڵەوە خێرترە، جگە لەونوێژانەی کەسوننەتە بەکۆمەڵ بکرێن، وەك نوێژی هەردوو جەژنو نوێژەبارانەو نوێژی خۆرگیرانو مانگ گیران، ئەم نوێژانە لەدەرەوەی ماڵەوە خێرترن.

٢- بنەما (ئەصل) ی نوێژی تەراویحو کردنی بەجەماعەت لەمزگەوتو کردنـی لەماڵەوە بەتەنیا، لەم فەرموودەیە وەردەگیرێ.

٣- کردنـی نوێـژی سـوننەت لەماڵـەوە لەبەرئـەم هۆیانەیـە: چـونکە نهێنـی تـرەو دوورترە لەریابازایو دوورتـرە لەپووچبوونەوەی پاداشـەکەی، هاوکـات لەگـەڵ ئەوەدا ماڵەکەی پێ فـەڕدار دەبـێو میهرەبـانیو رەحمـەتی بەسـەردا دەبـارێو فریشتە هاموشۆی ئەو ماڵە دەکەن، شەیتان لێ ی دوور دەکەوێتەوە.

٤- هەرنوێژێ دەق هـەبێ لەسـەر جێگـەو کـاتو هـۆی، مـەرج نیـە کردنـی لـەماڵا خێرتربێ، وەك سڵاوی مزگەوتو نوێژی طەوافو سوننەتی ئیحرام دابەسـتن، نوێـژێ هـۆی تایبـەتی هـەبێ وەك سـڵاوی دەسـنوێژ، سـوننەتی زەوال، وەکـی تـریش نوێـژی ماڵـەوە دەبـێ بەسەرمەشـق بۆکەسـانێ کەکـەمتر هاتوچـۆی مزگەوت دەکەن، وەك: ژنو کۆیلەو نەخۆشو ئەمانە.

زەیـدی کـوڕی ثـابیتـی ئەنـصاری (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) یـەکێ بـوو لـەزانا شەرعزانە ناودارەمەزنەکانی هاوڕێیانی پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرائیز زانێکی گەورەبوو، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ:

(باشترین فەرائیز زانتان، کەشارەزایی هەبێ لەفرائیزدا زەیدی کوڕی ثابیتە).
زەید قورئانزانێکی گەورەیش بوو، هەرلەسەردەمی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەموو قورئانی لەبەربوو، زەید یەکێ بوو لەنووسەرەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاغەزی بۆ دەنووسی بۆخەڵك و کاغەزی خەڵکیشی بۆ دەخوێندەوە، یەکێ بوولەنووسەرانی سرووش، لەسەرفەرمانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زمانی عیبری کەزمانی جوولەکەیە، لەماوەیەکی زۆرکەما فێربوو، بەپازدە ڕۆژ زمانی عیبری بەشارەزایی فێربوو، زمانی سەریانیش بەحەڤدە ڕۆژ فێربوو، لەسەردەمی جێنشینی ی ئەبوبەکردا، بەفەرمانی ئەبوبەکر، لەسەر راوێژی عومەر(ڕەزای خوایان لێ بێ) قورئانی کۆکردەوە، لەبەر مێردمندالی لەغەزای بەدردا ئامادەنەبوو، بەلام ئامادەی غەزای ئوحودبووە، دەڵێن: لەخەندەقا بەکۆڵ خۆڵی خەندەقەکەی دەگواستەوە، پێغەمبەر کەبینی پێی فەرموو: (بەڕاستی ئەم کوڕە کوڕی چاکە). دەڵێن: لەدووبابەتا زەید بالادەست بووە بەسەر مەردوم دا: لەقورئانو لەفەرائیزدا.
مەسرووق دەفەرموێ: چووم بۆمەدینە، روانیم وازەیدی کوڕی ثابیت یەکێکە لەزانا هەرە پایەبەرزەکان.

دەڵێن: لەناو خێزانی خۆیدا زۆر رووخۆشو مەشرەب خۆش بووە، بەلام لەناو کۆڕو مەجلیس دا زۆر سەلارو سەنگین بووە.

جارێ لەکاتی سوواربونی ولاخا، ئیبنوعەباس ئاوزەنگی یەکەی بۆدەگرێ، زەید پێی دەفەرموێ: ئەی ئامۆزای نازداری پێغەمبەر! ئەوە شایانی شانی تۆنییە، دەی ئاوزەنگیەکە بەردە). ئیبنوعەبباس دەفەرموێ: نا، ئێمە ئاوا رەفتار لەگەڵ زانایانو گەورەپیاوان دەکەین. کۆمەڵێ فەرمووده لەزەیدەوە دەگێڕنەوە، لەهاوڕێیان: ئەبوهورەیرەو ئەبوسەعیدو ئیبنوعومەرو ئەنەسو

کەسانی تریش، لەپەیڕەوان (تابعین): سەعیدی کوڕی موسەیەبو دوو کوڕەکەی خۆی خاریجەو سولەیمانو کەسانی تریش.

زۆرینە دەڵێن: ساڵی چلو پێنجی کۆچی مردووە، کەدەمرێ ئەبوهورەیرە دەفەرموێ: (ئەمڕۆ مەلای گەورەی نەتەوەی ئیسلام مرد، ئومێدە کەئیبنوعەبباس جێگای بگرێتەوە. حەسسانی کوڕی ثابیتیش بەم شیعرە لاواندیەوە:

فمن للقوا في بعد حسان وابنه؟
ومن للمعانى بعد زيد بن ثابت؟

واتە:

شیعر پاش حەسان هەتیو دەکەوێ
مەعانیش پاش زەید، گەر راستت دەوێ

بڕوانە: تاج/٢/١/٣٣١/٥ = تاج-٤ ز-٩٤ چ-٤ ژ-٣٦٨٤ هەتا ٣٦٨٦.

زەیدی کوڕی ثابیت (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە رەمەزانا، لەناو مزگەوتا بە حەسیر کۆختێ دروست دەکا، جا چەند شەوێ، لە ماڵ دەردەچوو، دەڕۆیشت لەناو ئەو کۆختەدا شەو نوێژی دەکرد، جا کۆمەڵێ لە یارانی، لە پشتیەوە، لەناو ئەو کۆختەدا، چەند شەوێ بە جەماعەت نوێژی تەراویحی لە پشتەوە دەکەن، جا بەرۆژ هاوەڵان ئەم هەواڵەیان بڵاو دەکردەوە، جا کۆمەڵێ زۆر شەوێ لە مزگەوت ئامادە دەبن، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم حاڵەیان دەزانێ، واز دێنێو دەرناچێ بۆ لایان، ئەوانیش بۆئەوەی کە پێغەمبەر ئاگادار بکەنەوە، هەتا تەشریف بهێنێ، دەنگ هەڵ دەبڕنو سوبحانەڵڵا دەکەنو زیخو چەو دەگرنە دەرگای ماڵەکەی پێغەمبەر، کە لەسەر مزگەوت بوو، تا تەشریف بهێنێو تەراویحیان بۆ بکا، لە

ئـەنجاما پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بـە تـووڕەیی هـات بۆلایـانو فەرمووی پێیان: (حاڵی بووم لە داواکەتان، کە زۆر مەبەستتانە نوێـژی تـەراویح بە کۆمەڵ بکەن، من ئەمەم لەیادە، بەڵام بۆیە نەهاتم چونکە دەترسم کـە ئێـوە سەری تێ بکەنو بە جەخت بیگـرنو بـەرە بـەرە فـەرزببێ لەسـەرتان!) دەی لـە ماڵەوەتان، لە جێـگەو ڕێـگەی خۆتان شەو نوێژو نوێژی سوننەت بکەن، چـونکە نوێـژی فـەرزی لێ دەرچـێ، خێرتـرین نوێـژی پیـاو، ئـەو نوێژەیـەتی کـە لـەماڵی خۆیـا دەیکـا). {تـاج/١، لاپـەڕە: ١/٥٠٧ – چـاپی/١، ژمـارە: ٩٩٨، ٩٩٩، ١٠٠٠، ١٠٠١، چاپی/٢}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- نوێژی سوننەت بۆ پیاوو بۆ ژن، لە ماڵەوە خێرتـرە، جگـە لـەو نوێژانـەی کـە بە کۆمەڵ دەکرێن، وەك نوێژی هەردوو جـەژنو نوێـژە بارانـەو نوێـژی خـۆر گیرانو مانگ گیرانو تەراویح. {تجرید/١، لاپەڕە: ٣٨٦، ژمارە: ٤٠١}. {بڕوانە: ژمارە: ٣٧٢ (ڕوونکردنەوە - ٢)}.

٢- زەیدی کوڕی ثابیت (ڕەزای خودای لێ بێ) ئەنصارییە، یەکێـکە لـە زانـا شـەرع زانـە نـاودارە مەزنـەکانی هاوڕێیـانی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فــەرائیز زانێــکی گــەورە بــوو، پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) دەفەرموێ: (باشترین فەرائیز زانتان، کە شارەزایی هەبێ، لە فەرائیزدا، زەیدی کــوڕی ثــابیتــە). شــافیعی پــەیڕەوی زەیــد دەکــا، لــە زانــستی کەلــەپوور دابەشکردندا.

٣- زەید قورئان خوێنێکی گەورەش بـوو، هـەر لەسـەردەمی پێغەمبـەردا هـەموو قورئـانی لەبـەر بـوو، زەیـد یـەکێ بـوو لـە نووسـەرەکانی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاغەزی بۆ دەنووسی بـۆ خەڵـكو کاغـەزی خەڵکیـشی بـۆ دەخوێندەوە، یەکێ بوو لـە نووسـەرانی سـرووش، لەسـەر فـەرمانی پێغەمبـەر

(دروودی خـودای لەسـەر بـێ) زمـانی عیـبری، کـە زمـانی جوولەکەیـە، لـە ماوەیەکی زۆر کەما فێر بوو، بە پازدە رۆژ زمـانی عیـبری بـە شـارەزایی فێـر بـوو، زمـانی سـەریانیش بـە حەڤـدە رۆژ فێـر بـوو، لەسـەردەمی جێنـشینیی ئەبوبەکردا، بە فەرمانی ئەبوبەکر، لەسـەر راوێـژی عومـەر (رەزای خـودای لێ بێ) قورئانی کۆکردەوە، لەبەر مێرد منـاڵی، لـە غـەزای بـەدردا ئامـادە نـەبوو، بـەڵام ئامـادەی غـەزای ئوحـود بـووە، دەڵـێن: لـە خەنـدەقا بـە کـۆڵ خـۆڵی خەندەقەکـەی دەگواسـتەوە، کاتـێ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بینی، پێی فەرموو: (بەڕاستی ئەم کوڕە کوڕی چاکە). دەڵـێن: لـە دوو بابـەتا، زەید باڵا دەست بووە، بەسەر مەردومدا: لە قورئانو لە فـەرائیزدا، مەسـرووق دەفەرموێ: چووم بۆ مەدینە، روانیم وا زەیـدی کـوڕی پابیـت یەکێـکە لـەزانا هەرە پایە بەرزەکان. دەڵێن: لەناو خێزانـی خۆیـدا زۆر رووخـۆشو مەشـرەب خۆش بووە، بەڵام لەناو کۆڕو مەجلیسدا زۆر سەلارو سەنگین بووە.

جارێ لەکاتی سواربوونی وڵاخا، ئیبنـو عـەباس ئاوزەنگییەکـەی بـۆ دەگـرێ، هـەتا سـواربێ، زەیـد پێـی دەفـەرموێ: ئـەی ئـامۆزای نـازداری پێغەمبـەر! ئـەوە شـایانی شـانی تـۆ نییـە، دەی کەواتـە ئاوزەنگیەکـە بـەردە). ئیبنـو عـەباس دەفەرموێ: (نا، ئێمە ئاوا رەفتار لەگەڵ زانایانو گەورە پیاوان دەکەین).

کۆمـەڵێ لـە فـەرمووده خوازەکـان، فـەرموودەکانی زەیـد دەگێڕنـەوە، لـە هاوڕێیان: ئەبو هورەیرەو ئەبو سەعیدو عومـەرو ئەنـەسو کەسـانی تـریش، لـە پـەیڕەوان (تـابعین): سـەعیدی کـوڕی موسـەییەبو دوو کوڕەکـەی زەیـد خـۆی: خاریجەو سولەیمانو کەسانی تریش.

زۆرینە دەڵێن: ساڵی چلو پێنجی کۆچی مردووە، کە دەمرێ ئەبو هـورەیرە دەفـەرموێ: (ئـەمڕۆ مـەلای گـەورەی نەتـەوەی ئیـسلام مـرد، ئومێدەکە ئیبنـو عەباس جێـگەی بگرێتەوە).

**حەسسانی کوڕی ثابیتیش بەم شیعرە لاواندیەوە:**

**فَمَــــنْ لِلْقَـــوَافِي بَعْــــدَ حَــــسَّانَ وَابْنِــــهِ**
**وَمَــــنْ لِلمَعَــــانِي بَعْــــدَ زيــــدِ بْــــنِ ثَابِـــتِ**

**واتە:**

**شــيعر پـــاش حەســـسان هـــەتيو دەكـــەوێ**
**واتـــای جـوان، پـاش زەيـد گــەر راسـتت دەوێ**

{بڕوانە: تاج/ بەرگی چوارەم/ چاپی چوارەم، لاپەڕە: ٦٢، ژمارە: ٣٦٨٤ + ژمارە: ٣٦٨٥، زنجیرە: ٩٤}.

**(٣١) باب: أمر من نعس في صلاة أو إستعجم عليه القرآن أو الذكر بأن يرقد أو يقعد حتى يذهب عنه ذلك**

**فەرمانكراوە بەكەسێ لەنوێژدا وەنەوز بداو خەو زۆری بۆ هێنابێو قورئانەكە ببڕسكێنێ، كە سەرخەوێ بشكێنێو دانیشێو واز لەنوێژكردن بهێنێ هەتا خەوەكەی دەزڕێو خەو بەری دەدا**

٤٤٨- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَسْجِدَ، وَحَبْلٌ مَمْدُودٌ بَيْنَ سَارِيَتَيْنِ، فَقَالَ: «مَا هَذَا؟» قَالُوا: لِزَيْنَبَ تُصَلِّى، فَإِذَا كَسِلَتْ أَوْ فَتَرَتْ أَمْسَكَتْ بِهِ، فَقَالَ: « حُلُّوهُ، لِيُصَلِّ أَحَدُكُمْ نَشَاطَهُ، فَإِذَا كَسِلَ أَوْ فَتَرَ قَعَدَ ». {الحديث/١٨٢٨ = ١٧٩٨. تجريد/١/٥٥٠، رقم: ٥٧٥ = ١١٥٠}:[٤٤٨]

ئەنەسی كوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو بۆ مزگەوت، ڕوانی وا گوریسێ لەناوەندی دوو كۆڵەكەدا ڕایەڵكراوە، فەرمووی: (ئەم گوریسە چییە؟) گوتیان: ئەمە گوریسی زەینەبی خێزانتە، لەكاتی كردنی نوێژی سوننەتدا كە ماندوو

[٤٤٨] تجريد/١، ژمارە: ٥٧٥ - ١١٥٠، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٣٧٦ = ١٨٢٨.

دەبێ، بەم گوریسە خۆی دەگرێ!! فەرمووی: (بیکەنەوەو لایبەن، شتی وا مەکەن، ئەوەندە نوێژی سوننەت بکەن کە چالاك‌و گورج‌و گۆڵن، کاتێ شەکەت بوون‌و خاو بوونەوەو خوڵکتان نەما، ئیتر وازبێنن‌و دانیشن). {ریاض/١/١٣٦، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ١٤٦} + {تاج/١، زنجیرە: ١٨٥، ژمارە: ٩٩٤}.

## راڤەو شیکردنەوە:

رستەی (ئیتر دانیشن) دوو واتا هەڵ دەگرێ: یەکەم: (ئیتر بەدانیشتنەوە نوێژی سوننەت بکەن). دووەم: ( ئیتر واز لەکردنی نوێژی سوننەت بهێنن، تا مانووتان دەربچێ).

٤٤٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضي اللهُ عَنْها) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ عَلَيْهَا وَعِنْدَهَا امْرَأَةٌ فقَالَ: مَنْ هَذِهِ؟ قَالَتْ فُلَانَةُ تَذْكُرُ مِنْ صَلَاتِهَا قَالَ مَهْ عَلَيْكُمْ بِمَا تُطِيقُونَ فَوَاللَّهِ لَا يَمَلُّ اللَّهُ حَتَّى تَمَلُّوا وَكَانَ أَحَبَّ الدِّينِ إِلَيْهِ مَادَامَ عَلَيْهِ صَاحِبُهُ). (الحديث ٤٣- طرفه في: ١١٥١):[٤٤٩]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتەوە، لەو دەمەدا ئافرەتێکم لەلا بوو، فەرمووی: ئەم ژنە کێیە؟ گوتم: ئەمە فیسارە ئافرەتە، بۆ نوێژ کردن‌و خوداپەرستی مانەندی کەمە! فەرمووی: (وسبە! ئەوەندە خواپەرستی بکەن کەلەتواناتاندا بێ، چوونکە بەخودا هەتا ئێوە وەڕس نەبن خودا وەڕس نابێ، واتە: پاداشدانەوەی خودا بۆ ئێوە بەردەوام دەبێ تائێوە لەتاعەتکردن سارد دەبنەوە، وەباشترین ئاییینداری لەلای خودا ئەوەیە کەخاوەنەکەی بەردەوام بێ لەسەری).

---

[٤٤٩] تجرید/١، ژمارە: ٤٠، بخاری: ٤٣، ١١٥١، مسلم: ٧٨٥ = ١٨٢٠.

**راڤەو شیکردنەوە:**

گفتو گۆی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەكاتی روون كردنـەوەی بابەتەكانی ئاییندا، باڵەگەڵ ئامادەبوانی كۆڕەكەیش بێ، بەڵام مەبەست لێی سەرجەمی گەلی ئیسلامە چونكە بڕیاری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ تاك یالەسەر تاك بڕیاریشە بۆ كۆمەڵ یا لەسەر كۆمەڵ، مەگەر بەڵگەیەكی سەربەخۆ هەبێ، كەڕێگە لەوە بگرێ، هەروا بڕیار لەسەر پیاو، ژنیش دەگرێتەوە، كەواتە: ئەم رستەو وشەو زاراوانە هەموو موسوڵمانێ لەهەموو چەرخو سەردەمێكادەگرنەوە، مەگەر بەڵگەی تایبەتی هەبێ: بەندە، پیاو، كەسێ، لەزمانی عەرەبیی دا جیاوازی زۆرە لەنێوان داڕشتە (صیغە) ی نێرو مێ دا، بەڵام لەكوردی دا ئەمە زۆر كەمە، بۆ نموونە ئەم ڕستەو داڕشتەیانە لەعەرەبی دا بۆ نێرینەن: (يأيها الذين أمنوا، أحدكم، ياعبادي، صاحبه، فلان) بەرابەری ئەمانە ئەمانەن، كەبۆ مێینەن: (يا أيها اللاتي آمن، إحداكن، يا إمائي، صاحبته، صاحبتها، صاحبها، فلانة) لەسەر ئەم بنیاتە: وشەی (عليكم) لەم فەرموودەیەدا گەرچی بۆ پیاوانەو، لەكاتی خۆی دا گفتو گۆكە لەگەڵ هاوڕێیان دا بووە، بەڵام ژنانیش دەگرێتەوە، چوونكە بەڵگەیێ نیە كەبیبڕێ بەسەر پیاواندا، هەر وەك هەموو موسوڵمانێ چ پیاو چ ژن، لەهەموو چەرخو چاخێكا دەگرێتەوە، چونكە بەڵگەیێ یا نیشانەیێ نییە كە بیبڕێ بەسەر كاتێكی تایبەتدا. مەبەست لە (دین) ئایین نیە، چوونكە خاوەن ئایین ئەبێ بەردەوام بێ لەسەری هەتا مردن، بەڵام مەبەست ئایینداریی‌و خوداپەرستی كردنە، لەتەرجەمە كوردییەكەدا، وەك زۆربەی كات، مەبەستە سەرەكییەكە چەسپێندراوە، نەك واتەی پیت بەپیتی لەفظو بێژەكە، ئەوەیش دەگەڕێتەوە بۆ كۆمەڵە یاسایەك لەكاتی وەرگێڕانو ڕاڤەكردنو لێكدانەوەدا،

٤٧٤- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتَ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: {لَا صَلَاةَ بَعْدَ اَلصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ اَلشَّمْسُ وَلَا صَلَاةَ بَعْدَ اَلْعَصْرِ حَتَّى تَغِيبَ اَلشَّمْسُ}. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَلَفْظُ مُسْلِمٍ: {لَا صَلَاةَ بَعْدَ صَلَاةِ اَلْفَجْرِ}. {تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٣٣٨ هەتا ژمارە: ٣٤٣. پوختەی موسلیم ٢١٨ = ٨٢٧ مسلم = ١٩١٧ شیحا}:[٤٧٤]

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموی: بیستم لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەپاش کردنی نوێژی بەیانی، نوێژی سوننەت ناکرێ، هەتا خۆر هەڵدێ، لەپاش کردنی نوێژی عەصریش نوێژی سوننەت ناکرێ، هەتا خۆرئاوا دەبێ). گوتەی موسلیم لەژمارە (١٩٢٠)دا ئاوایە: لەجیاتی (لَا صَلَاةَ بَعْدَ صَلَاةِ اَلصُّبْحِ) ئەمەیە (لَا صَلَاةَ بَعْدَ صَلَاةِ اَلْفَجْرِ) کە (فەجر) بەواتا (صبح)ە، کەواتە: واتاکە یەك شتە.

٤٧٥- عَنْ ابْنُ عُمَرَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (لَا تَحَرَّوْا بِصَلَاتِكُمْ طلُوعَ الشَّمْسِ وَلَا غُرُوبَهَا). (الحديث ٥٨٢- أطرافه في: ٥٨٥، ٥٨٩، ١١٩٢، ١٦٢٩، ٣٢٧٣) وقال ابن عمر (رَضيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قال رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (إذا طلع حاجب الشمس فأخروا الصلاة حتى تغيب) (الحديث ٥٨٣ ـ طرفه في: ٣٢٧٢).[٤٧٥]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەقەستی لەکاتی خۆرکەوتن، یاخۆرئاوابوونا نوێژ مەکەن) لەگێڕانەوەیەکدا: ئیبنوعومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی:

---

[٤٧٤] تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٣٣٨ = ٥٨١، پوختەی موسلیم/١، ژمارە: ٢١٨ = ٨٢٧، ترقیم محمد فؤاد = ١٩١٧، ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا.

[٤٧٥] تەجرید/١، ژمارە: ٣٣٩ = ٥٨٢، ٥٨٣، مسلم: ٨٢٨ = ١٩٢٢.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەخۆر لەئاسۆوە سەری کێشا ئیتر نوێژ مەکەن تابەقەد ڕمێك بەرز دەبێتەوە، کەخۆریش گەیشتە دەم کەل‌و نووکی لای خوارووی ئاوابوو ئیتر نوێژ مەکەن تابەتەواوی ئاوا دەبێ). (ت/١/٢٠٤/٢ = ز-٥٠ ژ-٣٧٣ = ش/ ن).

٤٧٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ - رضى الله عنهما - قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - « إِذَا طَلَعَ حَاجِبُ الشَّمْسِ فَدَعُوا الصَّلاَةَ حَتَّى تَبْرُزَ ، وَإِذَا غَابَ حَاجِبُ الشَّمْسِ فَدَعُوا الصَّلاَةَ حَتَّى تَغِيبَ ».[٤٧٦]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەخۆر لەئاسۆوە سەری کێشا، ئیتر نوێژ مەکەن، هەتا بەقەد ڕمێك بەرزدەبێتەوە، هەروا کە نووکی خۆریش ئاوابوو، ئیتر نوێژ مەکەن، هەتا بەتەواوی ئاوادەبێ). (تاج/١، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٣٧٣).

## (٥٤) باب: معرفة الركعتين اللتين كان يصليهما النبي (صلى الله عليه وسلم) بعد العصر

٤٧٧- عَنْ كُرَيْبٍ رَحِمَهُ اللَّهِ تَعالى: أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ وَالمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ وَعَبْدَالرَّحْمنِ بْنَ اَزهَرَ، (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم): اَرسَلُوهُ إلى عائِشَةَ، (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) فَقَالُوا، إِقْرَأْ عَلَيْهَا السَّلاَمَ مِنَّا جَمِيعاً، وَسَلْها عِنِ الرَّكْعَتَينِ بَعْدَ صَلاةِ العَصْرِ، وَقُلْ لَهَا: إِنَّا أُخبِرْنا أَنَّكِ تُصَلِّيَنَّهُما، وَقَدْ بَلَغَنَا أَنَّ النَبيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهى عَنْها، وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وكُنْتُ أَضْرِبُ النَّاسَ مَعَ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ عَنْهَا، فَقَالَ كُرَيبٌ: فدخلت على عائشة رَضِيَ اللَّهُ عَنْها، فَبَلَّغْتُهَا ما أَرْسَلُونى، فَقالَتْ: سَلْ أُمَّ سَلَمَةَ، فَخَرَجْتُ إِلَيهِمْ، فَأَخْبَرْتُهُمْ بِقَوْلِها، فَرَدُّونِى إلى أُمِّ سَلَمَةَ بِمِثْلِ ما أَرْسَلُونى بِهِ إِلَى عائِشَةَ. فَقَالَتْ

[٤٧٦] بخاری: ٥٨٢، مسلم: ١٩٢٢، تاج/١، ژمارە: ٣٧٣.

أُمُّ سَلَمَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْها: سَمِعْتُ النَّبِيّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ يَنْهَى عَنْها، ثُمَّ رَأَيْتُهُ يُصَلّيهِمَا حِيْنَ صَلّى العَصْرَ، ثُمَّ دَخَلَ عَلَيَّ وَعِنْدِي نِسْوَةٌ مِنْ بَنِي حَرَامٍ مِنَ الأَنْصَارِ، فَأَرْسَلَتُ إِلَيْهِ الجَارِيَةَ، فَقُلْتُ: قُومِي بِجَنْبِهِ، قُولِي لَهُ: تَقُولُ لَكَ أُمُّ سَلَمَةَ: يارَسُولَ اللّٰهِ، سَمِعْتُكَ تَنهَى عَنْ هَاتَيْنِ، وَأَراكَ تُصَلّيهِمَا؟ فَإِنْ أَشَارَ بِيَدِهِ فَاستَأخِرِي عَنْه، فَفَعَلَتِ الجارِيَةُ، فَأَشَارَ بِيَدِهِ، فَاستَأْخَرَتْ عَنْهُ، فَلَمَّا أنصَرَفَ، قَالَ: (يَابِنْتَ أَبِي أُمَيَّةَ، سَأَلْتِ عَنِ الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ العَصْرِ، وَ إِنَّهُ أَتَانِي نَاسٌ مِنْ عَبْدِالقَيْسِ، فَشَغَلُونِي عَنِ الرّكعَتَينِ اللّتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ فَهُما هاتان). ( الحديث ١٢٣٣ – طرَفُهُ في: ٤٣٧٠ ):[٤٧٧]

كورەيب (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئیبنوعەباس و میسوەری کوڕی مەخرەمەو عەبدورەحمانی کوڕی ئەزهەر، ئەم سێ هاوڕێیەی پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر بێ- منیان نارد بۆلای عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر بێ- فەرموویان بچۆ بۆ خزمەتی، سلاوی هەموومانی عەرز بکە، وە لەبارەی کردنی دووڕکات نوێژی سووننەت لەپاش فەرزی عەصرەوە پرسیاری لێ بکە، عەرزی بکە لەزمانی ئێمەوە، کە ئێمە هەوالمان پێ دراوە، کە تۆ ئەو دووڕکاتە سوننەتە دەکەی، وەلحالّ ئێمە پێمان گەیشتۆتەوە کەپێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- نەیی لەم نوێژە کردووە، سەرەڕای ئەمەیش ئیبنو عەباس (رەزای خوای لێ بێ) فەرموی: وەمن خۆم لەگەلّ ئیمامی عومەردا، لەسەرکردنی ئەم نوێژە لەپاش عەصر، لەخەڵکم دەدا، جا کورەیب فەرمووی: جا چووم بۆمالّی عائشە (رەزای خوای لێ بێ) پەیامەکەی ئەوانم پێ ڕاگەیاند، فەرمووی: لە ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر لەم بارەیەوە بپرسە، هەوالّی تەواو لای ئەوە، منیش چوومەوە بۆ خزمەتی ئەوان و قسەکەی عائیشەم پێگوتن، جا لەسەرهەمان شێوەی کە ناردمیان بۆلای عائیشە،

---

[٤٧٧] تجرید/٢، ژمارە: ٥٩٧ = ١٢٣٣، مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٢٢٠ = ١٩٢٩ شیحا.

ناردمیـشیان بـۆ خزمـەتی ئـوم سـەلەمە، ئـوم سـەلەمە (ڕەزای خـوای لێ بـێ) فەرمووی: لەپێغەمبەر خۆیم دەبیست کەنەهی دەکرد لـەم نوێـژە، کەچـی ڕۆژی دیـتم کـاتێ لـەکردنی نوێـژی عەصـر بـۆوە تەشـریفی هـات بـۆ ماڵـەوە لەماڵـەوە دووڕکات نوێـژی لەپاشـیەوە کـرد، لـەو کاتـەدا کۆمـەڵێ ئـافرەتی ئەنـصاریم لـەلا بوون، کە لەخێڵی بـەنی حـەرام بـوون، لەبەرئـەوە خـۆم لێـیم نەپرسـی، بـەڵکوو کارەکەرەکەم نارد بۆ خزمـەتی و پـێم گـوت: لەتەنیـشتیەوە ڕابوەسـتەو عـەرزی بکە: کە ئوم سەلەمە عەرزت دەکا: ئەی پێغەمبەری خوا ! من لەخۆتم بیـستووە کـە نـەیی دەکـەی لـەکردنی ئـەم دوو ڕکاتـە لـەم کاتـەدا، کەچـی ئـەوەتا خـۆت دەیانکەی ؟ بە کەنیزەکەم گوت: جا ئەگەر بەدەستی ئاماژەی بـۆ کـردی کـەکاتی ئەوە نییە، بچۆرە دواوەو وازی لێ بهێنـە، کەنیزەکەکـەش ڕێـك وایکـردو ئـەویش لـەناو نوێژەکـەدا، کـە لـە پرسـیارەکە حـاڵی بـوو بەدەسـتی ئامـاژەی کـرد، ئـیتر کارەکەرەکە ڕۆیشتە دواوەو پێغەمبەری بەجێ هێشت، کاتێ لە نوێژەکـەی بـۆوە، فەرمووی -دروودی خوای لەسەر بێ-: (ئەی کچی ئەبو ئومەییە ! لەم دوو ڕکاتـە نوێژە سوننەتە دەپرسیت، کە ئێستا لەپاش نوێژی عەسرەوە من کـردمن، ئەمـە دوو ڕکاتە سوننەتەکەی دوا نوێژی نیوەڕۆ بوو ئێستا گێڕامنەوە، چونکە لەکاتی خۆیاندا نەم پەرژا کـە بیانکـەم، بـەهۆی خـەریکبوونم لەگـەڵ وەفدەکـەی هـۆزی عەبدول قەیسی دا کە هاتبوون ئیسلام ببن و ببن بە نوێنەری هۆزەکەیان).

## راڤە و شیکرنەوە:

عەبـدولڕەحمانی کـوڕی ئەزهـەر بـرازای عبـدالرحمنی کـوڕی عەوفـە، لـە صەحابە گەنجەکانە، لە ساڵی فەتحدا، ڕەسیدە بوو، لەگـەڵ پێغەمبـەردا ئامـادەی غەزای حونەین بوو.

عَنْ أَبِي سَلَمَةَ أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) عَنِ السَّجْدَتَيْنِ اللَّتَيْنِ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّيهِمَا بَعْدَ الْعَصْرِ؟ فَقَالَتْ: كَانَ يُصَلِّيهِمَا قَبْلَ الْعَصْرِ ثُمَّ إِنَّهُ شُغِلَ عَنْهُمَا، أَوْ نَسِيَهُمَا، فَصَلاَّهُمَا بَعْدَ الْعَصْرِ، ثُمَّ أَثْبَتَهُمَا، وَكَانَ إِذَا صَلَّى صَلاَةً أَثْبَتَهَا، قَالَ إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرَ: تَعْنِي دَاوَمَ عَلَيْهَا). {الحديث/ ١٩٣١}:

ئەبو سەلەمە دەفەرموێ: سەبارەت بەو دووركاتە نوێژە سوننەتەی كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كردبوونی بەعادەت لەپاش كردنی نوێژی عەصر دەیكردن، سەبارەت بەم دوو ركاتە نوێژە لە دایكە عائیشەم پرسی، هۆی كردنی ئەم دوو ركاتە لەم كاتەدا چی بوو؟

عائیشە فەرمووی: ئەمە ئەو دوو ركاتە سوننەتە بوون كە لەپێش نوێژی عەصردا دەیكردن، هەتا جارێ نەیپەرژا كە لەكاتی خۆیاندا لەپێش عەصردا بیانكا، یا لەبیری نەبوو كە لەكاتی خۆیاندا بیانكا، لەپاش عەصر كردنی، ئیتر لەوەدوا تەركی نەكردن، چونكە دەستووری وابوو كە نوێژێكی سوننەتی دەكرد ئیتر لەوكاتەدا تەركی نەدەكرد، ئیسماعیلی كوڕی جەعفەر، كە یەكێكە لە پیاوانی رشتەی ئەم فەرموودەیە دەفەرموێ: مەبەستی عائیشە ئەوە بووە، كە لەوەپاش بەردەوام لەوكاتەدا دەیكرد}.

**روونكردنەوە:**

ئەو بڕیارانەی لەم چەند فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١- نوێژی سوننەت كە هۆیەكی تایبەتی نەبێ، كردنی لەم كاتانەدا ناباشەو ناپەسەندە.

٢- بەقەستی كردنی نوێژی فەرز دوابخرێ بۆ ئەم كاتانە، كارێكی فرە ناباش‌و ناپەسەندە گەرچی نوێژەكە دادەمەزرێ.

٣- واباش‌و پەسەندو سوننەتە، کە لەنزیکترین هەلی رەخساودا، نوێژی فەوتاو قەزا بکرێتەوە، وەکاتی دیاریکراو نییە بۆ ئەو قەزاکردنەوەیە.

هەر نوێژێ کەهۆی تایبەتی هەبێ، کردنی لەم کاتانەدا ناباش‌و ناپەسەند نییەو بەڵکوو سوننەتە، وەك سوننەتی دەستنوێژو سوننەتی دیاری مزگەوت‌و نوێژی تەرم‌و نوێژ گێڕانەوە.

٤٧٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (رَكْعَتَانِ لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَعُهُمَا سِرًّا وَلَا عَلَانِيَةً رَكْعَتَانِ قَبْلَ صَلَاةِ الصُّبْحِ وَرَكْعَتَانِ بَعْدَ الْعَصْرِ). (الحديث ٥٩٢ طرفه في: ٣٩٠).[٤٧٨]

دیسان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دوونوێژ هەن، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەبەنهێنی‌و نەبەئاشکرا تەرکی نەدەکردن: دوورکات لەپێش نوێژی بەیانی یەوەو دوورکات لەپاش نوێژی عەصرەوە).

## (٥٥) باب: إستحباب ركعتين قبل صلاة المغرب

## کردنی دوو ڕکات نوێژی سوننەتی پێش نوێژی شێوان سوننەتە

٤٧٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ كَانَ الْمُؤَذِّنُ إِذَا أَذَّنَ قَامَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) يَبْتَدِرُونَ السَّوَارِيَ حَتَّى يَخْرُجَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) وَهُمْ كَذَلِكَ يُصَلُّونَ الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْمَغْرِبِ ، وَلَمْ يَكُنْ بَيْنَ الأَذَانِ وَالإِقَامَةِ شَيْءٌ.[٤٧٩]

---

[٤٧٨] تجرید/١، ژمارە: ٣٤٣ = ٥٩٢، ٣٩٠، مسلم: ٨٢٥ - ١٩٣٣ شیحا.

[٤٧٩] بخاری: ٦٢٥، ریاض الصالحین. بەرگی سێیەم، زنجیرە:٢٠١، ژمارە: ١٧٤/١١٢٣/٢، مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٢٢٢.




ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گەورە پیاوانی یارانی پێغەمبەرم، بەچاوی خۆم دەدی، لەپاش بانگی نوێژی شێوان، بە پەلە پەل پەلاماری لای کۆڵەکەکانی مزگەوتەکەی پێغەمبەریان دەدا. لەوێدا دوو رکات سوننەتی بەرینەی نوێژی شێوانیان دەکرد، لەنێوانی بانگی شێوان‌و قامەتدا، ماوەیەکی زۆر کەم هەبوو.

بۆ رونکردنەوەی تەواو، ئەم فەرموودەی تریش لە (مختصر صحیح مسلم) ژمارە (٢٢٢ = ١٩٣٥ شیحا) راگوێز دەکەین وەك خۆی:

عَنْ مُخْتَارِ بْنِ فُلْفُلٍ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ عَنِ التَّطَوُّعِ بَعْدَ الْعَصْرِ، فَقَالَ: كَانَ عُمَرُ يَضْرِبُ الأَيْدِي عَلَى صَلاَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ، وَكُنَّا نُصَلِّي عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَكْعَتَيْنِ بَعْدَ غُرُوبِ الشَّمْسِ قَبْلَ صَلاَةِ الْمَغْرِبِ، فَقُلْتُ: أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلاَّهُمَا؟ قَالَ: كَانَ يَرَانَا نُصَلِّيهِمَا، فَلَمْ يَأْمُرْنَا وَلَمْ يَنْهَنَا). {الحديث/ ١٩٣٥}:

موختاری کوڕی فولفول فەرمووی: سەبارەت بەکردنی نوێژی سوننەت لەپاش نوێژی عەصر لە ئەنەسی کوڕی مالیکم پرسی، کە زانیاری ئێوە چییە لەم بارەیەوە؟

فەرمووی: ئیمامی عومەر (رەزای خودای لێ بێ) لەسەردەمی جێنشینی خۆیدا لەوکەسانەی دەدا، کە لەپاش نوێژی عەصر، نوێژی سوننەت دەکەن، لەسەرئەوە لێی دەدان، کە نەییی لە نوێژ کراوە لەم کاتەدا.

ئەنەس فەرمووی: بەلام ئێمەی هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەیارانی بێ) لەپاش خۆرئاوا بوون، لەدوا بانگی شێوان، لەنێوانی بانگ‌و نوێژی شێوانا، دوو رکات نوێژی سوننەتی پێش نوێژی شێوانمان دەکرد، پێم گوت: ئایا پێغەمبەر خۆی ئەم دوو رکاتە سوننەتەی

دەكـرد، كـە ئێـوە لـەم كاتـەدا دەتـانكردن؟ فـەرمووى: (چـاوى لێمـان بـوو كـە دەمـانكردن، بـەڵام بەچـاك‌و خـراپ هـەقى نـەبوو بەسـەرمانەوە: نەدەيفـەرموو بيكەن، نە دەيفەرموو مەيكەن).

(٥٦) باب: بين كل أذانين صلاة

لەنێوانی هەموو بانگ‌و قامەتێكا، دوو ڕكات نوێژی سوننەت هەيە

٤٨٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ الْمُزَنِيِّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلاَةٌ». قَالَهَا ثَلاَثًا، قَالَ فِي الثَّالِثَةِ: « لِمَنْ شَاءَ ». {الحديث/١٩٣٧ = ١٩١٠ فم. تجريد/١/٣٥٨، رقم: ٣٦١ = ٦٢٤، ٦٢٧} + {رياض/٣/٩٥، زنجيره: ١٩٥، ژماره: ١٠٩٩}:[٤٨٠]

عەبـدوڵڵای كـوڕی موغەففـەلی ئـەل - مـوزەنی (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سێ‌جار فـەرمووی: (لـەنێوانی هـەموو بـانگ‌و قامەتێـكا، نوێژێـكی سوننەت هەيـە). لەسـەری جـاری سێيەما فـەرمووی (دروودی خـودای لەسـەر بـێ): (ئەمـە بـۆ كەسـێ كـە ئـارەزووی ئـەم نوێژەی هەبێ). {تاج/١/٣٠٨، زنجيره: ١٠٤، ژماره: ٦٠٥، چاپی/٢}.

ڕوونكردنەوە:

عەبـدوڵڵای كـوڕی موغەففـەل، يەكێـكە لـە دەسـتەی پـەيمانی خۆشـنوودی (بەيعەتی ڕيضوان) كە پێـشيان دەگـوترێ: (أَصْحَابُ الشَّجَرَةِ = يـارانی درەخـت) عەبدوڵڵا دەيفەرموو: بە دەستی خـۆم لق‌و پـۆپی ئـەو درەختـەم لـە پێغەمبـەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) دوور دەخـستەوە، كــە لــەكاتی ڕێــكەوتنی

[٤٨٠] تجريد/١، ژماره: ٣٦١ = ٦٢٤، مختصر صحيح مسلم/١، ژماره: ٣٧١ - ٨٣٨ = ١٩٣٧.

حودەیبییەدا، پەیمانی بەیعەتو ریضوانی لە ژێردا سازدرا، کە خودای گەورە لەم ئایەتەدا، یادی ئەو رووداوو درختو پەیمانەی تۆمار کردووە، کە دەفەرموێ: {لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا - سورة الفتح/ ٤٨ - ١٨}.

چلو سێ فەرموودەی هەیە، لە بوخاریدا پێنجی هەیە، کاتێ شاری (تستر) ئازادکرا عەبدوڵڵا یەکەم کەس بوو لە دەروازەکەیەوە چووە ژوورەوە، لە هەموو کەسێ زیاتر حەسەنی بەصری فەرموودەکانی ئەو دەگێڕێتەوە، یەکێ بوو لەو دەکەسە کە پێشەوا عومەر ناردنی بۆ بەصرە، هەتا دانیشتوانی شارەزای ئایین بکەن، حەوت منالی هەبوو، سالی شەستی کۆچی لە بەصرە مرد، لەسەر راسپێری خۆی، ئەبو بەرزەی ئەسلەمی نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کرد).

## (٥٧) باب: صلاة الخوف
## باسی نوێژی ترس

٤٨١- وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) قَالَ: {غَزَوْتُ مَعَ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قِبَلَ نَجْدٍ، فَوَازَيْنَا اَلْعَدُوَّ، فَصَافَفْنَاهُمْ، فَقَامَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُصَلِّي بِنَا، فَقَامَتْ طَائِفَةٌ مَعَهُ، وَأَقْبَلَتْ طَائِفَةٌ عَلَى اَلْعَدُوِّ، وَرَكَعَ بِمَنْ مَعَهُ، وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ انْصَرَفُوا مَكَانَ اَلطَّائِفَةِ الَّتِي لَمْ تُصَلِّ فَجَاءُوا، فَرَكَعَ بِهِمْ رَكْعَةً، وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، فَقَامَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ، فَرَكَعَ لِنَفْسِهِ رَكْعَةً، وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَهَذَا لَفْظُ اَلْبُخَارِيِّ. {تجريدی بوخاری/١، ژمارە: ٤٩٦ =




٩٤٢، ٩٤٣، ٤١٣٢، ٤١٣٣، ٤٥٣٥ مـــسلم/شـــيحا ٥٩٠٩ = مـــسلم ٨٣٩}: [٤٨١]

عەبـدوڵڵای كـوڕی عومـەر (ڕەزای خـوددا لـەخۆیو لـەباوكی) فـەرمووی: جارێ لەخزمەت پێغەمبـەر خۆیـدا (درودی خـودای لەسـەر بێ) بـەرەو نەجـد ڕۆیشتین بۆ غەزا، ڕۆیشتین هەتا بەرەنگاری دوژمـن بووینـەوە، كـە ڕووبـەڕووی دوژمن بووینەوە، ریزمان بەست بۆیـان، جـا پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بێ) هەستا لەسەر ئەم شێوەیە، لەو غەزایەدا كەغـەزای زاتولریقـاع بـوو، نوێـژی ترسـی كـرد بۆمـان: موسـوڵمانەكان بـوون بـەدوو تـاقم: تاقمەیـەكیان لەگـەڵ پێغەمبـەردا (درودی خـودای لەسـەر بـێ) نوێـژیان دابەسـت، ئـەو تاقمەكـەی تریـشیان بەچـەكەوە بەرامبـەری دوژمـن ڕاوەسـتان، پـاسو ئێـشكی ئـەوانیان دەگرت، جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ڕكاتێكی بـەو تاقمەیـە تـەواو كرد، كە لەسەرەتاوە لەگەڵیدا نوێژیان دابەست، بەم ڕەنگـە لەگـەڵ پێغەمبـەردا، فاتیحایان خوێندو چەمینەوەی ركاتی یەكەمیان تـەواو كـردو دوو كوڕنووشـیان بـرد، ئـەوجا لەگـەڵ پێغەمبـەردا (درودی خـودای لەسـەر بـێ) ڕاسـتبوونەوە سەرپێ، ئەوجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەستی كـرد بەخوێنـدنی قورئانی ناو نوێژ، ئەوانیش هەڵسانەوەو بەبێ ئەوەی كەسلاو بدەنـەوە ڕۆیـشتن بۆ شوێنی ئەو تاقمەكەی تر كە هەتا ئـەو دەمـە ئێـشكیان دەگـرت، وە لەشـوێنی ئـەوان بـوون بەپاسـەوانی سـوپاكە، ئینجـا دەسـتەكەی تـر هـاتنو لەپـشتی پێغەمبـەرەوە ڕیزبـوونو نوێـژیان لەپـشت پێغەمبـەرەوە دابەسـتو، پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) ڕكاتێكی بەوانیش تەواو كرد، بەم ڕەنگە ئەوانیش

---

[٤٨١] تجريد/١، ژمـارە: ٤٩٦ = ٩٤٢، مـسلم، محمـد فـؤاد عبـدالباقی: ٨٣٩ - مـسلم تـرقيم شـيحا: ٥٩٠٥، ١٩٣٩.

فاتیحەو سوورەتیان خوێندو لەگەڵ پێغەمبەردا چەمینەوەیان ئەنجام داو، دوو کورنووشیان لەگەڵیدا بردو، ئیتر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دانیشت بۆ تەحیات خوێندن‌و تەحیاتی خوێندو سڵاوی دایەوە، ئەوجا هەریەکێ لەو دووو تاقمەیە هەڵسانەوە، هەر کەسەی سەرو ڕکاتی تری بەتەنیا بۆ خۆی کردو سڵاوی دایەوە.

**ڕوونکردنەوە:**

١- مەبەست لەنوێژی ترس نوێژێکی تایبەتی نییە، کە لەکاتی ترسدا فەرزبێ، یان سوننەت بێ کەبکرێ، بەڵکوو مەبەست کردنی پێنج نوێژە فەرزەکانە، کە لەکاتی شەڕوشۆڕدا، لەسەریەکێ لەو چەند شێوانەی کە لە سوونەتدا تۆمارکراون دەکرێن. ئیبنو حەزم دەفەرموێ: (لەگێڕانەوەی ساغدا، چواردە شێوەی نوێژی ترس تۆمار کراون، کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەغەزاکانیدا کردوویانی). هەندێکی تر دەفەرموون: (حەڤدە شێوە چەسپاوەو سەلماوە).

٢- ئەم نوێژەی کەلەم غەزایەدا لەسەر ئەم شێوەیە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەجەماعەت کردی، بۆ هاوڕێیانی، کەئیبنو عومەر لەو غەزایەدا بووەو خۆی هاوبەشی لەونوێژەدا کردووە، هەندێ فەرموویانە: نوێژی عەصر بووە، هەندێکی تر فەرموویانە: نوێژی نیوەڕۆ بووە.

٣- نوێژی ترس ئەگەر بەکۆمەڵی، واتە: بەجەماعەت، بکرێ، بەسێ کەس کەمتر ناکرێ، چونکە سێ کەسەکە، یەکێکیان دەبێ بەپێشنوێژ، یەکێکی تریان لەگەڵ ئەودا رکاتی یەکەم تەواو دەکا، سێیەمیان لەوکاتەدا ئێشك دەگرێ‌و پاسەوانی پێشنوێژو تاقە پاشنوێژەکەیەتی.

٤٨٢- عنْ سهل بن ابي حثمة (رَضيَ اللهُ عنهُ) ، وكان شَهدَ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يَوْمَ ذاتِ الرِّقَاعِ صَلّى صَلاةَ الْخَوْفِ انَّ طائِفَةً صَفَّتْ مَعَهُ وَطائِفَةٌ وِجَاهَ الْعَدُوِّ فصَلّى بالّتِي مَعَهُ رَكْعَةً ثمَّ ثبَتَ قَائِمًا وَاتَمُّوا لانْفُسِهِمْ ثمَّ انْصَرَفُوا فَصَفُّوا وِجَاهَ الْعَدُوِّ وَجَاءَتْ الطائِفَةُ الاخْرَى فَصَلّى بِهِمْ الرَّكْعَةَ الّتِي بَقِيَتْ مِنْ صَلاتِهِ ثمَّ ثبَتَ جَالِسًا وَاتَمُّوا لانْفُسِهِمْ ثمَّ سَلّمَ بِهِمْ (الحديث: ٤١٢٩ ):[٤٨٢]

سەهلی کوڕی ئەبی حەسمە(ڕەزای خودای لێ بێ) کە لە غەزای زاتو ریقاعا، لەخزمەتی پێغەمبەردا بووە، لەوکاتەدا کەنوێژی ترسی بۆ هاوڕێکانی کردووە، فەرمووی: موسڵمانەکان بوون بەدوو دەستەوە، دەستەیەکیان لەپشت پێغەمبەرەوە ڕیز بوون و دەستەکەی تریش بەرابەر دوژمن ڕاوەستان، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ڕکاتێکی تەواو کرد بەو تاقمەیەی کە لەگەڵیابوون، ئەو ساخۆی بە پێوەڕێك ڕاوەستا، هەتا ئەوان ڕکاتێکی تریان کردو نوێژی خۆیان بۆ خۆیان تەواو کردو، ڕۆیشتن ڕووبەڕووی دوژمن ڕاوەستان، ئەو جا ئەو دەستەکەی ترهاتن، کە هەتا ئێستا ڕووبەڕووی دوژمن ڕاوەستابوون، ئەو جا پێغەمبەر خۆی لەدوو ڕکاتەکەی خۆی ڕکاتێکی مابوو، ئەو ڕکاتەیشی کرد لەگەڵ ئەوانا، واتە: لەڕکاتی دووەمیا پێشنوێژی بۆ دەستەی دووەم کرد، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەسەر شێوەی تەحیات ڕێك دانیشت، هەتا تاقمەی دووەم هەستان سەرو ڕکاتیتریان کرد بۆ خۆیان، ئەوجا تەحیاتیان خوێند و پێغەمبەر سلاوی پێیان دایەوە).

ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیە لە ژمارە (٤٩٩)ی شەرحی بلوغ المرامدا).

٤٨٣- عَنْ صَالِحِ بْنِ خَوَّاتٍ، {عَمَّنْ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اَللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) يَوْمَ ذَاتِ اَلرِّقَاعِ صَلَاةَ اَلْخَوْفِ: أَنَّ طَائِفَةً مِنْ أَصْحَابِهِ صَلَّتْ مَعَهُ وَطَائِفَةٌ وِجَاهَ

---

[٤٨٢] تجريد/٤، ژمارە: ١٥٥٦ = ٤١٣٩، مسلم: ٨٤٢ = ١٩٤٤.

اَلْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِالَّذِينَ مَعَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ ثَبَتَ قَائِمًا وَأَتَمُّوا لِأَنْفُسِهِمْ، ثُمَّ انْصَرَفُوا فَصَفُّوا وِجَاهَ اَلْعَدُوِّ، وَجَاءَتِ اَلطَّائِفَةُ اَلْأُخْرَى، فَصَلَّى بِهِمْ اَلرَّكْعَةَ اَلَّتِي بَقِيَتْ، ثُمَّ ثَبَتَ جَالِسًا وَأَتَمُّوا لِأَنْفُسِهِمْ، ثُمَّ سَلَّمَ بِهِمْ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَهَذَا لَفْظُ مُسْلِمٍ. وَوَقَعَ فِي "اَلْمَعْرِفَةِ" لِابْنِ مَنْدَهْ، عَنْ صَالِحِ بْنِ خَوَّاتٍ، عَنْ أَبِيهِ. {تجريدی بوخاری/٤، ژماره: ١٥٥٤ = ٤١٢٥، ٤١٢٦، ٤١٢٧، ٤١٣٠، ٤١٣٧ فتح الباری. مسلم/شيحا ١٩٤٥ = مسلم/٨٤٢}:[٤٨٣]

صالحی كوڕی خەووات (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەكەسێكم بیستووە، كە ئەو كەسە لەرۆژی غەزای زاتولریقاعدا، بەجەماعەت، لەپشتی پێغەمبەرەوە نوێژی كاتی ترسی دوژمنی كردووە، فەرمووی: (موسوڵمانەكان بوون بەدوو دەستەوە، دەستەیەكیان لەپشتی پێغەمبەرەوە ریزبوونو، دەستەكەی تریشیتان بەرابەر دوژمن بەچەكەوە ڕاوەستاون، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕكاتێكی تەواو كرد بەو تاقمەی كە لەگەڵیدا بوون، ئەوسا خۆی بەپێوە ڕێك ڕاوەستا، هەتا ئەوانەی كە لەگەڵ پێغەمبەردا ركاتی یەكەمیان كردبوو، ڕكاتێكی تریان كردو نوێژی خۆیان بۆ خۆیان تەواو كرد، ڕۆیشتن ڕووبەڕووی دوژمن ڕاوەستان، ئەوجا ئەو دەستەكەی تر هاتن، كە هەتا ئێستا ڕووبەڕووی دوژمن ڕاوەستابوون، ئەوجا پێغەمبەر خۆی لەدوو ڕكاتەكەی خۆی ڕكاتێكی مابوو، ئەو ڕكاتەیشی كرد لەگەل ئەوانا، واتە: لەڕكاتی دووەمیدا، پێشنوێژی بۆ دەستەی دووەم كرد ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر شێوەی تەحیات ڕێك دانیشت، هەتا تاقمەی دووەم هەستان سەرو ركاتی تریان كرد بۆخۆیان، ئەوجا تەحیاتیان خوێندو پێغەمبەر سڵاوی پێیان دایەوە،

---

[٤٨٣] بخاری: ٤١٢٩، ٤١٣١، مسلم: ١٩٤٤ شيحا.

واتـه: خـۆی سـلاوی نوێـژی دایـەوەو ئـەوانیش لـەدوا ئـەوەوە سـلاوی نوێـژیان دایەوە). {تاج/١، زنجیرە: ١٥٣، ژمارە: ٨٨٥}.

دانـەری بلـوغ المـرام مامۆسـتای عەسـقەلانی (رەحمـەتی خـودای لێ بـێ) دەفەرموێ: لەپەڕاوی (المعرفة)دا، کەهی فـەرموودەزانی گـەورە ئیبنـو مـەندەیـە، کە یەکێکە لەپێشەوایانی زانستی فەرموودە، نـاوی ئـەو پیـاوە دیـاری کـراوە، کـە لەم گێڕانەوەی ئێرەدا نادیارە، کە ئەو پیاوە کەخۆی لەرۆژی غەزای زاتولریقاعا نوێـژی ترسی لەپـشتی پێغەمبـەرەوە کـردووە، کـە ئـەو پیـاوە خـەوواتی بـاوکی صالح بووە.

٤٨٤- عنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) انَّهُ غَزَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قِبَلَ نَجْدٍ فَلَمَّا قَفَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) قَفَـلَ مَعَـهُ فَادْرَكَتْهُمْ الْقَائِلَةُ فِي وَادٍ كَثِيرِ الْعِضاهِ فَنَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَتَفَرَّقَ النَّاسُ فِي العضاه يَسْتَظِلُّونَ بالشَّجَرِ فَنَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) تَحْـتَ سَمُرَةٍ وَعَلَّقَ بِهَا سَيْفَهُ قال جابر: وَنِمْنَا نَوْمَةً فَاذا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) يَدْعُونَا فجئناهُ فَاذا عِنْدَهُ اعْرَابِيٌّ جالسٌ فَقَالَ: (انَّ هَذا اخْتَرَط عَلَـيَ سَـيْفِي وَانَـا نَـائِمٌ فَاسْتَيْقَظتُ وَهُوَ فِي يَدِهِ صَلْتًا فَقَالَ لي: مَنْ يَمْنَعُكَ مِنِّي؟ فَقُلْتُ: اللَّهُ ، فها هوَ جـالسٌ ، ثمَّ لَمْ يُعَاقِبْهُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ). (الحـديث: ٤١٣٥، اطرافـه في: ٢٩١٣، ٤١٣٤، ٤١٣٦):[٤٨٤]

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: لەغەزایـەك دا، لەخزمەتی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) بـەرەو نەجـد ڕۆیـشتین بۆ غەزا، لەقرچەی نیـوەڕۆدا لەشـوێنێکی درکـە زیـاوی دا بـۆ سـەرخەو شـکاندن لامان دا، خەڵکەکە بەناو شیوەکەدا بلاو بوونـەوەو چـوونە سـێبەری دارەکانـەوە،

[٤٨٤] تجرید/٤، ژمارە: ١٥٥٧ = ٤١٣٥، مسلم: ١٩٤٦، ١٩٤٧ شیحا.

پێغەمبەریش(دروودی خودای لێ بێ) لەبن دارێکا دابەزی و شمشێرەکەی پیادا هەڵواسی و خەوت، کاتێ خەبەری دەبێتەوە دەڕوانێ وا پیاوێ لەلایەتی، کە هاتووە حەزرەت هەستی پێ نەکردووە، جا ئێمەی بانگ کرد و فەرمووی: (ئەم پیاوە شمشێرەکەی منی هەڵکێشابوو، بەڕووتی گرتبووی بەدەستیەوە دەیگوت پێم: کێ ڕزگارت دەکات لەدەستم؟ منیش گوتم خودا. جا شمشێرەکەی نایەوە ناو کێلانەکەی، وا ئەوە تانێ بۆ خۆی دانیشتووە! ئیتر پێغەمبەریش-(دروودی خودای لێ بێ) تۆڵەی لەپیاوەکە نەسەندو هیچی لێی نەکرد). (تاج/٨ ل/١١٠ ف=١ ز=٣٩- شمشێر).

لێرەدا لەئاخرەکەیەوە دەفەرموێ: (هاوەڵانی پێغەمبەر (درودی خودا لە پێغەمبەرو رەزای خودا لەسەرجەمی هاوەڵان‌و یارانی بێ) هەرمشەیان لەکابرا کرد، جا قامەت کرا بۆ نوێژی نیوەڕۆ، یا بۆ نوێژی عەصر، جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەشکرەکەی خۆی کرد بەدوو دەستەوە، لەپێشا بەدەستەیەکیان دوورکاتی کرد، دەستەکەی تر لەمکاتەدا ئێشکیان دەگرت، ئەوانەی کەدوو رکاتیان بە کۆمەڵی یەکەم جار لەگەڵ پێغەمبەردا کرد، رۆیشتنەدواوەو بوون بەئێشکگرو دەستەکەی تر هاتن لەگەڵ پێغەمبەردا دوورکات نوێژیان بەکۆمەڵی کرد، لەسەر ئەم شێوەیە پێغەمبەر خۆی چوار رکاتی کرد، بەڵام هەردەستەیێ لەو دوو دەستەیە دوورکات نوێژیان کردو ئیتر نوێژەکە تەواوبوو).

## ٧- كتاب الجمعة
## نامەی هەینی

٤٨٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَيْنَمَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) يَخْطُبُ النَّاسَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، إِذْ دَخَلَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ، فَعَرَّضَ بِهِ عُمَرُ، فَقَالَ: مَا بَالُ رِجَالٍ يَتَأَخَّرُونَ بَعْدَ النِّدَاءِ؟! فَقَالَ عُثْمَانُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ مَا زِدْتُ حِينَ سَمِعْتُ النِّدَاءَ أَنْ تَوَضَّأْتُ ثُمَّ أَقْبَلْتُ. فَقَالَ عُمَرُ: وَالْوُضُوءَ أَيْضًا؟ أَلَمْ تَسْمَعُوا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ إِلَى الْجُمُعَةِ فَلْيَغْتَسِلْ ».
{الحديث/١٩٥٣ = ١٩٢٦ فم. بخاری/٨٨٢}:[٤٨٥]

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: ڕۆژی هـەینی بـوو، عومەری کوڕی خەطاب، لەسەر دوانگە وتاری نوێژی هەینی دەخوێندەوە، ئا لەو دەمەدا عوثمانی کوڕی عەففان خۆی کـرد بـە ژووردا‌و هـات بـۆ نوێـژ، عومـەر بـە ئاماژە ڕەخنەی لە عوثمان گرت، لەسەر ئەو دواکەوتنەو لەم بارەیەوە فەرمووی: (ئەوە بۆچیو لەبەر چی هەندێ پیاو گەل، لـە هـاتن بـۆ نوێـژی هـەینی درەنـگ دێن؟!). عوثمانیش وەڵامی دایـەوەو فـەرمووی: ئـەی فـەرمانڕەوای موسـوڵمانان! هەر لەگەڵ گوێم لە بانگ بوو، ئەوەندە فریاکـەوتم یەکسەر دەسـتنوێژم گـرت‌و بـەبێ درەنـگ هـاتم بـۆ مزگـەوت. عومـەریش فـەرمووی: (هـەی هـەی! هـەر بەوەندەیش وازت نەهێناوە کە زوو نەهاتووی، بەڵکوو ئەوەیشت خستۆتە پـاڵی، کـە خۆشـت نەشـۆردووەو تـەنها بـە دەسـتنوێژ قنیاتـت کـردووە؟! ئـەی نـەتان بیستووە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ دەچن بـۆ نوێژی هەینی خۆتان بشۆرن). {تاج/١، زنجیرە: ١٤٣، ژمارە: ٨٣٥}.

---

[٤٨٥] بخاری: ٨٨٢، مسلم: ١٩٥٢.

٤٨٦- عَنِ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ بَيْنَمَا هُوَ قَائِمٌ فِي الْخُطْبَةِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ إِذْ دَخَلَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ الأَوَّلِينَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ - صلى الله عليه وسلم - فَنَادَاهُ عُمَرُ أَيَّةُ سَاعَةٍ هَذِهِ قَالَ إِنِّي شُغِلْتُ فَلَمْ أَنْقَلِبْ إِلَى أَهْلِي حَتَّى سَمِعْتُ التَّأْذِينَ ، فَلَمْ أَزِدْ أَنْ تَوَضَّأْتُ . فَقَالَ وَالْوُضُوءُ أَيْضًا وَقَدْ عَلِمْتَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - كَانَ يَأْمُرُ بِالْغُسْلِ.[٤٨٦]

**واتاكەی لەژمارە (٤٨٥)دا بەتەواوی رابورد.**

**(١) باب: وجوب غسل الجمعة على كل بالغ من الرجال وبيان ما أمروا به**

٤٨٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الْغُسْلُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ). (الحديث ٨٥٨ ـ أطرافه في: ٨٧٩، ٨٨٠، ٨٩٥، ٢٦٦٥).[٤٨٧]

**ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ( خۆشۆردنی رۆژی هەینی پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێکی رەسیدە). (تاج/ ٤/٤١٩/١ ز-١٤٣ ژ-٨٣٦ = ش/د/ ن).**

## **راڤەو شیكردنەوە:**

**وشەی (پێویست: واجب) لەم فەرمووده پیرۆزەدا، مەبەستی واجبی بەرابەر سوننەت نییە. بەڵكوو مەبەست لێ ی جەخت کردنە لەسەرئەوە کەخۆشۆردنی رۆژی هەینی کارێکی زۆر گرنگی دامەزراوە.**

---

**[٤٨٦] اخرجه البخاری في (١٠) كتاب الأذن (١٦١) باب وضوء الصبيان ومتى يجب عليهم الغسل.**

**[٤٨٧] تجريد/١، ژماره: ٤٦٢ = ٨٥٨، مسلم: ٨٤٢ = ١٩٥٤، ١٩٥٧.**

٤٨٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللَّهُ عَنهُا) قَالَتْ: كَانَ النَّاسُ يَنْتَابُونَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ مِنْ مَنَازِلِهِمْ وَالْعَوَالِى،فَيَأْتُونَ فِي الْغُبَارِ يُصِيبُهُمْ الْغُبَارُ وَالْعَرَقُ، فَيَخْرُجُ مِنْهُمْ الْعَـرَقُ، فَـأَتَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنْسَانٌ مِنْهُمْ وَهُوَ عِنْدِي، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ:(لَوْ أَنَّكُمْ تَطَهَّرْتُمْ لِيَوْمِكُمْ هَذَا). (الحديث: ٩٠٢):[٤٨٨]

عائيـشەی هاوسـەری پێغەمبـەر(دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرموی: خـەڵكێكی زۆر بەسـەرە لەگونـدو جێگـەو دێهاتـەكانی دەوروبـەری مەدینـەوە، دەهاتن بۆ نوێژی هەینی، بەتایبـەتی لەوگوندانـەوە دەهـاتن كـە پێیـان دەگـوترا عەوالی، كەدەوری دوومیـل تـا شـەش میـل لـە مەدینـەوە دوور بـوون، لـەلای ڕۆژ هەڵاتیـەوە، كـەدەهاتن ڕێگەكـە خۆڵەپـەتانی بـوو، بەناوتـەپوتۆزا دەهـاتن، هـەم تـۆزاوی دەبـونو هـەم ئارەقیـان دەكـرد، بەهـەر حـاڵ بـەهۆی بـۆنی ئـەرەقو شتیواوە، كێشەیان بۆ هاونشین دروست دەكرد، جارێ پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) لـەماڵی مـن بـوو، خـۆم لەخزمەتیـدا بـووم، مرۆڤـێ لەمانـە، یاچـەند كەسێ لەمانە هاتن بۆ خزمەتی، لەسەر ئەم حاڵە، جاپێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی:(خۆزگە لەم ڕۆژەدا، كـەدەهاتن بـۆ نوێـژی جومعـە،خۆتـان بشۆردایەو، بەپێ ی توانا خۆتان پاكو خاوێن رابگرتایە).

٤٨٩- قَالَتْ عَائِشَةُ رَضيَ اللَّهُ عَنهَا: كَانَ النَّـاسُ مَهَنَـةَ أَنْفُـسِهِمْ وَكَـانُوا إِذا رَاحُوا إِلَى الْجُمُعَةِ، رَاحُوا فِي هَيْئَتِهِمْ، فَقِيلَ لَهُمْ: (لَوْ اغْتَـسَلْتُمْ). (الحـديث: ٩٠٣- طرفة في : ٢٠٧١).[٤٨٩]

دیـسان عائـشە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: جـاران موسـوڵمانان خۆیـان خزمـەتی خۆیانیـان دەكـرد،زوربـەیان خۆیـان نۆكـەری خۆیـان بـوون،

---

[٤٨٨] تجريد/١، ژمارە: ٤٧٦ = ٩٠٢، مسلم: ٨٤٧ = ١٩٥٥ شیحا.

[٤٨٩] تجريد/١، ژمارە: ٤٧٦ — (مكرر) = ٩٠٣، بخاری مسلم: ١٩٥٦ شیحا.

رەنجبەرو خزمەتكاريان نەبوو، جاكە لەسەرەتاى تاقى ئێوارەدا دەچوون بۆ نوێژى هەينى، لەسەر كارو فەرمانەكانيانەوە دەرۆيشتن بۆ مزگەوت، هەربەو شێوەيەو بەجلو بەرگى ئيشو پيشەكانيانەوە ئامادەى نوێژەكە دەبوون. بۆيە پێغەمبەر(دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى پێيان: (ئەگەر خۆتان پاك بشۆردايە زۆر شتى چاك بوو!).

## (٢) باب: الطيب والسواك يوم الجمعة

## بەكارهێنانى بۆنى خۆشو سيواك كردن لەرۆژى هەينىدا

٤٩٠- عن أَبِي سَعِيدٍ الخدري (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ أَشْهَدُ عَلَى رَسُولِ اللّٰهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الْغُسْلُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ وَأَنْ يَسْتَنَّ وَأَنْ يَمَسَّ طيبًا إِنْ وَجَدَ)(الحديث: ٨٨٠ في فتح البارى).[٤٩٠]

ئەبو سەعيدى خودرى (ڕەزاى خواى لێ بێ) فەرموى: شايەتى دەدەم كە پێغەمبەرى خودا (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرموى: (خۆشۆردن (غوسڵ) ى ڕۆژى هەينى پێويست (واجب)ە، لەسەر هەموو مووسوڵمانێكى رەسيدە هەروا سيواك كردنيش پێويستە لەسەر هەموو موسوڵمانێكى رەسيدە، لەڕۆژى هەينى دا، هەروەها خۆبۆنخۆش كردنيش، بەلاّم بە مەرجێ بۆنى خۆشى دەست كەوێ).

٤٩١- عَنْ طَاوُسٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) أَنَّهُ ذَكَرَ قَوْلَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فِي الْغُسْلِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَقُلْتُ لاِبْنِ عَبَّاسٍ أَيَمَسُّ طِيبًا أَوْ دُهْنًا إِنْ كَانَ عِنْدَ أَهْلِهِ فَقَالَ لاَ أَعْلَمُهُ.[٤٩١]

---

[٤٩٠] تجريد/١، ژمارە: ٤٦٦ = ٨٨٠، مسلم: ٨٤٦ = ١٩٥٧.

[٤٩١] بخارى: ٨٨٥، مسلم: ١٩٥٨ شيحا، شەرحى بلوغ المرام ژمارە: ٨٢٧، بەرگى/٢، لاپەڕە: ٣١١.

طاووس (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئیبنو عەبباس (رەزای خودا لەخۆی و لەباوکی بێ) باسی ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری دەکرد، کە سەبارەت بەخۆشۆردنی رۆژی هەینی یە، منیش عەرزیمکرد: ئایا لەچەوری خێزانەکەی، یا لەبۆنی خۆشی ژنەکەی بۆ هەینی بەکاربهێنێ یانا؟ فەرمووی: نازانم.

**روونکردنەوە:**

یەکێ تر لەفەقێو شاگردە ناودارەکانی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس، طاووسی کوڕی کیسانە، بەرەچەز فارسە، گێڕانەوەی لەهەر چوار عەبدوڵڵاکانەوە ئەنجام داوە، هەروا لە ئەبو هورەیرەو عائیشەو زەیدی کوڕی ثابیتو زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە، لەچینی دووەمی موسوڵمانانە، کەپێیان دەگوترێ: پەیڕەوان (تابعین).

بەخزمەت پەنجا کەس لەهاوەڵانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) گەیشتووە، ئیبنو عەبباس دەیفەرموو: باوەڕم وایە کە طاووس بەهەشتیە.

ئیبنو حیببان دەیفەرموو: (طاووس یەکێکە لە خواناسەگەورەکانی خەڵکی یەمەن و یەکێکە لەگەورە پیاوانی پەیڕەوان (تابعین) چل حەجی کردووە، نزاو پاڕانەوەی زۆر گیرا بوو، ئیبنو عویەینە دەفەرموێ: ئەم سێ کەسە دوورەپارێزترین کەس بوون لەدەسەڵات، ئەبو زەڕ لەسەردەمی خۆیدا، ئەوری لەسەردەمی خۆیدا، طاووس لەسەردەمی خۆیدا. لە مەککە مردووە. عەشاماتو جەماوەرێکی زۆر شوێن تەرمەکەی کەوتن، چەند بۆچوونێ سەبارەت بەمەرگی هەیە، لەدەوروبەری ساڵی سەدو شەشی کۆچیدا مردووە. {بڕوانە: تجریدی بوخاری بەرگی یەکەم فەرمووده ژمارە/٨٣ = ٩٦ فتح الباری شەرحی صەحیحی

بوخاری + پوختەی موسلیم ژمارە: ٦٨١، بۆ ژیاننامەی عەطای کوڕی رەباح کە ئەویش فەقێو شاگردی ئیبنو عەبباس بووە. (رەزاو رەحمەتی خودا لەهەموویان بێ).

٤٩٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْه) قَال:قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّٰم)-(نَحْنُ الْآخِرُونَ السَّابِقُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِنَا، وَأُوتِينَاهُ مِنْ بَعْدِهِمْ ، فَهَذا الْيَوْمُ الَّذي اخْتَلَفُوا فِيهِ، فَهَدَانَا اللّٰهُ، فَغَدًا لِلْيَهُودِ، وَبَعْدَ غَدٍ لِلنَّصَارَى) فَسَكَتَ، ثمَّ قَالَ: (حَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ أَنْ يَغْتَسِلَ فِي كُلِّ سَبْعَةِ أَيَّامٍ، يَوْماً، يَغْسِلُ فِيهِ رَأْسَهُ وَجَسَدَهُ). (الحديث ٨٩٦ و٨٩٧،الحديث ٨٩٧طرفاه في :٨٩٨، ٣٤٨٧).[٤٩٢]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەری خودام ژنەوت دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئێمەی گەلی ئیسلام ،هەرچەند لەهاتن بۆجیهان کەوتوینەتە دواوە، بەلاّم لەقیامەتدا لەپایەو پلەو، لەمەڵبەندەکانا لەپێشی پێشەوەمین،یەکەم گەلین کەحەشر دەکرێین،کەمەحکەمەدەکرێین، کەدەچینە بەهەشت، ئەوەندە هەیە کەئەوان لەپێش ئێمەوە نامەی خودایی یان بۆهاتووە، وەئێمە لەپاش ئەوانەوە نامەی خوداییمان بۆهاتووە، لەپاش ئەمەیش ئەمە ئەوڕۆژەیانە کەخودا دایناب‌وو لەسەریان، کەلەم ڕۆژی هەینی یەدا بەجوانی پەرستشی خودا بکەن، کەچی ئەوان لێیان گۆڕاو، سەرو ڕۆژی تریان لەحەفتەدا بۆ خۆیان هەڵبـژارد، بەلاّم لەسایەی خودای گەورەوە ئێمە ڕێمان پێی بردو دۆزیمانەوەو ڕێزو قەدری ئەم ڕۆژە پیرۆزە دەگرین‌و کردومانە بەجەژن، خەڵکەکەی تریش وان لەدوای

---

[٤٩٢] تجرید/١، ژمارە: ٤٧٥ = ٨٩٦، بوخاری. مسلم: ٨٤٩ - ١٩٦٠ شیحا.

ئێمەوە: ئەوەتا سبەینێ کەشەممەیە، ڕۆژی جولەکەیەو، دووسبەینێش کە یەك شەممەیە ڕۆژی گاورانە).

ئەوجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) خامۆش بوو، لەپاشا فەرمووی : کەواتە مافی خودای گەورەیە لە سەر هەموو موسوڵمانێ، کە هەموو حەفتەیێ، جارێ سەر ولەش ولاری خۆی پاك بشۆرێ).

٤٩٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَنْ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ غُسْلَ الْجَنَابَةِ ثمَّ رَاحَ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَدَنَةً وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثانِيَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَقَرَةً وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثالِثةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ كَبْشًا أَقْرَنَ وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الرَّابِعَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ دَجَاجَةً وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الْخَامِسَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَيْضةً فَإِذا خَرَجَ الْإِمَامُ حَضرَتْ الْمَلَائِكَةُ يَسْتَمِعُونَ الذكْرَ) (الحديث رقم:٨٨١ في فتح البارى شرح صحيح البخارى للمسقلاني- عليه الرحمة والرضوان). [٤٩٣]

ئەبو هوریرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ڕۆژی هەینی هەر موسڵمانێ خۆی بشۆرێ (لەچەشنی خۆشۆردنی لەش پیسی دەرکردن) ئەوجا لەکاتژێری یەکەما بڕوا بۆنوێژی هەینیو، لە مزگەوت چاوەڕوانی نوێژی هەینی بکا، یاخود لەوێ خۆی خەریك بکات بەتاعەتو زیکرو یادی خوداوە، وەك قورئان خوێندنو سەلاوات دان لەسەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تاکاتی ووتارو نوێژەکەدێ،ئەوەی ئەمە بکات وەك ووشترێك بکا بەخێروایە، وەئەوەی لە کاژێری دووەما بچێ وەك ڕەشە وولاخێ بکا بەخێروایە، وە ئەوەی لەکاژێری سێیەمدا بچێ وەك بەرانێکی شاخ داربکا بەخێروایە، وەئەوەی لەکاتژێری چوارەمدا بچێ وەك مریشکێ بکا

---

[٤٩٣] تجرید/١، ژمارە: ٤٦٧ = ٨٨١، مسلم: ٨٥٠ = ١٩٦١ شیحا.

بـــەخێر وایـــە،وەئـــەوەی لـــەکاژێری پێنجەمـــدا بـــچێ وەك هێلکەیـــەك بکـــات بەخێروایە، کاتێك کە پێشنوێژیش دەرچوو، کەبچێ بۆسـەر مینبـەر، بۆووتـاری هەینی خوێندنەوە، ئیتر فریشتەکانیش دەچن گوێ لەووتارو خوتبە کـەدەگرن‌و ئـــەوەی کەلـــەوەو دوا دێ، نـــاوی لەدەفتـــەری ئەوانـــدا نانوســـرێ، مەبەســـت ئەودەفتەرەیانـــە کەتایبەتـــە بۆنوســـینی ئەوکەســـانە کەلەیـــەکێ لـــەم پێـــنج کاژێرانەدا دێن بۆجومعە).

## (٣) باب: في الإنصات في يوم الجمعة في الخطبة
## باسی گوێ گرتن بەدڵ لەوتاری هەینی

٤٩٤- عَنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ (رَضِـي اللهُ عَنْـهُ) أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ أَنْصِتْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَالإِمَـامُ يَخْطُـبُ فَقَـدْ لَغَـوْتَ » .
{الحديث/١٩٦٢ = ١٩٣٦. تجريد/١، رقم: ٤٩٢ = ٩٣٤}:[٤٩٤]

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (رۆژی هـەینی لەوکاتـەدا کـە پـێش نوێـژ وتـار دەخوێنێتـەوە، ئەگـەر بـە هاونـشینی خـۆت، لـە ریـزی نوێژەکـەدا بڵێیـت: وس، بێدەنگبـە، ئـەوە خۆشـت وەك ئـەو، قـسەی بێجـا دەکـەی! کـە شـتی وا پاداشـی نوێژەکە پووچ دەکاتەوە). {تاج/١، ژمارە: ٨٦٨} .

---

[٤٩٤] تجرید/١، ژمارە: ٤٩٢ - ٩٣٤ بخاری، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٤١٩ - ١٩٦٢ شیحا.

## (٤) باب: في الساعة التي في يوم الجمعة
## كاژێره تایبەتییەکەی ڕۆژی هەینی

٤٩٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: قَـالَ أَبُـو الْقَاسِمِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ فِي الْجُمُعَةِ لَسَاعَةً لاَ يُوَافِقُهَا عَبْـدٌ مُـسْلِمٌ قَـائِمٌ يُـصَلِّي يَـسْأَلُ اللَّـهَ خَيْراً إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ». وَقَـالَ بِيَـدِهِ يُقَلِّلُهَـا، يُزَهِّـدُهَا». {الحـديث/١٩٦٧ = ١٩٤١ فـم. تجريد/١/٤٦٨، رقم: ٤٩٣ = ٩٣٥، ٥٢٩٤، ٦٤٠٠}:[٤٩٥]

ئـەبو هـورەیرە (خـوای لێ ڕازی بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر، کـە کەسـناو (کونیـە)ی ئـەبول قاسمـە (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (لـە ڕۆژی هەینیدا کاژێرێکی تایبەتی واتیادا، هەر بەندەیـەکی موسـوڵمان، نێربـێ یـا مـێ، لەوکاتەدا ڕاوەستابێ نوێژ بکا، یا خود بە کوڵو بـە دڵ لـەخودا بپاڕێتـەوە، ئـیتر لەو دەمەدا داوای هەرشتێ لە خێـری دیـنو دونیـا لـە خـودا بکا، خـودا بـێ دڵـی ناکاو ئەو شـتەی پـێ دەدا). فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بەدەستی ئاماژەی کرد کە ئـەو مـاوەی نـزا گیرابوونـە گـەلێ کەمـە، هـەتا خەڵـك خۆیانی بـۆ ئامـادە بکـەنو لەکیـسی نـەدەن. {تـاج/١، زنجیرە: ١٥٠، ژمـارە: ٨٧٦ + ژمارە: ٨٧٩ + ٨١٩ + ٩٦٧}.

---

[٤٩٥] تجریـد/١، ژمـارە: ٤٩٣ = ٩٣٥، مختـصر صـحیح مـسلم/١، ژمـارە: ٤٠١، مـسلم: ٨٥٢ = ١٩٦٦ شیحا.

### (٦) باب: هداية هذه الأمة ليوم الجمعة

### خودا بەرەحمەتی خۆی نەتەوەی ئیسلامی شارەزای ئەم ڕۆژی هەینی‌یە کردووە

٤٩٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «نَحْنُ الآخِرُونَ الأَوَّلُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَنَحْنُ أَوَّلُ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ، بَيْدَ أَنَّهُمْ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِنَا، وَأُوتِينَاهُ مِنْ بَعْدِهِمْ، فَاخْتَلَفُوا، فَهَدَانَا اللَّهُ لِمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ مِنَ الْحَقِّ، فَهَذَا يَوْمُهُمُ الَّذِي اخْتَلَفُوا فِيهِ هَدَانَا اللَّهُ لَهُ، قَالَ: يَوْمُ الْجُمُعَةِ، فَالْيَوْمَ لَنَا وَغَدًا لِلْيَهُودِ وَبَعْدَ غَدٍ لِلنَّصَارَى». {الحديث/١٩٧٧ = ١٩٥١. تجريد/١، لاپەڕە: ٤٤٠، رقم: ٤٦٥ = ٨٧٦}:[٤٩٦]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئێمەی گەلی ئیسلام هەرچەند لە هاتن بۆ جیهان کەوتووینە دواوە، بەڵام لە قیامەتدا، لە پایەو پلەو، لە مەڵبەندەکانا، لەپێشی پێشەوەمین‌و لەهەرە پێشەوەمین، ئێمەی نەتەوەی ئیسلام یەکەم نەتەوەمین کە لەپێش هەموو نەتەوەکانی تردا دەچینە بەهەشت، بەڵام ئەوەندە هەیە کە ئەوان لەپێش ئێمەوە نامەی خوداییان بۆ هاتووەو، ئێمە لەپاش ئەوانەوە نامەی خوداییمان بۆ هاتووە کە قورئانی پیرۆزە، لەپاش ئەمەیش ئەمە ئەو ڕۆژەیانە کە خودا داینابوو لەسەریان، کە لەم ڕۆژی هەینییەدا، بەجوانی خودا پەرستی بکەن، کەچی ئەوان لێیان گۆڕاوە، سەرو ڕۆژی تریان بۆ خۆیان لە حەفتەدا هەڵبژاردووە، بەڵام لە سایەی خودای گەورەوە ئێمە ڕێمان پێی بردو دۆزیمانەوەو ڕێزو قەدری ئەم ڕۆژە پیرۆزەمان دەگرین‌و کردوومانە بە جەژن، خەڵکەکەی تریش وان لەدوای ئێمەوە: ئەوەتا سبەینێ کە شەممەیەو وا لەدوای

---

[٤٩٦] تجريد/١، ژمارە: ٤٦٥ - ٨٧٦، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٣٩٩ - ٨٥٥ = ١٩٧٥، ١٩٧٧، ١٩٧٨.

هەینییەوە رۆژی جوولەکەیەو، دوو سبەینێش کە یەك شەممەیە رۆژی گاورانە).
{تاج/١، زنجیرە:١٣٩ ژ-٨٢٠، ٨٢١}. {بۆ باسەکانی رۆژی هەینی بڕوانە: تاج لە ژمارە: ٨١٩ وە هەتا ژمارە: ٨٨٣}.

## (٩) باب: صلاة الجمعة حين تزول الشمس
## کاتی داهاتنی نوێژی هەینی لەپاش لادانی خۆرە بەدیمەن لەناوەڕاستی ئاسمان

٤٩٧- وَعَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {مَا كُنَّا نَقِيلُ وَلَا نَتَغَدَّى إِلَّا بَعْدَ اَلْجُمُعَةِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ. {بوخاری/٩٣٩. شیحا/١٩٨٨}:[٤٩٧]

سەهلی کوڕی سەعد (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا نوێژی هەینیمان نەکردایە، نە سەرخەوی پێش نیوەڕۆمان دەکردو نەنانی بەرچاییمان دەخوارد).

### روونکردنەوە:

١- نەوەوی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (ئەم فەرموودەیە بەلگەیە لەسەرئەوە کە نوێژی هەینی لەسەرەتای کاتەوە بکرێ خێرترە، مالیكو ئەبو حەنیفەو شافیعیو جەماوەری زاناکان، لە هاوەڵانو پەیڕەوانو زانایانی پاش ئەوانیش دەفەرموون: سەرەتای کاتی نوێژی هەینی پاش لادانی خۆرە بەدیمەن لەناوەڕاستی ئاسمان، کە لەزاراوی شەرعدا بەمە دەگوترێ (لەپاش زەوال) وەئەم فەرموودەی سەهلە ئاوا تەئویل دەکەن: کەتەنیا لەرۆژی هەینیدا ئەم دووشتە دوادەخەن بۆ پاش نوێژی هەینی. قسەی نەوەوی تەواو.

---

[٤٩٧] بوخاری: ٩٣٩، مسلم ترقیم شیحا: ١٩٨٨، شەرحی بلوغ المرام/١، ژمارە: ٤٧١.

٢- سەهل خۆی‌و سەعدی باوکی لەهاوەڵانی پێغەمبەرن، سەهل لەگەورە پیاوانی هاوەڵانە، لەپێشا ناوی (حەزەن) بووە، واتە: هەڵەتی سەخت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش ئیسلام بوون ناوەکەی گۆڕی‌و ناوی نا (سەهل) واتە: خۆش‌و ئاسان‌و دەشت.

سەهل ئەنصارییە، سەدو سیی‌و هەشت فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە (٣٩) سیی‌و نۆ فەرموودەی لەصەحیحی بوخاریدا هەیە، یان (٤١) چل‌و یەك فەرموودە، زیاتر لەسەد ساڵ ژیاوە، لەنەوەدو یەکی کۆچیدا لەمەدینە بەمەرگی خودا مردووە، کاتێ پێغەمبەر مردووە، پازدە ساڵ بووە، ئیمامی زوهری فەقێی بووە، یەکێ بووە لەو هاوڕێ نازدارانەی پێغەمبەر، کە حەججاجی ئەقەفی گەڕی پێ دەکردن‌و ئازاری دەدان. {بڕوانە: پوختەی بوخاری = تجریدی بوخاری/١٩٢/١، ژمارە: ١٧٤ + پوختەی موسلیم ژمارە: ٢٥٩}.

٣- سەعدی کوڕی مالیکی کوڕی خالید، باوکی سەهلی کوڕی سەعدی ئەلساعیدییە، خۆی ئامادەکرد کە لەخزمەتی پێغەمبەردا بچێ بۆ غەزای بەدر، لەڕێ نەخۆش دەکەوێ‌و دەمرێ، راسپێرینامەکەی لەپاشکۆی کۆپانی وڵاخەکەی دەنووسێ، رادەسپێرێ: کە وڵاخەکەی بەکۆپانەکەیەوە بۆ پێغەمبەر بێ (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەتاڵانی بەدر پشکی بۆی داناو، راشیگەیاند کە پاداشی تەواوی هاوبەشکەرانی غەزای بەدری بۆ هەیە لەلای خودا، دیارە کە ئەو پشکەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داینا بۆ سەعد، درا بە کەلەپووربەرەکانی.

٤٩٨- وَعَنْ سَلَمَةَ بْنِ اَلْأَكْوَعِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كُنَّا نُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَوْمَ اَلْجُمُعَةَ، ثُمَّ نَنْصَرِفُ وَلَيْسَ لِلْحِيطَانِ ظِلٌّ نَسْتَظِلُّ بِهِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ. وَفِي لَفْظٍ لِمُسْلِمٍ: {كُنَّا نَجْمَعُ مَعَهُ إِذَا زَالَتِ اَلشَّمْسُ،

ثُمَّ نَرْجِعُ، نَتَتَبَّعُ اَلْفَيْءَ} . {بوخاری/٤١٦٨ . پوختەی موسلیم/٤٠٧ = ١٩٨٩ شیحا = ٨١٦}:[٤٩٨]

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخزمەتی پێغەمبەردا، نوێژی هەینیمان لەپشتیەوە بەکۆمەڵی دەکرد، کە دەگەڕاینەوە بۆماڵەوە هێشتا دیوارەکان ئەوەندە سێبەریان نەبوو، کە لەسێبەری دیوارەکانەوە بڕۆین!). ئەمە گفتەی بوخارییە، لەپوختەی موسلیمیشدا، ژمارە: ٤٠٧ ئاوایە:

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستوورمان وابوو، ئەوکاتە نوێژی هەینیمان دەکرد، کەخۆر بەدیمەن لەناوەڕاستی ئاسمان لادەدا، کاتێ لەپاش تەواوبوونی نوێژی هەینی دەگەڕاینەوە بۆ ماڵەوە، بەحاڵ سێبەر هەبوو، بەزۆر خۆمان تێ دەترنجاند، سێبەرەکە ئەوەندە نەبوو، کە بەئاسایی پیادا بڕۆین). {تاج/١، زنجیرە: ١٤٦، ژمارە: ٨٤٢} .

**ڕوونکردنەوە:**

١- کاتی نوێژی هەینی ڕێك کاتی نوێژی نیوەڕۆیە، کاتێ نوێژی نیوەڕۆ دەبێ، نوێژی هەینیش دەبێ، وەهەتا نوێژی نیوەڕۆیش بمێنێ، نوێژی هەینیش دەمێنێ.

---

[٤٩٨] بخاری: ٤١٦٨، پوختەی موسلیم/١، ژمارە: ٤٠٧ = ١٩٨٩ = ٨١٦، محمد فؤاد عبدالباقی (رحمه الله). (سبحان الله! هەر لەخۆمەوە ئەم پیاوەم خۆش دەوێ. واتە: (محمد فؤاد عبدالباقی) هەزار هەزار ڕەحمەتی خودای گەورەو سەروەری لێ بێ – ئامین). (وەرگێڕ).

## (١٠) باب: ذكر الخطبتين قبل الصلاة وما فيهما من الجلسة

## باسى دوو وتارەكەى هەينىو دانيشتنى نێوانيان، كە دەكەونە پێش نوێژەكەوە

٤٩٩- عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ قَائِمًا، ثمَّ يَقْعُدُ, ثمَّ يَقُومُ، كَمَا تَفْعَلُونَ الْآنَ. (الحديث: ٩٢٠-طرفه في: ٩٢٨).[٤٩٩]

عەبدوڵلاى كوڕى عومەر (ڕەزاى خودايان لێ بێ) فەرمووى: جاران پێغەمبەر(دروودى خوداى لەسەر بێ) كاتێ نوێژى هەينى دەبوو لەپێش نوێژى هەينى دا، دوو وتارى ئاينى دەخوێندەوە، ڕێك وەك ئەوەى ئێستا ئێوە دەيكەن، لەپێشدا وتارى يەكەمى دەدا بەپێوە، ئەوجادادەنيشت، وچانێكى كەمى دەگرت بەقەد ئەندازەى خوێندنى سورەتى (قل هو الله) ئەوجا هەڵ دەسايەوە بەپێوە وتارى دووهەمى دەخوێندەوە.

## (١١) باب: في قوله تعالى {وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِماً}

٥٠٠- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِىَ اللَّهُ عنهما): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَخْطُبُ قَائِمًا يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَجَاءَتْ عِيرٌ مِنَ الشَّامِ فَانْفَتَلَ النَّاسُ إِلَيْهَا، حَتَّى لَمْ يَبْقَ إِلاَّ اثْنَا عَشَرَ رَجُلاً، فَأُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ الَّتِى فِى الْجُمُعَةِ: (وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انْفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا) الآيَةَ. {الحديث/١٩٩٤ = ١٩٦٨. تجريد/١، لاپەڕە: ٤٦٨ = ٩٣٦، ٢٠٥٨، ٢٠٦٤، ٤٨٩٩}:[٥٠٠]

---

[٤٩٩] تجريد/١، ژمارە: ٤٨٦ = ٩٢٠، ٩٢٨، مسلم (محمد فؤاد عبدالباقى): ٨٦١ = مسلم تخريج شيحا: ١٩٩١.

[٥٠٠] تجريد/١، ژمارە: ٤٩٤ = ٩٣٦، بخارى/مسلم: ٨٦٣ = ١٩٩٤ = مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٤٢١ = ١٩٩٤.

جـابیری کـوڕی عەبـدوڵلا (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: لـە ڕۆژی هەینیدا، لە خزمەت پێغەمبەردا بووین، خەریکبوو وتاری هەینی دەخوێنـدەوە، لەوکاتـەدا لـە شـامەوە، کاروانـێ هـات، دەهـۆڵو زوڕنـا لـە پێـشیەوە بـوو، هـەتا مەردووم بزانن کەوا کاروانەکە گەیشتە جێ، ئیتر خەڵـکەکە وتارەکـەیان بـەجێ هێشتو لـە مزگـەوت دەرچـوونو دەرپـەڕین بـۆلای کاروانەکـە بـۆ شـت کـڕینو سەوداو مامەڵە، تەنها دوازدە کەس لە خزمـەتی پێغەمبـەردا مانـەوە، جا خـودا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: (وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا – جومعة/٦٢/١١). واتە: ئەوانەی لە دەوری تۆ بوون، کاتێ چاویان بە بازرگانیو مامەڵەو سەوداو ئەوکارە بێهوودەیە کەوت، کە برێتی بوو لەو دەهۆڵو زوڕنایە، کـە لـەکاتی واداو لـە زۆر کـاتی تریـشدا ئـادەمیزاد خـەریك دەکـاو، لـە بەنـدەیی کردنی ساخ بۆ خودای مەزن، دووری دەخاتەوە، ئەوانە لەم کاتـەدا دەوری تۆیـان چۆڵ کردو بڵاوەیان لێ کردو چوون بۆلای ئـەو بـەزمو ڕەزمـە. {بڕوانـە: تـاج/٤، زنجیرە: ٤٥، ژمارە: ٤١٦٨. چاپی چوارەم}.

## (١٣) باب: تخفيف الصلاة والخطبة
## نوێژی سووکەڵەو وتاری سووکەڵە

٥٠١– عَنْ يَعْلَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْرَأُ عَلَى الْمِنْبَرِ وَنَادَوْا يَا مَالِكُ قَالَ سُفْيَانُ فِي قِرَاءَةِ عَبْدِ اللَّهِ وَنَادَوْا يَا مَالِ) (الحديث ٣٢٣٠، طرفاهُ في: ٣٢٦٦، ٤:١٩) [٥٠١]

---

[٥٠١] تجريد/٣، ژمارە: ١٣٠٢ = ٣٢٣٠، ٣٢٦٦، ٤٨١٩، بخاری، مسلم ترقيم محمد فؤاد عبدالباقی: ٨٧١ = ٢٠٠٨، ترقيم شيحا.

پەعلا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پێغەمبەرم ژنەوت لەسەر دوانگە (لەسەر مینبەر) ئەم ئایەتەی ئاوا خوێند: ﴿وَنَادَوا يامالِ﴾.

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

قیرائەت واتە: شێوەی خوێندن‌و خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز —بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم بابەتە توێژینەوەیەکی دوورو درێژمان دەوێ، کە ئێرە مەودای ئەوەی نییە، کورت‌و پوخت دەڵێین: هەندی وشە لەقورئانی پیرۆز بەچەند شێوەیێ دەخوێندرێتەوە، هەروا هەنێ ڕستەو هەندێ ئایەت، بەپێی شێوە خوێندنەکانی، وشەیێ زیادی هەیە یا کەمی هەیە، وەئەمە هونەرێکی بەرزە لەزانستەکانی قیرائات دا بەدوورو درێژی قسەی لێ کراوە، چەند نموونەیێ لەم خوێندنەوانە بەوێنە:

**یەکەم:** (مالك) لەم ئایەتەدا بەم چەند شێوەیە خوێندراوەتەوە:

أ- یامالِك.

ب - (یا مالِ) بەبێ کاف لەسەر شێوەی موناداى مورەخەم، بەکەسرەی لام.

ج- (یامالُ) بەبێ کاف لەسەر شێوەی موناداى مورەخەم، کە مامەڵەی موناداى موفرەدی مەعریفەی بۆ کرابێ، واتە: مەبنی بێت لەسەر ضمەی دواپیتی کە لامەکەیەتی ئاوا: (یامالُ = یامالو).

**دووەم:** (مالك یوم الدّین) (ملك یوم الدین) یش خوێندراوەتەوە.

**ڕوونکردنەوە:**

**یـەعلای کـوڕی ئومەییـەی تـەمیمی (ڕەزای خـودای لێ بـێ) کەپێـشی دەگوترێ: یەعلای کوڕی مونیە، بەناوی دایکیـەوە، هاوەڵی پێغەمبـەرە، لـەڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا ئیسلام بوو، پیاوێکی دەوڵەمەندی زۆر سەخی بوو، ئامادەی غـەزای تـائیفـو حونـەینو تـەبووك بـووە، لەخزمـەتی پێغەمبـەردا، نـۆزدە فـەرموودەی هەیـە، لەموفقەدیمـەی فەتحولباریـدا دەفـەرموێ: سـێ فـەرموودەی لەبوخاری پیرۆزدا هەیە، یەکێکیان کە فەرموودەی ژمارە: (٦٧٧)ی موختەصەری صەحیحی موسلیمە، کەوا لەبەرگی دوودا. یەکێ لەڕاویـە ناودارەکـانی صـەفوانی کوڕیەتی.**

**یەعلا پیاوێکی ناوداری لێهاتوو بـوو، لەبـەر ئـەوە لـەکاتی فـەرمانڕەوایی هەرچوار جێنشینەکانی پێغەمبەردا، ڕۆڵی گەورەی بینیوە، ئەبوبەکری صـەدیق کـردی بەکاربەدەسـتی سـەر حـەلوان، لـەکاتی جـەنگی ریـددەدا، لەسـەردەمی عومـەردا بـوو بەکارمەنـد لەسـەر هەنـدی لـەوڵاتی یەمـەن، لەسـەردەمی عوسمانیشدا بوو بەکاربەدەستی عوسمان لەسـەر صـەنعاء، ئەوسـاڵەی کـەعوسمان شەهید کرا، هات بۆ حـەج، زۆر لـەدژی بکوژانی عوسمـان بـوو، وەخـەباتی زۆری لەدژیان گێڕا، لەگەڵ عائیشەدا، ئامادەی جەنگی ئەلجەمەل بـوو، ئـەو حوشـترەی کە لەو جەنگەدا، لەژێر عائیشەدا بوو، کە شەڕەکە بەناوی ئەو حوشـترەوە نـاوی دەرکرد، ناوی عەسکەر بوو، یەعلا بەدووسەد لیرە کڕیو بەخـشی بـە حـەزرەتی دایکە عائیشە. لەم ڕووداوە دڵتەزێنەدا سواری بوو!**

**لەپاشا لەگەڵ پێشەوا عەلی دا، ئامادەی شـەڕی صـەفین بـوو، لـەم شـەڕەدا لەسـاڵی (٢٨)ی کۆچیدا شـەهید کـرا (ڕەزاو ڕەحمـەتی خـودای گـەورەی لێ بـێ). {بڕوانە: پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٦٧٧} .**

## (١٤) باب: التحية والإمام يخطب

## لەکاتی وتاری هەینیدا، وا باشە هاتوو نوێژی دیاری مزگەوت بکات

٥٠٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَال: جَاءَ رَجُلٌ وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ النَّاسَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَقَالَ: (أَصَلَيتَ يا فلان؟) قَال: لا، قَالَ: (قُمْ فَارْكَعْ رَكْعَتَيْنِ). (الحديث: ٩٣٠-طرفاه في: ١١٦٦، ٩٣١).[502]

جابری کوڕی عەبدڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی هەینی بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتاری نوێژی هەینی بۆ مەردومەکە دەخوێندەوە، لەوکاتەدا پیاوێ هاتە ژورەوە ناوی (سولەیك) بوو پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئەی سولەیك! ئایا نوێژی دیاری مزگەوتت کرد، کەهاتیتە ژوورەوە؟) سولەیك فەرمووی: (نەء) پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەههەڵسە دوو رکات نوێژی سووکەڵە بکە) ئەویش هەڵسا دوو رکات نوێژی کرد.

### ڕاڤەو شیکردنەوە:

پێشەوا عەسقەلانی (ڕەزای خوای لێ بێ) لەم شوێنەدا، بەدورو درێژی لەم بابەتە دەدوێ، وەپتر لەپازدە بەڵگەو بۆچونی ئەو زانایانە پووچ دەکاتەوە، کەدەڵێتن: هاتوو (داخل) لەکاتی خوتبەی نوێژی هەینی دا دروست نییە کەنوێژی دیاری مزگەوت بکا. پاڵفتەی فەرمایشتەکەی شێخی عەسقەلانی لەفەتح دا ئەمەیە: (ئەم داستانەی سولەیك (ڕەزای خوای لێ بێ) کەبەچەندین شێوەی جۆراو جۆر، لەلایەن فەرمووده زانە گەورەکانەوە گێڕدراوەتەوە، دروستترین بەڵگەیە لەسەر ئەوە کەلەم کاتەدا بۆ هاتو دوو رکات نوێژی سڵاوی

[502] تجرید/١، ژمارە: ٤٩٠ = ٩٣٠، ١١٦٣، ٩٣١، بخاری. مسلم: ٨٧٥ - ٢٠١٥ شیحا.

مزگەوت سوننەتە. لێرەدا بەیادی ئەو هەمکە شاپیاوە مەزنانەوە، لە پێشینانە باشەکانمان، کەئەم هەموو شاکارە جوان جوانانەیان لەپاش خۆیان بە دیاریو یادگار بۆ نەتەوەی ئیسلام بەجێ هێشتووە، بەتایبەت لەبابەتی تەفسیرو سونەتو فیقهدا، لێرەدا بەو پەڕی پەرۆشەوە ئەمەتان عەرز دەکەم.

داخەکەم ئێستا لەولاتی ئێمەدا، دوو بەلای گەورەی دلتەزێن پەیدابوون، کەبە بیرەوەری من ئەمە نەبوو، ئەهلی دینو ئایین دۆستان، لەدێرین داهەموو یەك دلْویەك دەنگ بوون، بەلام ئێستا چینی دێرین بەسەرۆکایەتی مەلاکان و چینی نوێ بەسەرۆکایەتی لایەنەکان دووبەرەکییەکی گەورەیان دروست کردووە، لەبەر هێرش بردنە سەریەك نایان پەرژێتە سەردوژمنە راستەقینەکانی ئیسلام.

**یەکەم**: مەلای نەزانی نارۆشنبیری گوێلە مشتی پارتە عیلمانییەکان پەیدا بوون، لەباتی موتالای توحفەی ئیبنوحەجەرو وەضوحی مەلانەبووبەکری موصەنیف، موراجەعەی(کتابنا وکتابکم)ی بەرێوە بەری ئەوقاف دەکەن، مەلا باشەکان کەنار خراون، مەگەر چۆنها دەنارێگەی چالاکیی ئاینییان نادرێ، بەراستی ئەم مەلا مۆدێرنانە، لەهەموو شتێ دەچن لەمەلا نەبێ.

**دووەم**: کەسانی تریش پەیدا بوون، ئەوانیش نیمچە مۆدێرنێکن هەموو خزمەتەکەیان بۆ ئیسلام، بەناشارەزایی خۆیان، دوو بەرەکیەکی فیقهی یان بەرپا کردووە، دلّی رەشە خەلّك لەرێبازی زانا گەورەکان سارد دەکەنەوە، لەبەر کۆبونەوەو کارو باری حیزبایەتی خۆیان، نایان پەرژێتە سەر جومعەو جەماعەتو دەوری قورئانو شەونوێژو زیکرو ویردو صەلاوات، بەهەر حالّ لەخوا داوا دەکەین کەبەرەحمەتی بێ سنوری خۆی فریای نەتەوەی ئیسلام بکەوێ. ئامین. (١٦-٧-٢٠٠٩).

٥٠٣- عن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ - رضى الله عنهما - قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - وَهُوَ يَخْطُبُ « إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ - أَوْ قَدْ خَرَجَ - فَلْيُصَلِّ رَكْعَتَيْنِ». [٥٠٣]

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودا لەخۆی لەباوکی بێ) فەرمووی: ڕۆژێکی هەینی لەوکاتەدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتاری دەدا، سولەیەکی غەطەفانی هاتو دانیشت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: ئەی سولەیك! هەڵسە دوورکات نوێژی سووکەڵە بکە) ئینجا فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەگەر یەکێکتان لەوکاتەدا هات بۆ مزگەوت کە پێشنوێژ وتاری دەخوێندەوە، با بەگورجی بەرلەوە کە دابنیشێ، با دوورکات نوێژی سووکەڵە بکات). (تاج/١، ژمارە: ٨٦٦ — ش/د/ت/ن).

## (١٧) باب: ما يقرأ في يوم الجمعة؟
## چی سورەتێ لەنوێژی هەینیدا دەخوێندرێ؟

٥٠٤- عن أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- يَقْرَأُ فِي الْجُمُعَةِ، فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ: ( الم تَنْزِيلُ) السَّجْدَةَ، وَهَلْ أَتَى عَلَى الْإِنْسَانِ ). (الحديث: ٨٩١-طرفه في: ١٠٦٨). [٥٠٤]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: هەمیشە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەرکاتی یەکەمی نوێژی بەیانی ڕۆژی هەینیدا، لەپاش خوێندنی سورەتی فاتیحا، سورەتی ئەلیف لام میمی سەجدەی بەتەوای

---

[٥٠٣] بخاری: ١١٦٣ = مسلم: ٢٠١٩.

[٥٠٤] تجرید/١، ژمارە: ٤٧٣ = ٨٩١، ١٠٦٨، بخاری مسلم: ٨٨٠ = ٢٠٢٥ شیحا.

دەخوێند، وەلەرکاتی دوەمیدا، لەپاش فاتیحە، سورەتی (هل أتی علی إلانسان حین من الدهر)ی دەخوێند.

## ٨- كتاب صلاة العيدين
## نامەی نوێژی هەردوو جەژنەکە

٥٠٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عنهما) قَالَ: شَهِدْتُ صَلاَةَ الْفِطْرِ مَعَ نَبِيِّ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ (رَضِيَ اللّٰهُ عنهم) فَكُلُّهُمْ يُصَلِّيهَا قَبْلَ الْخُطْبَةِ ثُمَّ يَخْطُبُ، قَالَ: فَنَزَلَ نَبِيُّ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ حِينَ يُجَلِّسُ الرِّجَالَ بِيَدِهِ، ثُمَّ أَقْبَلَ يَشُقُّهُمْ حَتَّى جَاءَ النِّسَاءَ وَمَعَهُ بِلاَلٌ، فَقَالَ: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَنْ لاَ يُشْرِكْنَ بِاللّٰهِ شَيْئًا) فَتَلاَ هَذِهِ الآيَةَ حَتَّى فَرَغَ مِنْهَا، ثُمَّ قَالَ: حِينَ فَرَغَ مِنْهَا: « أَنْتُنَّ عَلَى ذَلِكِ؟ » فَقَالَتِ امْرَأَةٌ وَاحِدَةٌ لَمْ يُجِبْهُ غَيْرُهَا مِنْهُنَّ: نَعَمْ، يَا نَبِيَّ اللّٰهِ، لاَ يُدْرَى حِينَئِذٍ مَنْ هِيَ؟ قَالَ: « فَتَصَدَّقْنَ ». فَبَسَطَ بِلاَلٌ ثَوْبَهُ، ثُمَّ قَالَ: هَلُمَّ فِدًى لَكُنَّ أَبِي وَأُمِّي، فَجَعَلْنَ يُلْقِينَ الْفَتَخَ وَالْخَوَاتِمَ فِي ثَوْبِ بِلاَلٍ». {الحديث/٢٠٤١ = ٢٠١٥ فم. تجريد/١، لاپەڕە: ١٠٥، ژمارە: ٨٣ = ٩٨، ٨٦٣، ٩٦٢، ٩٦٤، ٩٧٥، ٩٧٧، ٩٧٩، ٩٨٩، ١٤٣١، ١٤٤٩، ٤٨٩٥، ٥٢٤٩، ٥٨٨٠، ٥٨٨١، ٥٨٨٣، ٧٣٢٥}:[٥٠٥]

ئیبنو عەباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە خزمەت پێغەمبەرو ئەبوبەکرو عومەرو عوثماندا، هەر کەسەیان لە سەردەمی خۆیدا، ئامادەی نوێژی جەژنی ڕەمەزان بووم، هەموویان لەپێش وتاردا نوێژی جەژنیان دەکرد.

---

[٥٠٥] تجريد/١، ژمارە: ٨٣ - ٩٨، بخاری، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٤٢٨ = ٢٠٤١ شيحا.

فەرمووی: جا جارێ، پێغەمبەر کاتێ لە وتارەکە بۆوە، دابەزی تا بڕوات بۆلای ژنان، پیاوان وایان زانی کە نوێژ تەواو بووەو ویستیان هەڵسن بڕۆن، بەڵام بەچاوی خۆم پێغەمبەرم بینی کە بەدەستی پیاوانی دادەنیشانەوەو دڕی پێدان‌و ڕۆیشت بۆناو ژنان تا گەیشتە لایان، بیلالیشی لەگەڵدا بوو، جا ئەم ئایەتەی بۆ خوێندنەوە کە دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ - سورة الممتحنة/٦٠ - ١٢}:

واتە: ئەی پێغەمبەر! کاتێ ئافرەتە موسوڵمانەکان هاتن بۆ لات، کە پەیمان‌و بەیعەتت پێ بدەن، لەسەرئەوە پەیمانیان لێ وەربگرە کە: بەهیچ جۆرێ هاوبەش بۆ خودا بڕیار نەدەن‌و دزی نەکەن‌و حیزی نەکەن‌و منداڵی خۆیان نەکوژن‌و کچی خۆیان زیندە بەچاڵ نەکەن‌و بوختانی درۆ لەنێوانی دەست‌و پێی خۆیاندا نەکەن، واتە: منداڵی بێگانە نەهێنن لە بەینی دەست‌و پێی خۆیان دایبنێن‌و بە درۆو ناهەق بیکەن بە منداڵی مێردەکەیان، وە لەکردنی کاری خێردا نافەرمانی تۆ نەکەن‌و سەرپێچی لە فەرمانی تۆ نەکەن، جا لەپاش ئەمە، لە خودا بپاڕێرەوە بۆیان کە لێیان خۆش بێ، بەڕاستی خودا تاوان بەخش‌و میهرەبانە).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ لە خوێندنەوەی ئایەتەکە بۆوە، پێی فەرموون: (ئایا ئێوە ئەم پەیمانەتان قەبووڵە؟). تەنیا ژنێکیان وەڵامی پێغەمبەری دایەوە، کەسی تریان قسەی نەکرد، ژنەکە گوتی: بەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمەمان قەبووڵە، لەبەر قەرەباڵغی نەزانرا ئەو ژنە کێیە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێیان: (خێر بکەن) جا بیلال

چاکی جلەکەی خۆی گرتـەوەو گوتی: ئادەی ئـەی ژنگـەل! خێرەکانتـان بهێـنن، ئـەی بـاوك‌و دایکـم بـە قوربانتـان بـێ، ئـیتر ژنـەکان فەرمایـشتەکانی پێغەمبـەر کـاری تـێ کـردن‌و دڵیـان گـەرم بـوو، دەسـتیان کـرد بـە خێرکـردن، هـەیان بـوو گوارەکەی لە گوێی خـۆی دادەکەنـدو دەیکـرد بـەخێرو هـەڵی دەدایـە نـاو کۆشـی بیلالـەوە، هەشـیان بـوو ئەنگوسـتیلەکەی لـە پەنجـەی خـۆی دادەکەنـدو هـەڵی دەدایە ناو چاکی بیلالەوە، ئیتر هەروا). {بڕوانە: تـاج/١، لاپـەڕە: ٤٢، ژمـارە: ٦٠، چاپی/٤ + زنجیرە: ٨، ژمارە: ٥٥}.

٥٠٦– عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ سَمِعْتُهُ يَقُولُ قَـامَ النَّبِـيُّ – صـلى الله عليـه وسلم – يَوْمَ الْفِطْرِ ، فَصَلَّى فَبَدَأَ بِالصَّلاَةِ ثُمَّ خَطَبَ ، فَلَمَّا فَرَغَ نَـزَلَ فَـأَتَى النِّسَاءَ ، فَذَكَّرَهُنَّ وَهْوَ يَتَوَكَّأُ عَلَى يَدِ بِلاَلٍ وَبِلاَلٌ بَاسِطٌ ثَوْبَهُ ، يُلْقِي فِيهِ النِّسَاءُ الصَّدَقَةَ.[٥٠٦]

واتاکەی لەژمارە (٥٠٥)دا بەتەواوی رابورد.

٥٠٧– عَنْ ابْنِ عَبَّاس وَعَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ قَالَا: لَـمْ يَكُـنْ يُؤَذنُ يَوْمَ الْفِطرِ وَلَا يَوْمَ الْأَضحَى (الحديث: ٩٦٠).[٥٠٧]

عەبدڵڵای کوڕی عـەباس‌و جـابری کـوڕی عەبـدڵڵا (ڕەزای خودایـان لـێ بـێ) فـەرموویان: نەلـەڕۆژی جـەژنی رەمـەزاناو نەلـەڕۆژی جـەژنی قوربانـا، بۆنوێژی جەژن بانگ نەدەدرا.

ئەمەیش ژمارە (٤٢٧)ی مختصر صحيح مسلمە لەم بابەتەیە:

عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) الْعِيـدَيْنِ غَيْـرَ مَـرَّةٍ وَلاَ مَـرَّتَيْنِ، بِغَيْـرِ أَذَانٍ وَلاَ إِقَامَـةٍ». {الحـديث/٢٠٤٨ = ٢٠٢٢ فم}:

---

[٥٠٦] بخاری: ٩٥٨، ٩٧٨، مسلم. شیحا: ٢٠٤٤.

[٥٠٧] تجرید/١، ژمارە: ٥٠٣ = ٩٦٠. مسلم: ٢٠٤٨ = مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٤٢٧.

جابیری کوڕی سەمموورە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: نەك جارو دووجار، بەڵکوو جارەها نوێژی هەردوو جەژنەکانم کردووە لەگەڵ پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) بەبێ بانگو قامەت. {تاج/١، زنجیرە: ١٦٠، ژمارە: ٩٠٥}.

٥٠٨- حديث ابْنَ عَبَّاسٍ أَرْسَلَ إِلَى ابْنِ الزُّبَيْرِ فِي أَوَّلِ مَا بُويِعَ لَهُ إِنَّهُ لَمْ يَكُنْ يُؤَذَّنُ بِالصَّلَاةِ يَوْمَ الْفِطْرِ ، إِنَّمَا الْخُطْبَةُ بَعْدَ الصَّلَاةِ.(٥٠٨)

کاتێ پەیماندرا بە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرو کرا بە فەرمانداری سەر شاری مەدینە، ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی بێت) پیاوێکی نارد بۆلای، پێی ڕاگەیاند، لەرۆژی جەژنی ڕەمەزانا، بۆ نوێژی جەژن بانگ نادرێ، وە وتارەکەیش دەکەوێتە پاش نوێژی جەژنەوە!).

٥٠٩- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُما) قَالَ شَهِدْتُ الْعِيدَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ- فَكُلُّهُمْ كَانُوا يُصَلُّونَ قَبْلَ الْخُطْبَةِ. (الحديث: ٩٦٢).(٥٠٩)

ئیبنو عەباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەر خۆیدا(دروودی خودای لەسەر بێ)و لەخزمەت ئەبووبەکرو عومەرو عوسماندا (ڕەزای خودایان لێ بێ) ئامادەی نوێژی هەردوو جەژنەکان بووم، هەموویان لەپێش خوتبەوە نوێژی جەژنیان دەکرد.

٥١٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِي (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْرُجُ يَوْمَ الْفِطْرِ وَالْأَضحَى إِلَى الْمُصَلَّى، فَأَوَّلُ شَيْءٍ يَبْدَأُ بِهِ الصَّلَاةُ،

---

(٥٠٨) بخاری، ٩٥٩، ٩٦٠، مسلم: ٢٠٤٧ شیحا.

(٥٠٩) تجرید/١، ژمارە: ٥٠٤ - ٩٦٢، مسلم: ٢٠٤٩، ترقیم الشیخ خلیل...شیحا.

ثمَّ يَنْصَرِفُ، فَيَقُومُ مُقَابِلَ النَّاسِ، وَالنَّاسُ جُلُوسٌ عَلَى صُفُوفِهِمْ؛ فَيَعِظُهُمْ وَيُوصِيهِمْ وَيَأْمُرُهُمْ: فَإِنْ كَانَ يُرِيدُ أَنْ يَقْطعَ بَعْثا قَطعَهُ، أَوْ يَأْمُرَ بِشَيْءٍ أَمَرَ بِهِ، ثمَّ يَنْصَرِفُ.

قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَلَمْ يَزَلْ النَّاسُ عَلَى ذلِكَ حَتَّى خَرَجْتُ مَعَ مَرْوَان، (وَهُوَ أَمِيرُ الْمَدِينَةِ) فِي أَضحًى أَوْ فِطرٍ، فَلَمَّا أَتَيْنَا الْمُصَلَّى إذا مِنْبَرٌ بَنَاهُ كَثيرُ بْنُ الصَّلْتِ، فَإِذا مَرْوَانُ يُرِيدُ أَنْ يَرْتَقِيَهُ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ، فَجَبَذتُ بِثوْبِهِ، فَجَبَذنِي، فَارْتَفَعَ فَخَطبَ قَبْلَ الصَّلَاةِ، فَقُلْتُ لَهُ: غَيَّرْتُمْ وَاللَّهِ. فَقَالَ: أَبَا سَعِيدٍ قَدْ ذهَبَ مَا تَعْلَمُ، فَقُلْتُ: مَا أَعْلَمُ وَاللَّهِ خَيْرٌ مِمَّا لَا أَعْلَمُ. فَقَالَ: إِنَّ النَّاسَ لَمْ يَكُونُوا يَجْلِسُونَ لَنَا بَعْدَ الصَّلَاةِ، فَجَعَلْتُهَا قَبْلَ الصَّلَاةِ. (الحديث: ٩٥٦).[٥١٠]

ئەبوسەعید (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەستوری پێغەمبەر (دروودی خوادای لەسەر بێ) وابوو: لەڕۆژی جەژنی رەمەزانو ڕۆژی جەژنی قوربانـدا،بۆنوێژی جەژن دەڕۆیشت بۆنوێژگاکە، کەجێگەیێ بوو لەناو شاری مەدینەدا، لەدەرگای مزگەوتەکەی پێغەمبەرەوە هەزار گەزێ دوور بوو، یەکەم شت کەدەستی پێ دەکرد نوێژی جەژن بوو، کەلەنوێژەکە دەبۆوەهەڵ دەستایە سەرپێو رووی دەکردە خەڵکەکە، خەڵکەکەیش هەرکەسەیان لەجێگەی خۆیاندا، لەناو ریزەکەیاندا بەرامبەر پێغەمبەر دادەنیشتن، ئەوجا پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) وتاری نوێژی جەژنی دەخوێند: ئامۆژگاری دەکردن، پەندی دادەدان، راسپێری خێری دەکردن، فەرمانی پێیان دەکرد بەچاکە، نەهی لێ دەکردن لەخراپە، لەسەر دەمی پێغەمبەردا لەنوێژگاکە دوانگە نەبوو.

---

[٥١٠] تجرید/١، ژمارە: ٥٠٢ = بخاری: ٩٥٦، مسلم: ٨٨٩ = ٢٠٤٩، ٢٠٥٠.

ئەوجا ئەگەر بیویستایە پەلێ پێشمەرگە بنێرێ بۆئەرکێکی سەربازی، جیای دەکردنـەوەو دیـاری دەکـردن، یائەگـەر سـەبارەت بەبابـەتێ فـەرمانێکی هەبوایـە دەیفەرموو، لەپاشا لەنوێژگاکەوە دەگەڕایەوە بۆ مەدینە.

ئـەبو سـەعید فـەرمووی: ئـیتر موسـوڵمانان لەجـەژنانا لەسـەر ئـەم دەسـتورە بـەردەوام بـوون، هـەتا لـەو سـەردەمەدا کەمـەڕوان فـەرمانڕەوای مەدینـەبوو، لەجەژنی قوربانا بوو یالەجەژنی ڕەمەزانا، لەگەڵ مەڕوانا دەرچووین بۆ نوێـژی جـەژن لەنوێژگاکـە، کەگەیـشتینە نوێژگاکـە تەماشـام کـرد والـەوێ مینبـەرێ دروسـت کـراوە، کەسـیری کـوڕی صـەلت دروسـتی کردبـوو، مـەڕوانیش ویـستی یەکسەر لەپێش کردنی نوێژی جەژندا هەڵ بکوتێتە سەریو دەست بکا بـەوتار خوێندنەوە ! .

منیش لەبەر ئەوەی هەتا ئەوکاتە شتی وام نەدیبوو: کـەوتار لـەپێش نوێـژدا بخوێنرێتەوە، جلەکەیم گرت، کەسەر نەکەوێ بۆوتار تانوێژەکەنەکا، بەڵام خۆی لەدەسـتم ڕاپـسکانو سـەرکەوتە سـەردوانگەکەو لـەپێش نوێژەکـەدا وتارەکـەی خوێندەوە.

منـیش پـێم گـوت: بـەخوا سـوننەتی پێغەمبـەرو جێنـشینە باشـەکانی پێغەمبەرتان سەبارەت بـەم بابەتـە گۆڕیـوە، ئـەوەتا پـاشو پێـشی تیـادا دەکـەن، ئـەوەی حـەقی پێشخستنە، پاشـی دەخـەن، هـەروا بەپێـچەوانە یـشەوە! ئـەویش گوتی: ئەی ئەبو سەعید! ئەوەی تۆ دەیزانی بەسەر چووە؟ منـیش گـوتم بـەخوا ئـەوەی کـەمن دەیـزانم سـەبارەت بـەم بابەتـە، کەسـونەتی پێغەمبـەرە (دروودی خودای لەسەر بێ) گەلێ لەمە باشترە کەئێوە دەیکەن، من ئاگام لەشـتی وانییـە، مەڕوانیش گوتی: ئاخر خەڵکەکە وەك جاران نەماون، هەرکە نوێژەکـەیان کـرد




دەرۆن، لەپاش نوێژ دانانیشن کە گوێ لەوتاری ئێمەبگرن،منیش وتارەکەم خستە پێش نوێژەکەوە هەتا ناچاربین کەگوێی لێ بگرن.

## راڤەو ڕونکردنەوە:

لەپێڕستەکەی بۆ سوورەتەکانی قورئانی پیرۆزم دانا بوو،کەزوربەی لەبەرگی حەوتەمی تاج دابەخشەوە بووە، ئەم دووشیعرەی لێ کرتابوو، کەجێگەی خۆیەتی بەبۆنەی ئەم فەرمودەیەوە بیان نووسین، جارێ لەبەغدا، لەخزمەتی جەنابی مامۆستا مەلاعەبدولکەریمی بیارەدا بووم، مامۆستا باسی ئەوەیکرد کەئەمرۆ ئیسلام هەر ناوی ماوە، هەناوی نەماوە. منیش ئەم دووشیعرەم بۆخوێندەوە، زۆری بەلاوە پەسەند بوو:

شورا بەزوخروف رووکەش کراوە
داخم لەناومان بەس ناوی ماوە
زۆرشت لەم دینە لەکار خراوە
وەک گورگان خواردوو قولاخی ماوە

## (١) باب: ذكر إباحة خروج النساء في العيدين إلى المصلى وشهود الخطبة مفارقات للرجال

## دروسته له ڕۆژی جەژنی قوربانو له ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا، ژنان لەماڵ دەربچنو بڕۆن بۆ نوێژگاکەو ئامادەی وتارەکانی دوو نوێژەکانی دوو جەژنەکان ببن، بەڵام تێکەڵی ڕیزی پیاوان نەبنو خۆیان بەجیا بن

٥١١– عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) قَالَتْ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ نُخْرِجَهُنَّ فِي الْفِطْرِ وَالأَضْحَى: الْعَوَاتِقَ وَالْحُيَّضَ وَذَوَاتِ الْخُدُورِ. فَأَمَّا الْحُيَّضُ فَيَعْتَزِلْنَ الصَّلاَةَ، وَيَشْهَدْنَ الْخَيْرَ وَدَعْوَةَ الْمُسْلِمِينَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: إِحْدَانَا لاَ يَكونُ لَهَا جِلْبَابٌ؟ قَالَ: « لِتُلْبِسْهَا أُخْتُهَا مِنْ جِلْبَابِهَا ». {الحديث/٢٠٥٣ = ٢٠٢٧ فم. تجريد/١، لاپەڕە: ٢١٩، رقم: ٢١١ = ٣٢٤، ٣٥١، ٩٧١، ٩٧٤، ٩٨٠، ٩٨١، ١٦٥٢}:[٥١١]

ئوم عەطییە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانو ڕۆژی جەژنی قوربانا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێمان کرد، کە گەورە کچو ژنی بێنوێژو کەیبانۆی ناو ماڵ لەگەڵ خۆمان ببەین بۆ ئەو دەشتە بۆ نوێژگاکە، بۆ نوێژی جەژن، بەڵام ئافرەتە بێنوێژەکان نوێژەکە ناکەن، تەنیا ئامادەی کۆڕی پڕ فەڕو نزای خێری کۆمەڵی موسوڵمانان دەبن، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر وا ڕێکەوت یەکێکمان چارشێوی نەبوو، ئایا بەبێ چارشێویش هەربێ بۆ نوێژگاکە بۆ دەرەوەی شار؟ فەرمووی: (با لە خوشکێکی موسوڵمانی خۆی چارشێوێ بخوازێ). {تاج/١، زنجیرە: ١٥٩، ژمارە: ٩٠٣}.

[٥١١] تجرید/١، ژمارە: ٢١١ = ٣٢٤، مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٤٣١ = ٢٠٥٣.

**ڕوونکردنەوە:**

١. ئوم عـەطییـە (بـە کوردی واتـە: دایکـی عـەتیَ) نـاوی نوسـەیبەی کـچی حاریثە، هاوەڵی پێغەمبەرە، واتە: صەحابەیە، زۆر ئازاو دلێـر بـوو، ئەنـصارییە، لـە زۆر غـەزادا لەگـەڵ پێغەمبـەردا بـوو، دەسـتی پزیـشکی هـەبوو، زامـارو نەخۆشـیانی تیمـار دەکـرد، کۆمـەڵێ فـەرموودەی لـە صـەحیحا هەیـە، ئـەم فەرموودەیـەی ئێـرەی (متفـق علیـە)یـە، نـۆ فـەرموودەی لـە بوخاریـدا هەیـە، کۆمەڵێ لە هاوەڵانو لە زانایان لە بەصرە، دەستووری شۆردنی مردوویان لە ئوم عەتێ وەردەگرت، لە شۆردنی زەینـەبی کـچی پێغەمبـەردا، کـە مـرد، ئـوم عـەتێ بەشـداری کـردووە، چـەند فەرموودەیـەکی هەیـە، لەبابـەت شـۆردنی مـردووەوە، دادەنرێن بە سەرچاوەو بنـەمای شـۆردنی مـردوو، لـە مەدینـە کـچانی سـوننەت دەکرد، (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ). {بڕوانە: تجرید/١، ژمارە: ٢٠٥ + تـاج/١، زنجیرە: ٢٠٣، ژمارە: ١٠٦٩، ١٠٧٠ + تاج/٣، ژمارە: ٢٨٦١} .

٢. ئەم فەرموودەیە باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەم بابەتانە:

أ- ژنی بێنوێژ دروستە هـەموو پەرسـتنو یادێـکی خـودا بکـا، بەمـەرجێ بـە دەقی ڕۆشـنی تـر، قەدەغـە نـەکرابێ، وەك نوێـژو ڕۆژوو و قورئـان خوێنـدن، وە لەسەر ئەوە پاداشی باش وەردەگرێ.

ب- مافی هەیە ئامادەی کۆڕی دەورو دەرسو زانستو هەموو جۆرە کۆڕێـکی ڕەوای تر ببێ، بەمەرجێ کۆڕەکە لەناو مزگەوتا نەبێ، هەروا بۆی هەیە گوێ لە خوێندنی قورئانو گوتنو دەورکردنەوەی حەدیث بگرێ، یا بیخوێنێ، یـا دەوری بکاتەوە.

### (٤) باب: الرخصة في اللعب الذى لا معصية فيه أيام العيد
### مۆڵەت دەدرێ بەهەندێ یاری لە ڕۆژانی جەژنانا، بەمەرجێ گوناهو تاوان نەبێ

**٥١٢-** عَنْ عَائِشَةَ - رضى الله عنها - قَالَتْ دَخَلَ أَبُو بَكْرٍ وَعِنْدِى جَارِيَتَانِ مِنْ جَوَارِى الأَنْصَارِ تُغَنِّيَانِ بِمَا تَقَاوَلَتِ الأَنْصَارُ يَوْمَ بُعَاثَ - قَالَتْ وَلَيْسَتَا بِمُغَنِّيَتَيْنِ - فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ أَمَزَامِيرُ الشَّيْطَانِ فِى بَيْتِ رَسُولِ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - وَذَلِكَ فِى يَوْمِ عِيدٍ . فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - « يَا أَبَا بَكْرٍ إِنَّ لِكُلِّ قَوْمٍ عِيدًا ، وَهَذَا عِيدُنَا ».[٥١٢]

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرو هاوەڵەکانی) دەفەرموێ: ڕۆژی جەژن بوو، دوو کەنیشکم لەلا بوو، لە یاریدەدەران بوون، واتە: لە ئەنصار بوون، ئەو گۆرانییانەیان دەگوت، کە کاتی خۆی یاریدەدەران هەڵیان دابوون بەسەر هەراکەی بوعاثدا، عائیشە فەرمووی: بەڵام ئەو دوو کچە گۆرانی بێژ نەبوون، جا لەم کاتەدا ئەبوبەکری باوکم هاتە ژورەوەو ئەم بارودۆخەی بینیو فەرمووی: هەی هەی! بلوێرو بالۆرەی شەیتانو ماڵی پێغەمبەریان نەگوتووە! ئەمە چییە؟ پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی ئەبوبەکر! وازیان لێ بهێنە، چونکە هەموو گەلێ جەژنێکیان هەیەو ئەمەیش جەژنی ئێمەیەو گۆرانیو شادیو خۆشی کردن لەوێنەی ئەم ڕۆژەدا قەیدی نییە، بەمەرجێ سەرنەکێشێ بۆ بێ شەرعیو ناڕەوایی).

**٥١٣-** عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عنها) قَالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعِنْدِي جَارِيَتَانِ تُغَنِّيَانِ بِغِنَاءِ بُعَاثٍ، فَاضْطَجَعَ عَلَى الْفِرَاشِ وَحَوَّلَ وَجْهَهُ،

---

[٥١٢] بخاری. عیدین: ٩٥٢، مسلم: عیدین: ٢٠٥٨، تاج/١، زنجیرە: ١٦٣، ژمارە: ٩١٥.

فَدَخَلَ أَبو بَكْرٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) فَانْتَهَرَنِي، وَقَالَ: مِزْمَارُ الشَّيْطَانِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ فَأَقْبَلَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: « دَعْهُمَا » فَلَمَّا غَفَلَ، غَمَزْتُهُمَا فَخَرَجَتَا، وَكَانَ يَوْمَ عِيدٍ، يَلْعَبُ السُّودَانُ بِالدَّرَقِ وَالْحِرَابِ، فَإِمَّا سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَإِمَّا قَالَ: « تَشْتَهِينَ تَنْظُرِينَ؟ ». فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَأَقَامَنِي وَرَاءَهُ، خَدِّي عَلَى خَدِّهِ، وَهُوَ يَقُولُ: « دُونَكُمْ يَا بَنِي أَرْفِدَةَ ». حَتَّى إِذَا مَلِلْتُ قَالَ: « حَسْبُكِ؟» قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: « فَاذْهَبِي ». {الحديث/٢٠٦٢ = ٢٠٣٦. بخاري. تجريد/١/٤٧٦، رقم: ٤٩٨ = ٩٤٩، ٩٥٢، ٩٨٧، ٢٩٠٧، ٣٥٣٠، ٣٩٣١} : [٥١٣]

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دوو کەنیزم لەلابوون، گۆرانیان دەگوت، بەسەر هەرای رۆژەکەی بوعاسدا، سروودیان دەگوت، کە کوشتارێکی زۆر لەو رۆژەدا، لەپێش هاتنی ئیسلامدا، لەنێوانی ئەوس و خەزرەجدا، رووی دابوو، لەوکاتەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتە ژوورەوە، تەشریفی چوو لەسەر نوێنەکەی خۆی پاڵکەوت و رووی لەئێمە وەرچەرخان، پاش کەمێ ئەبوبەکری باوکیشم هات، چاوی بە حاڵەکە کەوت، لەپێشا لەمنی خوڕی و پیاما هەڵشاخا، ئەوجا فەرمووی: (بالۆرەی شەیتان و لەخزمەت پێغەمبەری خوا دا؟ شتی وا چۆن دەبێ؟) جاکاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مەشغووڵ بوو، چاوم لەکەنیشکەکان هەڵتەکان کە بڕۆن، ئیتر ئەوانیش رۆیشتن.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لێ بێ) رووی کردە ئەبوبەکرو پێی فەرموو: (ئەی ئەبوبەکر! وازیان لێ بێنە، با سروودەکەیان بڵێن، چونکە ئەمڕۆ جەژنی موسوڵمانانە).

---

[٥١٣] تجرید/١، ژمارە: ٤٩٨ = ٩٤٩، مسلم: ٨٩٢ = ٢٠٦٢ = مختصر صحیح مسلم: ٤٣٢ = ٢٠٥٨، ٢٠٦٢.

دیسان عائیشە فەرمووی: کات رۆژی جەژنی قوربان بوو، حەبەشییەکان بە قەڵخانو نێزە یارییان دەکرد، یا خۆم داوام لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد، یاخود خۆی فەرمووی: (ئەی عائیشە! حەزدەکەی کە تەماشای ئەم یارییە بکەی؟) منیش گوتم: بەڵێ، جامنی لەپشتی خۆیەوە وەستانو، چەناگەم نایە سەرشانیو رووومەتم نا بە رووومەتیەوە، جا حەزرەت (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی نەوەی ئەرفیدە! خەریکی یاریی خۆتان بن). ئیتر منیش دەستم کرد بە تەماشا کردن، تا خۆم تاقەتم نەما، حەزرەت (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئیتر بەستە؟) گوتم: بەڵێ، فەرمووی: (دەبڕۆ). {تاج/١، زنجیرە: ١٦٣، ژمارە: ٩٥١، ٩١٦}.

**٥١٤- حدیث** عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ – رضى الله عنه – قَالَ بَيْنَا الْحَبَشَةُ يَلْعَبُونَ عِنْدَ النَّبِىِّ – صلى الله عليه وسلم – بِحِرَابِهِمْ دَخَلَ عُمَرُ ، فَأَهْوَى إِلَى الْحَصَى فَحَصَبَهُمْ بِهَا . فَقَالَ « دَعْهُمْ يَا عُمَرُ».(٥١٤)

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەناو حەوشەی مزگەوتەکەی پێغەمبەردا، حەبەشییەکان یارییان دەکردو یاری نێزە بازیان دەکرد، لەوکاتەدا عومەر هاتە ژوورەوە چنگێ چەوی هەلگرتو چەوەکەی تێ گرتن، کە شتی وا نەکەن، بەڵام پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی عومەر! وازیان لێ بهێنە، با نێزە بازییەکەیان بکەن!).

---

[٥١٤] بخاری. جهاد: ٢٩٠٣، مسلم: ٢٠٦٦، ترقیم شیحا.

## ٩- كتاب صلاة الإستسقاء
## نامەی نوێژە بارانە

٥١٥- عَنْ عبدِللّه بْنِ زَيْدٍ الأنْصَارِيّ (رضى الله عنـه) أَنَّ رسـول الله (صـلى الله عليه وسلم) خَرَجَ إِلَى الْمُصَلَّى يَسْتَسْقِي، وَأَنَّـهُ لَمَّـا أَرَادَ أَنْ يَـدْعُوَ إِسْتَقْبَلَ وَحَـوَّلَ رِدَاءَهُ. وَفِي رِوَايَةٍ: فَجَعَلَ إِلَى النَّاسِ ظَهْرَهُ يَدْعُو اللّـهَ، وَاسْـتَقْبَلَ الْقِبْلَـةَ، القِبْلَـةَ وَحَـوَّلَ رِدَاءَهُ ثُـمَّ صَـلَّى رَكْعَتَـيْنِ). {الحـديث: ٢٠٦٩، ٢٠٧٠ = ٢٠٤٣، ٢٠٤٤ فـم. تجريـد/١/٤٩١ رقـم: ٥١٦ = ١٠٠٥، ١٠١١، ١٠١٢، ١٠٢٣، ١٠٢٤، ١٠٢٥، ١٠٢٦، ١٠٢٧، ١٠٢٨، ٦٣٣٤}:[٥١٥]

عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئـەو ڕۆژەی کـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەرچـوو بـۆ نوێژگاکـە، بـۆ نوێـژە بارانـە، بـۆ خـۆم دیـتم لـەکاتی وتـار خوێندنەوەکەیـدا، کـە دەسـتی کـرد بـەنزاکردن، پـشتی کـردە خەڵکەکـەو، ڕووی کـردە ڕووگـەو، دەسـتی کـرد بـە پاڕانەوەو نزاکردن، لەپاشا پۆشاکەکەی هەڵسوڕاند، واتـە: ڕاسـتو چـەپی کـرد، ئەوجا دوو ڕکات نوێـژی نوێـژە بارانـەی بـە (کۆمـەڵی) بەجەماعـەت بۆکردین، قورئانی بەدەنگی بەرز لەناویانا خوێند، وەك نوێژی جەهری). {تاج/١، زنجیرە: ١٧٣، ژمارە: ٩٣٧}.

---

[٥١٥] تجريد/١، ژمارە: ٥١٦ = بخاري: ١٠٠٥، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٤٤٧ = ٢٠٦٩.

## (١) باب: رفع اليدين بالدعاء في الإستسقاء
## لەکاتی نزای نوێژە بارانەدا دەست هەڵدەبڕێ

٥١٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَا يَرْفَعُ يَدَيْهِ فِي شَيْءٍ مِنْ دُعَائِهِ إِلَّا فِي الِاسْتِسْقَاءِ وَإِنَّهُ يَرْفَعُ حَتَّى يُرَى بَيَاض إِبْطَيْهِ. (الحديث: ١٠٣١- طرفاه في: ٣٥٦٥،٦٣٤١).[٥١٦]

ئەنەس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەر بێ) لەهیچ نزایەکیدا دەستی تەواو بەرز نەدەکردەوە، لەنزای داواکردنی باراندا ئەبێ، بەڵام لەکاتی داواکردنی باراندا ئەوەندە دەستی هەڵ دەبڕی سپێدەی هەردوو بنباخەڵی دەردەکەوت. (ت/١/٤٧٣/٤ ز-١٧٤ ژ-٩٤١).

## (٢) باب: الدعاء في الإستسقاء
## داوای بارینی باران لە وتاری نوێژی هەینیدا

٥١٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَصَابَتْ النَّاسَ سَنَةٌ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ- صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- فَبَيْنَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ فِي يَوْمِ جُمُعَةٍ، قَامَ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلَكَ الْمَالُ وَجَاعَ الْعِيَالُ فَادْعُ اللَّهَ لَنَا فَرَفَعَ يَدَيْهِ وَمَا نَرَى فِي السَّمَاءِ قَزَعَةً، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، مَا وَضَعَهَا حَتَّى ثَارَ السَّحَابُ أَمْثَالَ الْجِبَالِ، ثُمَّ لَمْ يَنْزِلْ عَنْ مِنْبَرِهِ حَتَّى رَأَيْتُ الْمَطرَ يَتَحَادَرُ عَلَى لِحْيَتِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَمُطِرْنَا يَوْمَنَا ذلِكَ وَمِنْ الْغَدِ وَبَعْدَ الْغَدِ وَالَّذِي يَلِيهِ حَتَّى الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى.

وَقَامَ ذلِكَ الْأَعْرَابِيُّ، أَوْ قَالَ غَيْرُهُ، فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ تَهَدَّمَ الْبِنَاءُ وَغَرِقَ الْمَالُ فَادْعُ اللَّهَ لَنَا فَرَفَعَ يَدَيْهِ فَقَالَ (اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلَا عَلَيْنَا) فَمَا يُشِيرُ بِيَدِهِ إِلَى نَاحِيَةٍ مِنْ

---

[٥١٦] تجريد/١، ژمارە: ٥٢٣ = بخاری: ١٠٣١، مسلم: ٨٩٥ = ٢٠٧٤، ٢٠٧١.

السَّحَابِ إِلَّا انْفَرَجَتْ، وَصَارَتْ الْمَدِينَةُ مِثْلَ الْجَوْبَةِ، وَسَالَ الْوَادِي قَنَاةُ شَهْرًا، وَلَمْ يَجِئْ أَحَدٌ مِنْ نَاحِيَةٍ إِلَّا حَدَّثَ بِالْجَوْدِ. (الحديث: ٩٣٣).[٥١٧]

پێشەوا ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەسەرینی پێغەمبەر خۆی(دروودی خودای لەسەر بێ) خەڵکی مەدینە توشی قاتو قری بوون، ڕۆژی هەینی بوو، پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) خەریك بوو وتاری دەدا، لەوکاتەدا پیاوێ لەعەرەبە سارانشینەکان هەڵساو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئاژەڵو ماڵات قڕبوون، ماڵو مناڵ برسی بوون، لەبەر بێ بارانی، دەی بفەرموو لەخوا بپاڕێرەوە کەبارانمان بۆ ببارێنێ. پێغەمبەریش(دروودی خودای لەسەر بێ) هەردوو دەستی بەرز کردەوەو فەرمووی:(ئەی خودایە! بارانمان فریاخە! ئەی خودایە! بارانمان فریاخە! ئەی خودایە! بارانمان فریاخە).

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەوکەسە کەگیانی من والەدەسیا، ئاسمان وەك مینا ساف بوو، یەك پەڵە هەوری پێوەنەبوو، پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی دانەنەواند، هەتا لەبەرەکەتی دوعاکەیەوە بایێ هەڵی کردو پارچە هەوری وەك کێوی پێك هێنا، بەرە بەرە هەورەکە یەکی گرتو توند بوو، ئیتر باران وەك پلووسك دایکردو ئاسمان دەتگوت کوندەی پڕلە ئاوی سەرەو ژێرەوە کراوە، ئیتر پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) لەدوانگەکەی نەهاتە خوارەوە، هەتا دای کردە باران، سەربانی مزگەوتەکە دڵۆپەی کرد، باراناوەکە دڵۆپ دڵۆپ بەسەر ڕیشی پیرۆزی پێغەمبەردا دەهاتە خوارەوە، ئیتر ئەو حەفتەیە سەراسەر هەتا ڕۆژی هەینی دوایی، بارانمان بۆ باری.

جاله هەینی دوایی دا هەرئەو پیاوەی هەینی پیشوو- یاپیاوێکی تر لەکاتی وتاری هەینی دا هات بەپێوە لەخزمەتی پێغەمبەردا راوەستاو- عەرزی کرد:

---

[٥١٧] تجرید/١، ژمارە: ٤٩١ = بخاری: ٩٣٣، مسلم: ٨٩٧ = ٢٠٧٦.

ئـەی پێغەمبـەری خـودا! خـانوو رووخـاو رێگـەوبان بـڕاو مـاڵو سـامانو مـاڵات لەلافاوا خنکا، ئەوەندە بـارانی زۆر بـاری، بفـەرموو لـەخودا بپـاڕێرەوە کـە ئـیتر ئەم بارانـە بگرێتـەوە. پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) زەردە خەنـەیێ گرتیو هـەردوو دەسـتەکانی بـەرزەوە کـردو فـەرمووی: (اللـهم حوالينـا لاعلينـا: خودایـە! بـەدەورو بـەرمانا بیبارێنـە، نـەوەك بەسـەر سـەرمانا) ئەنـەس (ڕەزای خوای لـێ بێ) فەرمووی: ئـیتر سـەرنجم دەدا پێغەمبـەر(درودی خـودای لەسـەر بێ) بەدەستی پیرۆزی بۆ هەرلایێ ئاماژەی دەکـرد، هەورەکـە لـەوێ دەرەوییـەوە، سـەرەنجام هەورەکـە لەسـەر ئاسـتی شـاری مەدینـە رەوییـەوەو وەك بازنـە، وەك کلاّو رۆژنەی لێ هات. شیوی قەناتیش، کەیەکێکە لەشـیوە کـانی شـاری مەدینـە، یەك مانگی رەبەق لافاوی نەوەستایەوە، لەهەر لایەکی وڵاتیشەوە کەسێ دەهات بۆمەدینە هەواڵو باسی ئەو بارانە زۆرەی دەگێرایەوە.

**راڤەو شیکردنەوە:**

بڕوانـە تـاج کـوردی بـەرگی یـەك، (ل-٤٧٧ ز-١٧٥ ژ-٩٤٢) هـەروەها تـاج کـوردی، بـەرگی چـوار لاپـەرە(٣٦١). دەبینـی ئـەم تەرجەمەیـە لـەکوێ گێرانـەوەکان وەرگێراون.

## (٣) باب: التعوذ عند رؤية الريح والغيم والفرح بالمطر

## لەکاتی هەڵکردنی بای سەختو هەوری سامناکدا، واباشە (أعوذ بالله) بکرێو پەنابگیرێ بە پەنای خودا لەزیانی ئەو بایە، یان ئەو هەورە، هەروا سوننەتە کە بەبۆنەی بارینی بارانەوە خۆشی دەرببڕێو شادی ئاشکرا بکرێ

٥١٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) إِذَا عَصَفَتِ الرِّيحُ قَالَ: « اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا، وَخَيْرَ مَا فِيهَا، وَخَيْرَ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَا فِيهَا، وَشَرِّ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ ». قَالَتْ: وَإِذَا تَخَيَّلَتِ السَّمَاءُ، تَغَيَّرَ لَوْنُهُ، وَخَرَجَ وَدَخَلَ، وَأَقْبَلَ وَأَدْبَرَ، فَإِذَا مَطَرَتْ سُرِّيَ عَنْهُ، فَعَرَفْتُ ذَلِكَ فِي وَجْهِهِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: « لَعَلَّهُ يَا عَائِشَةُ كَمَا قَالَ قَوْمُ عَادٍ (فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا: هَذَا عَارِضٌ مُمْطِرُنَا). {الحديث: ٢٠٨٢ = ٢٠٥٦فم + تاج/١، زنجيره: ١٧٦، ژماره: ٩٤٧، تجريد/٣/٤٢٤، ژماره: ١٢٩٣ = ٣٢٠٦، ٤٨٢٩}: [٥١٨]

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) فەرمووی: جاران کە بای توند، هەڵی دەکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: {اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا وَخَيْرَ مَا فِيهَا وَخَيْرَ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَا فِيهَا وَشَرِّ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ} واتە:

ئەی خودایە! داوات لێ دەکەم کە بەشم بدەی لەخێرو سوودی ئەم بایە خۆی، وە هەروەها لەو خێرو سوودەیش کە لەناو ئەم بایەدا هەیە، وە هەروەها لەو خێرو سوودەیش کە ئەم بایەی بۆ رەوانەکراوە، وە پەنادەگرم بەتۆ لە شەڕی ئەم بایە خۆی. وە هەروەها لەو شەڕەیش کە لەناو ئەم بایەدا هەیە، وە هەروەها لەو شەڕەیش کە ئەم بایەی بۆ رەوانە کراوە، عائیشە دەیفەرموو: کە بەری ئاسمان لێڵ دەبوو، رەنگی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەگۆڕاو

---

[٥١٨] تجريد/٣، ژمارە: ١٢٩٣ - ٣٢٠٦، ٤٨٢٩، مسلم: ٢٦٤٣ - ٢٠٨٢.

دەچووە دەرەوەو دەهاتە ژوورەوەو دەهاتو دەچوو، جا كاتێ كە دەباری، ئیتر حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرامۆشی بۆ دەهات، منیش كە شارەزای ئەم حاڵەی بووم، لەم بارەیەوە پرسیارم لێی كرد، فەرمووی: (ئەی عائیشە! مەترسی ئەوەم هەیە، كە ئەو هەورو هەڵایە، وەك رۆژەكەی گەلی عاد وابێ، كە ئەوان بەتەمای باران بوون كە هەورەكەیان دی، كەچی بوو بەهەوری تۆڵەو سزا، وەك خودا لە قورئانا دەفەرموێ: {فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا: هَذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُم بِهِ: رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ – ٤٦/٢٤} :

واتە: جا كاتێ هۆزی عاد، كە دییان وا پەڵە هەورێ لە ئاسۆی ئاسمانەوە بەرەو ئەوان دەكشێ، گوتیان: ئەمە هەوری بارانە. بارانمان بۆ دەبارێنێ! نەخەیر! هەور نییە، بەڵكوو ئەوە ئەو تۆڵەو سزایەیە كە ئێوە پەلەپەلتان بوو بۆ هاتنی، واهات بۆتان، ئەوە بایەكو شەپۆلە هەوایەكی ئاسمانییە سزایەكی سەختی پڕ ئێشو ئازاری واتیادایە بۆتان).

## (٤) باب: في ريح الصبا والدَّبور
## باسی بای شەماڵو بای رەشەبا

٥١٩– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ قَالَ: « نُصِرْتُ بِالصَّبَا، وَأُهْلِكَتْ عَادٌ بِالدَّبُورِ ». {الحديث: ٢٠٨٤ = ٢٠٥٨فم. تجريد/١/٤٩٩، رقم: ٥٢٦ = ١٠٣٥، ٣٢٠٥، ٣٣٤٣، ٤١٠٥}:[٥١٩]

ئیبنو عەباس (رەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا، (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودای گەورە بەهۆی بای صەبا (شەماڵ)ەوە، لەغەزای خەندەقدا، سەركەوتنی بەمن بەخشیو گەلەكۆمەی

[٥١٩] تجريد/١، ژمارە: ٥٢٦ = بخاری: ١٠٣٥، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٤٥٠.

قوڕميش لەدژى ئيسلامى تەفرو توونا كرد، وە هۆزى عاديشى بەباى ڕەشەبا فەوتان).

## ١٠- كتاب صلاة الكسوف
## نامەى خۆرگيران‌و مانگ گيران

٥٢٠- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ فِى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يُصَلِّى، فَأَطَالَ الْقِيَامَ جِدًّا، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ جِدًّا، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَأَطَالَ الْقِيَامَ جِدًّا، وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ جِدًّا، وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ قَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَامَ، فَأَطَالَ الْقِيَامَ، وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ ثُمَّ انْصَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَقَدْ تَجَلَّتِ الشَّمْسُ، فَخَطَبَ النَّاسَ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: « إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، وَإِنَّهُمَا لاَ يَنْخَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ، وَلاَ لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمَا فَكَبِّرُوا، وَادْعُوا اللَّهَ، وَصَلُّوا، وَتَصَدَّقُوا، يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، إِنْ مِنْ أَحَدٍ أَغْيَرَ مِنَ اللَّهِ أَنْ يَزْنِىَ عَبْدُهُ، أَوْ تَزْنِىَ أَمَتُهُ، يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ وَاللَّهِ لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ، لَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا، وَلَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً، أَلاَ هَلْ بَلَّغْتُ ». {الحديث: ٢٠٨٦ = ٢٠٦٠ فم. تجريد/١/٥٠٧، ژمارە: ٥٣١ = ١٠٤٤، ١٠٤٦، ١٠٤٧، ١٠٥٠، ١٠٥٦، ١٠٥٨، ١٠٦٤، ١٠٦٥، ١٠٦٦، ١٢١٢، ٣٢٠٣، ٣١٦٦، ٥٢٢١، ٤٦٢٤، ٣٢٠٣، ٤٦٢٤، ٥٢٢١، ٦٦٣١}:[٥٢٠]

---

[٥٢٠] تجريد/١، زمارە: ٥٣١، بخارى: ١٠٤٤، مختصر صحيح مسلم/١، زمارە: ٤٤٥ = ٢٠٨٦.

عائیشه (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: لەسەردەمی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەر بێ) رۆژگیرا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسا نوێژی خۆرگیرانی بۆ موسوڵمانەکان لەسەر ئەم شێوەیە کرد، ماوەیەکی زۆر دوورو درێژ، لەناو نوێژەکەدا، بەراوەستانەوە هەر قورئانی دەخوێند، ئینجا چەمییەوەو روکوعی بردو درێژەی دا بەویردی ناو چەمینەوەکەشی، ئینجا لە چەمینەوە (روکووع) هەڵسایەوەو گەلێ بەپێوە راوەستایەوەو ویردی خوێند، بەلام لە راوەستانی یەکەمی کەمتر، ئینجا دووبارە چەمینەوەیەکی دوورو درێژی تریشی بردەوە، بەلام لە چەمینەوەی یەکەمی کورتتر بوو، ئەوجا سەری هەڵبڕیو رێك راوەستا، ئینجا دوو کوڕنووشی دوورو درێژی برد، لە چەشنی دوو روکووعەکەی، یەکەم وەك یەکەمو دووەم وەك دووەم، ئەنجا هەڵسایەوە سەرپێو چی کرد لەرکاتی یەکەما، لەرکاتی دووهەمیشدا ئەوەی کردەوە، بەلام جار لەگەڵ جاردا، قورئان خوێندنی ناو راوەستانەکانو وێردی ناو ئیعتیدالو ناو چەمینەوەو کوڕنووشەکانی کەم دەکردەوە، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنوێژ بۆوەو خۆریش بەربوو بوو، ئینجا وتارێکی دا، بۆ مەردوومەکەو سوپاسو ستایشی خودای کردو ئەوجا فەرمووی: (ئەم خۆرو مانگە دوو نیشانەی گەورەن لەنیشانە گەورەکانی خودا، نە لەبەر مردنی کەسو نە لەبەر ژیانی کەس ناگیرێن، جا ئەگەر شتی واتان دی ئەوا لەخودا بپاڕێنەوەو ئەڵلاهو ئەکبەر بکەنو نوێژ بکەنو خێرو خێرات بکەن). لەپاشا فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەی گەلی موحەممەد! ئەی ئۆمەتی ئیسلام! سوێندم بەخودا، کەس وەك خودا ئاوا خێرەتو دەمار نایگرێ، کاتێ کەبەندەیەکی داوێنپیسی بکا، یا کەنیزێکی شەروالپیسی بکا، ئەی ئۆمەتی موحەممەد! بەو تاقە خودایە، ئەوەی کە من دەیزانم، لە هەواڵو کێشەو بەرەو

ئێش‌و ئازاری گۆڕو قیامەت، ئەگەر ئێوە بیزانن، گەڵێ زۆر دەگریان‌و زۆر کەم پێ دەکەنین، دەی ئێوە بەشایەت بن، کەوا من ئەرکی سەرشانی خۆمم بەجێهێنا، لەبارەی راگەیاندنی پەیامی ئیسلام، بەو خەڵکە!). {تاج/١، زنجیرە: ١٦٦، ژمارە: ٩٢١. چ/٤} {تەجرید/١/٥١١، ژمارە: ٥٣٤ = ١٠٥٢}.

٥٢١- عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ - صلى الله عليه وسلم - قَالَتْ خَسَفَتِ الشَّمْسُ فِي حَيَاةِ النَّبِيِّ - صلى الله عليه وسلم - فَخَرَجَ إِلَى الْمَسْجِدِ فَصَفَّ النَّاسُ وَرَاءَهُ ، فَكَبَّرَ فَاقْتَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - قِرَاءَةً طَوِيلَةً ، ثُمَّ كَبَّرَ فَرَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً ، ثُمَّ قَالَ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ . فَقَامَ وَلَمْ يَسْجُدْ ، وَقَرَأَ قِرَاءَةً طَوِيلَةً ، هِيَ أَدْنَى مِنَ الْقِرَاءَةِ الأُولَى ، ثُمَّ كَبَّرَ وَرَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً ، وَهْوَ أَدْنَى مِنَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ ، ثُمَّ قَالَ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ . ثُمَّ سَجَدَ ، ثُمَّ قَالَ فِي الرَّكْعَةِ الآخِرَةِ مِثْلَ ذَلِكَ ، فَاسْتَكْمَلَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فِي أَرْبَعِ سَجَدَاتٍ ، وَانْجَلَتِ الشَّمْسُ قَبْلَ أَنْ يَنْصَرِفَ ، ثُمَّ قَامَ فَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ ثُمَّ قَالَ « هُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ ، لاَ يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمَا فَافْزَعُوا إِلَى الصَّلاَةِ». [٥٢١]

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوسەرە پاکیزەکانی بێ) فەرمووی: بەسەرینی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) رۆژگیرا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەرچوو رۆیشت بۆ مزگەوت، لەوێ نوێژکەرەکانی کرد بەدوو ریز، لەپشت خۆیەوە ریزی کردن‌و نوێژی خۆرگیرانی بەکۆمەڵی لەسەر ئەم شێوەیە بۆکردن: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەڵلاهوئەکبەری تەحەررومی کردو ئەوانیش لەپشتیەوە نوێژیان دابەست، لەرکاتی یەکەما لەدوا خوێندنی فاتیحە،

---

[٥٢١] بخاری: ١٠٤٦، ١٢١٦، مسلم: ٢٠٨٨.

قورئـانێکی دوورو درێـژی خوێنـد، ئـەوجا ئەڵڵاهوئەکبـەری کـردو چـوو بـۆ چـەمینەوە، وەلـەم چـەمینەوەیەدا زۆرمایـەوەو ویردێکـی زۆر دوورودرێـژی خوێند، ئەوجا هەڵسایەوەو فـەرمووی: (سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ حَمِدَهُ ، رَبَّنَا وَلَـكَ الْحَمْـدُ: هەرکەسێ سوپاسی خودا بکا، خودا سوپاسەکەی قـەبووڵ دەکا، پـەروەردگارمان! ئـەی خـودای ئێمـە هەمیـشە سـوپاس‌و ستایـشی جـوان بۆتـۆ، لەسـەرئەوە کـە سوپاس‌و داواو نزامان گیرادەکەی!

ئـەنجا راوەسـتاو نەچـوو بـۆ کورنـووش، بـەڵام دەسـتی کـردەوە بـە قـزورئانخوێنـدنێکی دوورو درێـژ، بـەڵام لەیەکـەم قورئانخوێنـدنی کـەمتربوو، ئـەوجا ئەڵڵاهوئەکبـەری کـردەوەو چـەمینەوەیەکی تـری ئەنجامـدا، بـەدوورو درێـژی ویـردی تیـادا خوێنـد، بـەڵام لەچەمینەوەی یەکـەمی کـەمتربوو. ئـەوجا بەرزەوەبوو، فەرمووی: (سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ حَمِدَهُ ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ) ئـەوجا چوو بـۆ کورنـووش‌و دوو کورنووشی بـرد. ئـەوجا چی لەچەمینەوە (رکـات)ی یەکەمـدا کرد، لەرکاتی دووەمیشدا هەمان شتی گوت، لەم دوو رکاتـەدا چـوار چـەمینەوەی ئەنجامـــدا لەگـــەڵ چـــوار کورنـــووش دا، هـــەر رکاتـــەی دوو چـــەمینەوەو دوو کورنـووش، پـێش ئـەوەی کـە پێغەمبـەر نوێژەکـە تـەواوبکا خۆربـەربوو، ئـەوجا پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) هەڵـسایە سـەرپێ‌و سـوپاس‌و ستایـشێکی شایانی خـودای کـردو ئـەوجا فـەرمووی: (... ئـەم دوانـە، کـە خـۆرو مـانگن، دوو نیشانەی گەورەن لەنیشانە گەورەکانی خودا، نە لەبەر مردنی کەسێ‌و نە لەبـەر ژیـانی کەسـێ نـاگیرێن، هـەرکاتێ ئـەم جـۆرە دیاردانـەتان بینـی، پـەنا بەرنـە بەرنوێژو پاڕانەوە).

٥٢٢- عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْها قالَتْ: خَسَفَت الشَّمْسُ، فَقَامَ النَبِيّ صَـلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَرَأ سُوُرَةً طَوِيلَةً، ثُمَ رَكَعَ فَأطَالَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، ثُمَّ إسـتَفْتَحَ بِـسُوْرَةٍ

أُخرى، ثُمَّ رَكَعَ حِينَ قَضاها، وَسَجَدَ، ثُمَّ فَعَلَ ذلِكَ في الثانِيَةِ ثُمَ قالَ: (إنَّهُما آيتان مِنْ آياتِ اللَّهِ، فَإذا رأيْتُمْ ذلِكَ فَصَلُّوا، حَتَّى يُفرَجَ عَنْكُم، لَقَدْ رَأَيْتُ في مَقامِي هـذا كُـلَّ شَيْءٍ وُعِدْتُهُ، حَتَّى لَقَد رَأَيْتُني أُرِيدُ أَنْ آخُذَ قِطْفاً مِـنَ الجَنَّـةِ، حِيْنَ رَأَيْتُمُـوني جَعَلْـتُ أَتَقَدَّمُ، وَلَقَدْ رَأَيْتُ جَهَنَّمَ يَحْطُمُ بَعْضُها بَعْضاً، حِينَ رَأَيتُمُـوني تَـأخَرْتُ، وَرَأَيْـتُ فِيهـا عَمْرو بْنَ لُحيّ، وَهُوَ الذّي سَيَّبَ السَّوائِبَ). (الحديث ١٢١٢):[٥٢٢]

عائيـشه (ڕەزای خـوای لێ بـێ) فـەرمووی: بەسـەرینی پێغەمبـەر -دروودی خوای لەسەر بێ- خۆر گیرا، پێغەمبـەر -دروودی خـوای لەسـەر بـێ- هەڵسایەوە، دوو ڕکات نوێژی خۆرگیرانی کرد لەسەر ئەم شێوەیە: لەپێشدا لـەدوای فاتیحـە، لـەڕکاتی یەکەمـدا سـوورەتێکی درێـژی خوێنـد، ئـەوجا چـوو بـۆ چـەمینەوەو لەچەمینەوەشدا زۆرمایەوەو نزاو ویردی زۆری لە رکوعدا خوێند، ئەوجا سەری بەرزەوە کردو رێك ڕاوەستایەوەو دەستی کردەوە بە خوێنـدنی سـوورەتێکی تـر، جا کە رکاتەکەی تەواوکرد چوو بۆ چەمینەوەو ئـەوجا کوڕنووشـی بـرد، ئـەوجا لە ڕکاتی دووەمیشدا هەمان شتی کردەوە، لەپاشدا وتارێکی داو تیادا فەرمووی:

(لەڕاستیدا ئـەم خـۆرو مانگـە دوو نیـشانەی گـەورەن، لەنیـشانە گـەورەکانی خودا، کە دەبـن بەبەڵگـە لەسـەر یـەکێتی و تـەوانایی بـێ سـنووری پـەروەردگار، هەر وەك دەبن بەبەڵگەو نیشانەی چاوترسێنـەر بۆ بەندەکان، جـا ئەگـەر دیتـان شتی وا ڕوویدا، ئەوا لەخودا بپارێنەوەو نوێژ بکەن، خێرو خێـرات بکـەن، هـەتا دەرووتـان بـۆ دەکرێتـەوەو خۆرەکـە یـان مانگەکـە بـەردەبێ، لەڕاسـتیدا لـەم مەقامەمدا، هەموو ئەو بەڵێنانەی کە پێم دراون بینیمن، ئەو کاتەی کـە منتـان بینی خەریکبوو بچمە پێشەوە، ئـەوە بەهەشـتیان پـێ نیـشاندام ووالێیـان نزیـك کردمەوە، تەنانەت قرمم لێ خۆش کردو دەستم برد کە بۆڵێ ترێ ی لێ بهێـنم !

[٥٢٢] تجرید/٢، ژمارە: ٥٩٣ - بخاری: ١٢١٢، مسلم: ٢٠٨٨.

ئـەو کاتـەیش کـە دیتـان وامـن پاشـەو پـاش دێمـە دواوە، ئـەوە دۆزەخیـان پـێ نیـشاندام، وا تـاوی سـەندبوو، بەشـەکانی لـەناو خۆیانـا یـەکیان دەخـواردو یەکتریان دەپلیشانەوە ! لەناویدا عەمری کوڕی لوحەییم بینی، بەناو ئاگرەکەدا ریخۆڵـەی خـۆی بـەکێش دەکـرد، چـونکە ئـەو یەکـەم کـەس بووکـە وشـترە مەرەخەسی داهێنا).

## راڤەو شیکرنەوە:

بەپێی شەرحەکان ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگرین:

١. کاری کەم لەناو نوێژا پوچی ناکاتەوە.

٢. بەهەشت و دۆزەخ حاڵی حازر دروستکراون و هەن، بگرە هەندێ لە تاوانباران وان لەناو دۆزەخ دا سزا دەدرێن.

لەپێش هاتنی ئیسلامدا، هەندێ کەس دەیانگوت: ئەگەر لەم نەخۆشیە چاك بومەوە، یا لەم سەفەرە بەساغ و سەلامەتی گەڕامەوە، یا ئەو مرازەم هاتەدی، ئەوا ئەو وشترەم مەرەخەس بێ، ئیتر بەم جۆرە وشترەیان دەگوت (سائبە) کە جەمعەکەی (سوائب)ە، ئیتر ئەو وشترە بۆ خۆی بەڕەڵا دەبوو، نە باریان لێ دەنا، نە سواری یان پێ دەکرد، بۆ ئاو و لەوەڕیش مەرەخەس بوو، هیچیان لێ قەدەغە نەدەکرد.

## (٢) باب: ذكر عذاب القبر في صلاة الخوف
## باسكردنى سزاو ئەشكەنجەى ناوگۆڕ لەنوێژى ترسا

**٥٢٣-** عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللَّهُ عَنْهَا): أَنَّ يَهُودِيَّةً جَاءَتْ تَسْأَلُهَا، فَقَالَتْ لَهَا: أَعَاذَكِ اللَّهُ مِنْ عَذابِ الْقَبْرِ. فَسَأَلَتْ عَائِشَةُ (رَضيَ اللَّهُ عَنْها) رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَيُعَذبُ النَّاسُ فِي قُبُورِهِمْ؟ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (عَائِذا بِاللَّهِ مِنْ ذلِكَ). (الحديث: ١٠٤٩-أطرافه في:١٣٧٢،١٠٥٥، ٦٣٦٦).

ثمَّ رَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (ذاتَ غَدَاةٍ مَرْكَبًا، فَكَسَفَتْ الشَّمْسُ، فَرَجَعَ ضحًى، فَمَرَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ ظَهْرَانَيْ الْحُجَرِ، ثمَّ قَامَ فَصَلَّى وَقَامَ النَّاسُ وَرَاءَهُ، فَقَامَ قِيَامًا طوِيلًا ثمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طوِيلًا ثمَّ رَفَعَ فَقَامَ قِيَامًا طوِيلًا وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ، ثمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طوِيلًا، وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثمَّ رَفَعَ فَسَجَدَ سُجُودًا طوِيلًا، ثمَّ قَامَ فَقَامَ قِيَامًا طوِيلًا وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ ثمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طوِيلًا وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ ثمَّ قَامَ قِيَامًا طوِيلًا وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ ثمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طوِيلًا، وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثمَّ رفع فَسَجَدَ وَهُوَ دُونَ السُّجُودِ الْأَوَّلِ ثمَّ انْصَرَفَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُولَ ثمَّ أَمَرَهُمْ أَنْ يَتَعَوَّذُوا مِنْ عَذابِ الْقَبْرِ). (الحديث: ١٠٥٠). [٥٢٣]

**عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: جارێ ژنێکی جوولەکە هات بۆلام، داوای دەسەنەی لێ کردم و پێی گوتم: خوا پەنات بدات لەسزای ناو گۆڕ، جابۆدڵنیایی، لەم بارەیەوە پرسیارم لەپێغەمبەر کرد: ئایا ئەو خەڵکەدەمرن لەناو گۆڕەکانیاندا لەسەر تاوانی ژیانی جیهان سزادەدرێن! ؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەڵێ، پەنا دەگرم بەخودا لەسزای ناوگۆڕ).**

---

[٥٢٣] **تجريد/١، ژمارە: ٥٣٣ = بخاری: ١٠٤٩، ١٣٧٢، ١٠٥٥، ٦٣٦٦، مسلم: ٩٠٢ = ٢٠٨٦، ٢٠٨٨.**




جالەوەودوا سەرلەبەیانیەك، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەهۆی مردنی ئیبراهیمی کوڕیەوە،بەسواری کەژاوەیەك لەماڵ دەرچوو، قەدەری ئیلاهیو چارەنووسی خوایی وابوو کە خۆرگیرا، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتی چێشتەنگاو گەڕایەوە، بەناو ماڵی هاوسەرەکانی دا ڕەت بوو، تاڕۆیشتە ناومزگەوت، ئەوجالەوێ لەشوێنەکەی خۆیدا راوەستاو نوێژی خۆر گیرانی دابەست. وە موسوڵمانانیش لە پشتیەوە، بەجەماعەت نوێژی خۆرگیرانیان دابەست. ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەڕاوەستانی یەکەمی ڕکاتی یەکەما، قورئانێکی زۆر دوور و درێژی خوێند، ئەوجا چەمینەوەی یەکەمی رکاتی یەکەمی برد، وەلەناویدا یادێکی زۆری خوای گەورەی کرد، ئەوجا سەری لەچەمینەوە هەڵبڕی، دیسان قورئانێکی زۆری دوورو درێژی لەڕاوەستانی دووهەمی ڕکاتی یەکەما خوێند، بەڵام لە قورئان خوێندنی راوەستانی یەکەمی ڕکاتی یەکەم کەمتر، ئەوجا چەمینەوەی دووەمی ئەنجام دا، دیسان لەناو ئەم چەمینەوە یەشدا کەچەمینەوەی دووەمی ڕکاتی یەکەم بوو، تەسبیحاتێکیی زۆری خوێند، بەڵام لەتەسبیحاتی ناوچەمینەوەی یەکەمی ڕکاتی یەکەم کەمتر، ئەوجا سەری هەڵبڕیو پشتی ڕاست کردەوەو فەرمووی: (سمع الله لمن حمده ربنا ولك الحمد... ) ئینجا دوو کڕنووشی دوورو درێژی برد، ئیتر ڕکاتی یەکەم تەواو ئەوجا ڕکاتی دووەمیشی لەسەر هەمان شێوە تەواوکرد، ئەوجا لەنوێژ بۆوە، لەپاش تەواو بوونی نوێژ،وتارێکی بۆخەڵکەکەدا، ئەوەی کەحەزی خودای لەسەر بوو لەم ووتارەدا فەرمووی: (بەشێکی ئەم ووتارە لەفەرموودەی ژمارە ٥٣١ دا رابورد- وەرگێڕ) لەپاشدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێکردن کەپەنابگرن بەخودا لەسزای ناوگۆڕ، لەژیانی بەرزەخا.

## (٣) باب: ما عرض على النبي صلى الله عليه وسلم في صلاة الكسوف من أمر الجنة والنار

## هەندێ لەباس‌و خواسی بەهەشت‌و دۆزەخ، لەنوێژی خۆرگیرانا، پێشانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دراوە

٥٢٤– عَنْ أَسْمَاءَ (رَضي اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (أَتَيْتُ عَائِشَةَ وَهِيَ تُصَلِّي فَقُلْتُ مَا شَأْنُ النَّاسِ؟ فَأَشَارَتْ إِلَى السَّمَاءِ فَإِذا النَّاسُ قِيَامٌ فَقَالَتْ سُبْحَانَ اللَّهِ قُلْتُ آيَةٌ؟ فَأَشَارَتْ بِرَأْسِهَا أَيْ نَعَمْ فَقُمْتُ حَتَّى تَجَلَّانِي الْغَشْيُ فَجَعَلْتُ أَصُبُّ عَلَى رَأْسِي الْمَاءَ فَحَمِدَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ مَا مِنْ شَيْءٍ لَمْ أَكُنْ أُرِيتُهُ إِلَّا رَأَيْتُهُ فِي مَقَامِي حَتَّى الْجَنَّةُ وَالنَّارُ فَأُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّكُمْ تُفْتَنُونَ فِي قُبُورِكُمْ مِثْلَ أَوْ قَرِيبَ لَا أَدْرِي أَيَّ ذلِكَ قَالَتْ أَسْمَاءُ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ يُقَالُ مَا عِلْمُكَ بِهَذا الرَّجُلِ؟ فَأَمَّا الْمُؤْمِنُ أَوْ الْمُوقِنُ لَا أَدْرِي بِأَيِّهِمَا قَالَتْ أَسْمَاءُ فَيَقُولُ هُوَ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ جَاءَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى فَأَجَبْنَا وَاتَّبَعْنَا هُوَ مُحَمَّدٌ ثَلَاثًا فَيُقَالُ نَمْ صَالِحًا قَدْ عَلِمْنَا إِنْ كُنْتَ لَمُوقِنًا بِهِ وَأَمَّا الْمُنَافِقُ أَوْ الْمُرْتَابُ لَا أَدْرِي أَيَّ ذلِكَ قَالَتْ أَسْمَاءُ فَيَقُولُ لَا أَدْرِي سَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ شَيْئًا فَقُلْتُهُ). (الحديث ٨٦ ـ أطرافه في: ١٨٤، ٩٢٢، ١٠٥٣، ١٠٥٤، ١٠٦١، ١٢٣٥، ١٣٧٣، ٢٥١٩، ٢٥٢٠، ٧٢٨٧): [٥٢٤]

ئەسمائی کچی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆلای عائیشەی خوشکم، نوێژی ڕۆژگیرانی دەکرد، گوتم ئەو خەڵکە چییانە بۆچی وا شڵەژاون؟ عائیشەیش ئاماژەی کرد بۆ ئاسمان کەخۆرگیراوە، سەیریشم کرد کەوا خەڵکەکە لەپشت پێغەمبەرەوە نوێژی خۆرگیران دەکەن، عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) گوتی: (سبحان الله). منیش گوتم ئەم خۆرگیرانە ئایەت‌و نیشانەیە بۆ سزایێ کەوا بەڕێوە، هەتا بەندەکان هۆشیار ببنەوە پێی؟ ئەویش بەسەری

[٥٢٤] تجرید/١، ژمارە: ٧٥ - بخاری: ٨٦، ١٨٤، مسلم: ٩٠٥ = ٢١٠٠.

ئاماژەی کرد: بەڵێ وایە (و ئەمە سەرەتای سزایە، خوای گەورە دەفەرموێ: (وما نرسل بالآيات إلا تخويفاً) ئیتر منیش لەگەڵیان دا دەستم کرد بەنوێژ، نوێژەکە درێژەی کێشاو ڕۆژەکەیشی زۆر گەرم بوو، لەبەرئەوە بوورانەوە زۆری بۆهێنام‌و دڵم لەسەرخۆ چوو، هەتا دەستم کرد بەئاوپرژان لەڕوم‌و هەندێ ئاوم کرد بەسەر سەرماو هۆشم هاتەوە. لەپاش نوێژەکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتارێکی خوێندەوە، لەسەرەتاوە سوپاس‌و ستایش‌و وەسپێکی جوانی خودای گەورەی کردو فەرمووی: ئەوەیشی کەنەمدیبوو لەم شوێن‌و مەقامەم دا بینیم، هەتا بەهەشت‌و دۆزەخیشم بینی!

وەسرووشم بۆ هات: کەئێوە لەناو گۆڕەکانتاندابەسەختی تاقی دەکرێنەوە، وەك ئەو تاقیکردنەوە سەخت‌و ناخۆشەی کەلەسەردەمی جەجاڵە کوێرەی جادوو گەردا روو دەدات. فاطیمە کەئەم فەرموودەیە لەئەسمای نەنکیەوە دەگێڕێتەوە فەرمووی: نەنکم یاوای گوت یاگوتی: فەرمووی: لەچەشنی تاقیکردنەوەی جەجاڵەکوێرەی جادووگەر هەر کەسەتان لەناو گۆڕی خۆی دا تاقی دەکرێتەوە: دوو فریشتە کەناویان نەکیرو مونکەرە، دەچنە ناوگۆڕەکەوەو مردووەکە دادەنیشێنن‌و پێی دەڵێن: باوەڕت چیە دەربارەی ئەم پیاوە، واتە: چی لەبارەی موحەممەدەوە دەزانی؟ جا ئەوەی بڕوادارو موسوڵمان بێ، یا فەرمووی: ئەوەی باوەڕداری متمانەداربێ دەڵێ: ئەمە موحەممەدە پێغەمبەرو فروستادەی خودایە، بەڵگەی ڕۆشن‌و ڕێگەی راستی پێ نیشان داوین، بۆیە ئێمەیش باوەڕمان پێی هێناوەو شوێن ئایینەکەی کەوتووین، ئەمە موحەممەدە، سێ جار باوەڕ بەموحەممەد تازە دەکاتەوە (چونکە لەسەرەتای وەڵامەکەیەوە دەڵێ: ئەمە موحەممەدە، دووەم دەڵێ: پێغەمبەرو فروستادەی خودایە، سێیەم لەکۆتاییدا دیسان دەڵێتەوە: ئەمە موحەممەدە) ئەوجا فریشتەکان پێی دەفەرموون: بەخۆشی بخەوە خەوی خێرت بێ، ئێمە خۆشمان دەمانزانی کەتۆ بەڕاستی




بەبێ گومان باوەڕت پێی هەیە، فەرمووی: بەڵام ئەوەیشی ناپاك بێ، یاگوماندار بێ - واتە: دوودڵ بێ - دەڵێ: نازانم ئەم پیاوە چیەو چی نییە، چاوم لەدەمی خەڵك بووە، ئەوان چییان گووتووە منیش بۆ چاولێکەری گوتوومە!).

## شیکردنەوە:

ئەسماء کچی ئەبوبەکری صدیقە (ڕەزای خوایان لێ بێ)، خوشکی باوکی ی عائیشەی هاوسەری پێغەمبەرە، خوشکی هەقی عەبدوڵلای کوڕی ئەبوبەکرە، ژنی حەزرەتی زوبەیرە، ناودارە بە (ذات النطاقين) لەپێش کۆچ دا بەبیستو حەوت ساڵ لەدایك بووە، هەژدەهەم کەس بووە کەموسوڵمان بووە، پەنجاوشەش فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) گێڕاوەتەوە، هەژدە فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە، هەژدەیشی لەموسلیم دا هەیە، چواردەیان پەسەندی هەردوولایە، کەواتە سەرجەمی فەرموودەکانی لەبوخاریو موسلیم دا دەکاتە ١٤+ ٤+٤=٢٢ فەرموودە. لەپاش شەهید بوونی عەبدوڵلای کوڕی، لەمەککە، لەساڵی حەفتاوسێ ی کۆچیدا لەتەمەنی سەد ساڵی دا کۆچی دوایی کرد، کەوەفاتی کرد هیچ ددانی نەکەوتبوو، ئەقڵیشی ساغو تەواو بوو (ڕەزای خوای لێ بێ).

### ئەم حوکمو بڕیارانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١- بەهەشتو دۆزەخ ئێستا هەنو دروست کراون.

٢- سزای گۆڕ هەیەو ڕاستەو مردوو لەناوگۆڕدا زیندوو دەکرێتەوەو قسەو گوفتوگۆی لەگەڵ دا دەکرێو خەوی لێ دەکەوێ!

٣- پرسیاری نەکیرو مونکەر لەگۆڕدا لەمردوو ڕاستەو هەقە، کەلەبارەی خواو پێغەمبەری خوداوە پرسیاری لێ دەکەن.

٤- هەڵسانی جەجاڵو پەیدا بوونی چەسپاوەو رۆژێ لەڕۆژان ڕوودەدا.

٥- نوێـژی خـۆرگیران سـوننەتەو سـوننەتە قورئـانی بـەدوورو درێـژی تیـادا بخوێندرێ.

٦- نوێژی خۆرگیران بۆ ژنیش سوننەتە، وەك هەموو جەماعەتکردنێ لـەپاش ریزی پیاوانەوە دەبن.

٧- دروستە پرسیار لەنوێژکەر بکرێ لەناو نوێژەکەیدا.

٨- قسەکردن لەناو نوێژدا قەدەغەیە.

٩- ئاماژە کردنو شت پێ نیشاندان لەناو نوێژدا ئەگەر لەبەر پێداویستی بـوو دروستەو کەراهەتو ناباشی نییە.

١٠- کاری سووکەڵەو کەم نوێژی پێ پووچ نابێتەوە.

١١- لەدوا نوێژی رۆژگیرانەوە وتار سوننەتە.

١٢- تەنیا ئەهلی یەقین ئەهلی نەجاتن، مرۆی ناپاكو دوودڵو بێـبڕوا حاڵیـان چون یەکەو هەرسێ لا بەبێبڕوا دادەنرێن: (تـ١ ل-٤١١ هـەتا ل-٤٧٠ + تـ١ ل-٥٨٠ فـ٢ +فـ٣ +فـ٤=ز-٢٢٤ ژ-١١٤٥ هەتا ١١٥٤)هەروا بڕوانە عومدە(ج/١ ل-٩٣).

جا کاتێ بـەوردی سـەرنجی هـەموو گێڕانـەوەکانی ئـەم فەرموودەیـەت دا لەو کتێبو بابانەدا کەتیایانا ریوایەت کراوە، بۆت دەردەکەوێ کەعیلمی حەدیث چ دەریایـەکی بـێ پەیـە، وەزوربـەی مـەلاکانی ئـەم سـەردەمە چـەندە لێ ی بـێ ئاگان!

٥٢٥- عَن ابْنِ عَبَّاس (رَضي اللهُ عَنْهُما) قَالَ: انْخَسَفَت الشَّمْسُ عَلَـى عَهْـدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَـامَ: قِيَامًـا طوِيلًا، نَحْوًا مِنْ قِرَاءَةِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ، ثمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طوِيلًا، ثمَّ رَفَعَ فَقَامَ قِيَامًا طوِيلًـا،

وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ، ثمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طوِيلًا وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثمَّ سَجَد، ثمَّ قَامَ قِيَامًا طوِيلًا، وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ، ثمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طوِيلًا وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثمَّ رَفَعَ فَقَامَ قِيَامًا طوِيلًا، وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ ثمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طوِيلًا وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثمَّ سَجَدَ، ثمَّ انْصَرَفَ وَقَدْ تَجَلَّتْ الشَّمْسُ، فَقَالَ: صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، لَا يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، فَإِذا رَأَيْتُمْ ذلِكَ فَاذكُرُوا اللَّهَ). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ رَأَيْنَاكَ تَنَاوَلْتَ شَيْئًا فِي مَقَامِكَ، ثمَّ رَأَيْنَاكَ كَعْكَعْتَ؟ قَالَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنِّي رَأَيْتُ الْجَنَّةَ، فَتَنَاوَلْتُ عُنْقُودًا، وَلَوْ أَصَبْتُهُ لَأَكَلْتُمْ مِنْهُ مَا بَقِيَتْ الدُّنْيَا، وَأُرِيتُ النَّارَ فَلَمْ أَرَ مَنْظرًا كَالْيَوْمِ قَط أَفْظعَ، وَرَأَيْتُ أَكْثرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ). قَالُوا: بِمَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: (بِكُفْرِهِنَّ) قِيلَ: يَكْفُرْنَ بِاللَّهِ؟ قَالَ: (يَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ وَيَكْفُرْنَ الْإِحْسَانَ، لَوْ أَحْسَنْتَ إِلَى إِحْدَاهُنَّ الدَّهْرَ كُلَّهُ، ثمَّ رَأَتْ مِنْكَ شَيْئًا، قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ مِنْكَ خَيْرًا قَط. (ر: ٢٧) (الحديث: ١٠٥٢).[٥٢٥]

ئیبنو عەباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: لەسەر دەمی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) خۆرگیرا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نوێژی خۆرگیرانی کرد، وەلەنوێژەکەدا گەلێ ڕاوەستاو ماوەیەکی دوورو درێژ لەناونوێژەکەدا بەڕاوەستانەوە هەرقورئانی دەخوێند، بگرە لەڕاوەستانی یەکەمی ڕکاتی یەکەمدا بەقەد سورەتی بە قەرەی خوێند... ئیتر هەموو فەرموودەکەی گێڕایەوە (وەك لەژمارە: (٥٢٥)دا رابورد) تائەوێ کەئیبنو عەباس دەڵێ:جاپێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خۆرو مانگ دوو نیشانەی گەورەن لەنیشانە گەورەکانی خودا، کەدەبن بەبەڵگەو نیشانە

[٥٢٥] تجرید/١، ژمارە: ٥٣٤ = بخاری: ١٠٥٢، مسلم: ٩٠٧ - ٢٠٩٠، ٢١٠٦ = مسلم ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا.

لەسەر بوونی خوداو یەکتایی خودا، نەلەبەر مردنی کەس و نەلەبەر ژیانی کەس ناگیرین! بەڵام هەرکاتێ شتێکی ئاوەهاتان دی ئەوا زیکرو یادی خودا بکەن. یاران (ڕەزای خودایان لێ بێ) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! لەم شوێنە پیرۆزەتا، چاومان لێت بوو دەستت برد بۆشتێ کەبیهێنیت، کەچی هەڵ سڵەمیتەوەو وەك کەسێ لەشتێ بترسێ وابوو، ئیتر کشایتەدواوە!؟ فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (ئەوە لەو کاتەدا بەهەشتم دی، وەدەستم برد بۆهێشوێ ترێ لەمیوەکەی هەتا بیهێنم بۆتان، بەڵام بۆم نەکرایەوە، ئەگەر بۆم بکرایەتەوە تاجیهان دەما هەرلێتان دەخواردو تەواو نەدەبوو، چونکە میوەی بەهەشت کەدەنکێکی لێ دەگەیتەوە دەنکێکی تر لەلایەنی خوداوە دێتەوە جێگەی! هەروەها ئاگری دۆزەخیشم دی! هەرگیزاو هەرگیز دیمەنی وادزێوو بێ ڕەزام نەدیوە، سەرنجم دا زوربەی خەڵکەکەی ناوی، ژنان بوو). عەرزیان کرد: ئەوە لەبەرچی؟ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (چونکە ناسوپاسی دەکەن و لەبەر ئەوە کەناسوپاس و ناشوکرن) گوتیان: ئایا ناسوپاسی و ناشوکری خودا دەکەن؟ فەرمووی: نەء، مەبەست ئەوەنییە، بەڵام ناسوپاسی و ناشوکریی هاوسەرو هاوڕێ دەکەن و، پێنەزانن و چاکەیان لەبەر چاونییە،گریمان بەدرێژایی ساڵ چاکەوپیاوەتی لەگەڵ ژندابکەی، بەڵام ئەگەر ڕۆژێ لەڕۆژان شتێکی لێ دیت کەبەدڵی نەبێ، دەڵێ: ئەوەتی من هەم خێرم لەتۆ نەدیوە! ). (ت/١/٤٦٨/١-ش/ن = ز-١٧١١ ژ-٩٣٢).

)

## ٥) باب: ذكر النداء في صلاة الكسوف الصلاة جامعة
## بانگەواز بۆ نوێژی خۆرگیران کە بەم شێوەیە: (الصلاة جامعة)

٥٢٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو بن عاص أَنَّهُ قَالَ لَمَّا كَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - نُودِىَ إِنَّ الصَّلاَةَ جَامِعَةٌ فَرَكَعَ النَّبِىُّ - صلى الله عليه وسلم - رَكْعَتَيْنِ فِى سَجْدَةٍ ثُمَّ قَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ فِى سَجْدَةٍ ، ثُمَّ جَلَسَ ، ثُمَّ جُلِّىَ عَنِ الشَّمْسِ . قَالَ وَقَالَتْ عَائِشَةُ - رضى الله عنها - مَا سَجَدْتُ سُجُودًا قَطُّ كَانَ أَطْوَلَ مِنْهَا.[٥٢٦]

**عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) کە خۆرگیرا، ئەم بانگەوازە هەڵدرا: (إِنَّ الصَّلاَةَ جَامِعَةٌ: وا نوێژی خۆرگیران دەکرێ بەجەماعەت، زووکەن لەدەستی مەدەن!). جا لەسەر ئەم شێوەیە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دوو ڕکات نوێژی خۆرگیرانی بەکۆمەڵی بۆمانکرد: لەڕکاتی یەکەمدا، دوو ڕوکوع‌و دوو سەجدەی برد، هەروا لەڕکاتی دووەمیشدا، دوو چەمینەوەو دوو کوڕنووشی برد، ئیتر خۆریش بەربوو.**

**عەبدوڵڵا دەیفەرموو: عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەیفەرموو: (هەرگیز نوێژی وا دوورو درێژم نەکردووە).**

٥٢٧- عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ مَاتَ إِبْرَاهِيمُ فَقَالَ النَّاسُ كَسَفَتِ الشَّمْسُ لِمَوْتِ إِبْرَاهِيمَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَنْكَسِفَانِ

---

[٥٢٦] تجرید/١، ژمارە: ٥٣٢ = بخاری: ١٠٤٥، ١٠٥١، مسلم: ٩١٠ = ٢١٠٠.

لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِه، فَإِذا رَأَيْتُمْ فَصَلّوا وَادْعُوا اللّـه). (الحـديث: ١٠٤٣- طرفـاه في:١٠٦٠،٦١٩٩).[٥٢٧]

مـوغيرەی کوڕی شوعبە فەرمووی: لەسـەر دەمـی پێغەمبـەردا (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ئـەو ڕۆژەی کـەئیبراهیمی کـوڕی پێغەمبـەر مـرد (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو لەسەر ئیبراهیمی کوڕی بێ) ئەو ڕۆژە خـۆرگیرا، خـەڵك گوتیان: ئەوە لەبەر مردنی ئیبراهیم خۆرگیراوە! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خۆرو مانگ دوونیـشانەی گـەورەن لەنیـشانە گـەورەکانی خودا، نەلەبەر مـردنی کەسو نەلەبـەر ژیـانی کـەس نـاگیرێن، کاتـێ دیتـان کـەوا ڕۆژیامانگ گیراوە ئەوا لەخودا بپاڕێنەوەو نوێژ بکـەن). (تـاج/١/٤٦١/١ = ز-١٦٤ ژ-٩١٨).

ئەمە دەقی عەرەبیو کوردی ژمـارە (٥٣٠)ی تەجریـدی بوخارییـە، بـەڵام لێرەدا، واتە: لە ئەصڵەکەدا، کە (اللؤلؤ والمرجان)ە، لە (أبو مسعود)ەوەیە.

٥٢٨- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضي اللّهُ عَنْهُ) قَال: خَـسَفَت الـشَّمْسُ، فَقَـامَ النَّبِـيُّ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَزِعًا، يَخْشَى أَنْ تَكُونَ السَّاعَةُ، فَأَتَى الْمَـسْجِدَ، فَـصَلَّى بِـأَطْوَلِ قِيَامٍ وَرُكُوعٍ وَسُجُودٍ رَأَيْتُهُ قَط يَفْعَلُهُ، وَقَالَ: (هَذهِ الْآيَاتُ الَّتِي يُرْسِـلُ اللّـهُ لَـا تَكُـونُ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنْ يُخَوِّفُ اللّهُ بِها عِبَادَهُ، فَإِذا رَأَيْتُمْ شَيْئًا مِنْ ذلِكَ فَافْزَعُوا إِلَى ذكْرِهِ وَدُعَائِهِ وَاسْتِغْفَارِهِ). (الحديث: ١٠٥٩).[٥٢٨]

ئـەبوو مووسـای ئەشـعەری (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەررمووی: ڕۆژی خۆرگیرانەکە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕاپەڕیو شڵەژاو مەترسـی ئـەوەی هـەبوو کەئـەوە بـەرایی نیـشانەکانی هـاتنی قیامـەت بـێ، ڕۆیـشت

---

[٥٢٧] بخاري. کسوف: ١٠٥١، ١٠٤٥، مسلم: ٢١١٠.

[٥٢٨] تجرید/١، ژمارە: ٥٣٦ = بخاري: ١٠٥٩، مسلم: ٩١٢ = ٢٠٨٩.

بۆمزگەوتو لـەوێ نوێـژێکی خـۆر گیرانـی دوورو درێـژی بەکۆمـەڵی بـۆ کـردین، قەت نەمدیوە کەئاوا لەنوێژدا، قورئانی وا دورو درێژ لەراوەستانا بخوێنێ، یائاوا چـەمینەوەو کورنـووش درێـژ بکاتـەوە. وتـارێکی دا، فـەرمووی: (ئـەم نیـشانەو دیاردانەی کە خودا دەیان نێرێ و پیشانی ئەوخەڵکەیان دەدا، وەك خۆر گـیران‌و مـانگ گـیران‌و بومەلـەرزەو گـەردەلوول‌و ئەمانــە، خـودا بۆئــەوەی دەنێــرێ کەبەندەکانی خۆی هۆشیاربکاتەوەو بەوانە بیان ترسێنێ‌و هەڕەشـەیان لـێ بکـا، ئـەگینا ئـەم جـۆرە نیـشانە، نەلەبـەر مردنـی کـەس‌و نەلەبـەر ژیـانی کـەس روو نادات، جاکاتێ دیتان شـتێ لەمانـە رووی دا، ئـەوا پـەلاماری یـادی خـودا بـدەن‌و، نوێـژ بکـەن‌و خێـرو خێـرات بکـەن، چـونکە خـودا بـەهۆی کردنـی ئـەم جـۆرە خواپەرستیانەوە دەرووی رەحمەت لەبەنـدەکانی خۆی دەکاتەوەو، لەدەردو بـەڵاو ناخۆشی ڕزگاریان دەکا).

٥٢٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ - رضى الله عنهما - أَنَّهُ كَانَ يُخْبِرُ عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لاَ يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ ، وَلَكِنَّهُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهَا فَصَلُّوا». [٥٢٩]

واتاکەی لەژمارەکانی پێشەوەدا رۆیشت، بەتایبەتی لەژمارە (٥٢٧)دا.

٥٣٠- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ كَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - يَوْمَ مَاتَ إِبْرَاهِيمُ ، فَقَالَ النَّاسُ كَسَفَتِ الشَّمْسُ لِمَوْتِ إِبْرَاهِيمَ . فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - « إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لاَ يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ فَصَلُّوا وَادْعُوا اللَّهَ». [٥٣٠]

لەژمارە (٥٢٧)دا بەتەواوی رابورد.

---

[٥٢٩] بخاری: ١٠٤٢، مسلم: ٢١١٨.

[٥٣٠] بڕوانە ژمارە (٥٢٧) لەپێشەوە رابورد.

**روونكردنەوە:**

**ئەم چەندین خاڵانەلەم بابەتەدا ڕەچاو دەكرێن:**

**١- مەبەست لەئایات (نیشانەو عەلامات) چییە؟ مەبەست لەئایات لەم شوێنەو لەوێنەی ئەم شوێنەدا ئەو دیاردە سروشتیو نیشانە ئاسمانیانەن، كەناوبەناو لەناكاودا روو دەدەن، وەك: خۆرومانگ گیرانو بوومەلەرزەو بوركانو گەردەلولو زریانو بای سەختو لافاوی گەورەو هەورە تریشقەو برووسكەو ئەستێرە كشانو شتی تری سامناكی ترسناك، یاوەك قەومانی كارەساتی ناخۆش، وەك مردنی زانای ئاینی گەورەو مردنی پادشای دادپەروەری ئیسلام پەروەر، هەروادیل كردنی ئەم زاتانە لەلایەن دوژمنەوە.**

**٢- لەم كاتانەدا چی بكرێ باشە؟ لەم كاتەنەدا بەشێوەیەكی گشتی خێرو یادی خوداو نوێژو تەوبەو پاڕانەوەو داوای لێ خۆش بوون لەخودا بكرێ، لەگەڵ رەچاو كردنی خاڵی سێیەم لەم ڕوونكردنەوەیە.**

**٣- لەهەمان كاتا هەریەك لەم دیاردەو نیشانانە، لەكاتی ڕوودانیانا كردار یاگوتارێكی تایبەتی سوونەتە، یاهەردووكیان، یاچەند كردارو یاچەند گوتارێ، بۆنمونە: لەكاتی خۆرو مانگ گیراندا ئەو شتانە سوننەتن كەلەم باسەدا بەدرێژی باس كراون، لەكاتی گەردەلوولو بای سەختدا نزای تایبەتی خۆی هەیە، لەكاتی هەورەتریشقەدا سوونەتە سێجار بڵێ: (سُبحانَ من يُسبحُ الرعدُ بحمدهِ وَالملائِكة من خيفتهِ) لەكاتی كشانی ئەستێرەدا واباشە سەرنجی نەداو بڵێ: (ماشاءَ الله لاقُوَة إلا بالله) لەكاتی فەوتی گەورە پیاوانی ئیسلاما كڕنوش بردن بۆخودا، بەدەستی بەدەستنوێژەوە بەرەو رووگەیە، یەك كوڕنووش سوننەتە، لەكاتی بوومەلەرزەدا تەوبەو نزاو پاڕانەوەو پەناگرتن بەخودا لەشەڕی ئەم دیاردەیە سوننەتە. (بڕوانە تاج/١/٤٧٨،٤٧١،الاذكار للنووی ص١٦٢-١٦٤).**

٤- لەکۆمەڵێ فەرموودەو (ئەسەر) بیستراوی دروستەوە دەردەکەوێ کەگوناە هۆی روودانی دەردو بەڵایە. جارێ لەسەر دەمی پێشەوا عومەردا (ڕەزای خوای لێ بێ) بوومەلەرزەیێ ڕوویدا، فەرمووی: (ئەی خەڵکی مەدینە! چ زووبێشەرعیتان بەرپاکرد، بەخودا ئەگەر ئەمجارە رووبداتەوە لەناوئێوەدا دانانیشم).

ئەمەیش فەرموودەیەکە، لەبارەی هەندێ لەم رووداوانەوە:

وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: {مَا هَبَّتْ رِيحٌ قَطُّ إِلَّا جَثَا اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَلَى رُكْبَتَيْهِ، وَقَالَ: "اَللَّهُمَّ اجْعَلْهَا رَحْمَةً، وَلَا تَجْعَلْهَا عَذَابًا"} رَوَاهُ اَلشَّافِعِيُّ وَالطَّبَرَانِيُّ. وَعَنْهُ: {أَنَّهُ صَلَّى فِي زَلْزَلَةٍ سِتَّ رَكَعَاتٍ، وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ، وَقَالَ: هَكَذَا صَلَاةُ اَلْآيَاتِ} رَوَاهُ اَلْبَيْهَقِيُّ. وَذَكَرَ اَلشَّافِعِيُّ عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) مِثْلَهُ دُونَ آخِرِهِ. {ضعيف جداً، المشكاة: ١/٣٤٣}:

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو لە عەبباسی باوکی) فەرمووی: هەموو جارێ کەبا هەڵی دەکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر هەردوو چۆکی دادەنیشتو دەیفەرموو: ("اَللَّهُمَّ اجْعَلْهَا رَحْمَةً، وَلَا تَجْعَلْهَا عَذَابًا") ئەی خودایە! بە میهرەبانی خۆت، ئەم بایەمان بۆبکە بەمایەی سۆزو میهرەبانی خۆتو مەیکە بەهۆی سزای خۆت). شافیعیو طەبەرانی گێڕاویانەتەوە (ضعیف جداً، المشکاة: ١/٣٤٣).

دیسان دانەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەڵێ: بەیهەقی (رەحمەتی خودای لێ بێ) بەڕشتەی خۆی دەگێڕێتەوە: کە ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) لە بوومەلەرزەیەکا، دوو رکات نوێژی نیشانەی کرد، کەپێی دەگوترێ (صَلاةُ الآيَاتِ) لەهەر رکاتێکا سێ چەمینەوەو دوو کوڕنووشی ئەنجامدا، کەکۆی چەمینەوەکان لەهەردوو رکاتەکەدا، دەکاتە شەش چەمینەوە، وەکوی

کورنووشـەکانیش لەهـەردوو رکاتەکـەدا دەکاتـە چـوار کورنـووش. ئـەوجا ئیبنـو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: نوێژی نیشانە گەورە سروشتییەکان، کـەناو بـەناو روودەدەن، کـەپێی دەگـوترێ صـەلاتی ئایـات ئاوایـە، بـەم شـێوەیە، بەدوو رکاتو شەش چـەمینـەوەو چـوار کورنـووش دەکـرێ﴾. {بەیهـەقی ٣٤٣/٣، ژمارە: ٤٩٢٩. بەیهەقی دەڵێ: فەرموودەیەکی صەحیحە لەئیبنو عەبباسەوە}.

دیـسان دانـەری کتێبـی (بلـوغ المـرام): پێـشەوا عەسـقەلانی (رەحمـەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: شافیعیش مانەندی ئەم نوێژی نـیشانەیە لەسـەر ئـەم شێوەیە، لەپێشەوا عەلی کوڕی ئەبو طالیبەوە باس دەکا، کە لـە بوومەلەرزەکـەی بەصرەدا، عەلی دوو رکات نوێژی سوننەتی ئایـاتی بـە شـەش چـەمینەوەو چـوار کورنـووش ئەنجامـداوە، لەهـەر رکاتێکـا سـێ چـەمینەوەو دوو کورنـووش، کـە سەرجەمیان دەکاتە شەش چەمینەوەو چوار کورنووش، بەڵام ئەوەی تیادا نییە، کە عەلی بڵێ: نوێژی نیشانەکان ئاوایە).

روونکردنەوە:

**پوختەی بڕیارەکانی باسی نوێژی سوننەتی خۆرگیرانو مانگ گیران:**

١- کۆی فەرموودەکانی نوێژی خۆرگیرانو مانـگ گیران یەکسانە بە (٥٣١ — ٥٢٠ = ١١) واتە: یازدە فەرموودە.

٢- شـێوەی یەکـەمی چـۆنێتی کردنـی نوێـژی خـۆرگیرانو مـانـگ گـیران، ئەوەیە کە بەدوو رکات بکرێ، لەهەموو رکاتێکا دوو چەمینەوەی تیابێ، لەگـەڵ دوو کورنووشـا، لەهـەموو رکاتێکـا، سـوورەتی فاتیحـەو سـوورەتی پـاش فاتیحـە، دووجار دەخوێنرێ، جارێ لەڕاوەستانی یەکەمداو جارێ لەڕاوەسـتانی دووەمـدا، مەزهەبی شافعی ئەم شێوەیەی هەڵبژاردووە.

٣- بۆ کەسێ بیەوێ ئەصڵی سوننەتەکە بەیەکێ لەم دوو بۆنەیەوە، جێبەجێ بکا، دەتوانی دوو رکات نوێژی سوننەتی ئاسایی، وەك سوننەتی دیاری مزگەوت، بەنیازی خۆرگیران، یا مانگ گیران بکا، بەپێی بۆنەکە، ئیتر بەتەنیا خۆی بیکا، یا بەکۆمەڵی بیکەن دەبێ، ئەمەڕای حەنەفییەکانە.

٤- بەشێوەی گشتی نوێژی خۆرگیران، یا مانگ گیران سوننەتە، فەرز نییە، بەتەنیا دەکرێو بەکۆمەڵیش دەکرێ.

٥- دوورکات نوێژی سوننەتی ئایات لەکاتی روودانی کارەساتی سروشتیدا سوننەتە، وەك لەپاش روودانی زەمینلەرزەو، لەپاش مردنی زانایەکی گەورەو، لەکاتی گەردەلوولو زریانو شتی تری وادا. {بڕوانە: تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٥٢٥ هەتا ژمارە: ٥٢٧ + پوختەی موسلیم ژمارە: ٤٥٠ + تاج/١، زنجیرە: ١٧٢، ژمارە: ٩٣٤، لاپەڕە: ٤٥٧ چاپی چوارەم}.

# ١١- كتاب الجنائز
# نامەی تەرم

{بڕوانــە فیقهـی ئاســان/١، لاپــەڕە: ٢٨٤ هــەتا ٣١١ — زنجـیرە: ١٠٢، هــەتا زنجیرە: ١١٢ + تەجرید/٢، لاپەڕە:٢١ لە ژمارە ٥٩٨ هـەتا ژمـارە ٦٦٥ + تـاج الأصـول في أحاديث الرسول/١، ژمـارە: ١٠٠٨ هـەتا ١١٧٤ + مختـصر صـحيح مـسلم/١، لاپـەڕە: ٥١٨ چاپی/١، باسی/٣١ لە ژمارە: ٤٥١ هەتا ژمارە: ٥٠٠ لە زنجیرە: ٣٤١ هەتا زنجـیرە: ٣٨٨ + شەرحی بلوغ المرام، بەرگی/٢ لە ژمارە: ٥٥٥ هەتا ژمارە: ٦٢٠}.

## (٦) باب: البكاء على الميت
## گریان لەسەر مردوو

٥٣١- عَنْ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ أَرْسَلَتْ ابْنَـةُ النَّبِـيِّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَيْهِ: إِنَّ ابْنًا لِي قُبِضَ فَأْتِنَا، فَأَرْسَلَ يُقْرِئُ السَّلَامَ، وَيَقُولُ: (إِنَّ لِلَّهِ مَـا أَخَـذَ وَلَهُ مَا أَعْطَى، وَ كُلٌّ عِنْدَهُ بِأَجَلٍ مُسَمًّى فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ). فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ تُقْسِمُ عَلَيْهِ لَيَأْتِيَنَّهَا، فَقَامَ وَمَعَهُ: سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ، وَمَعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، وَ رِجَالٌ، فَرُفِعَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الصَّبِيُّ وَنَفْسُهُ تَتَقَعْقَعُ، قَالَ حَـسِبْتُهُ أَنَّهُ قَالَ: كَأَنَّهَا شَنٌّ، فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ، فَقَالَ سَعْدٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا هَذَا ؟ فَقَـالَ: (هَـذِهِ رَحْمَـةٌ جَعَلَهَـا اللَّـهُ فِـي قُلُـوبِ عِبَـادِهِ، وَإِنَّمَـا يَـرْحَمُ اللَّـهُ مِـنْ عِبَـادِهِ الرُّحَمَـاءَ). (الحديث ١٢٨٤- اطرافه في: ٧٣٧٧، ٦٦٥٥، ٦٦٠٢، ٥٦٥٥، ٧٤٤٨): [٥٣١]

ئوسامەی کوڕی زەیـد (ڕەزای خـوای لێ بـێ) فـەرمووی: کچێکی پێغەمبـەر -دروودی خوای لەسەر بێ- کە نـاوی زەینـەب بـوو، نـاردی بەشوێن باوکیـا: کـەوا

---

[٥٣١] تجرید/٢، ژمارە: ٦١٦ - بخاری: ١٢٨٤، مسلم: ٩٢٣ = ٢١٣٢.

کوڕەکەم گیان دەدا، تەشریفت بێنە بۆلامان، پێغەمبەریش -دروودی خوای لەسەر بێ- بەرابەرەکەدا سلاوی بۆناردو فەرمووی: پێی بڵێ: ئەوەی خودا دەیدا بەبەندەی خۆی هەتا ماوەیەك و لەپاشا دەیباتەوە بۆ خەزێنەی خۆی هی خۆیەتی، وە هەمووشتێکیش لەلای خودا ماوەیەکی دیاریکراوی هەیەو کەئاکامی هات ئیتر پاش و پێشی نیەو ماوەی بەسەردەچێ! کەوابوو پێی بڵێ: باصەبرو ئارام بگرێ، ساغ لەبەر ڕەزای خودای گەورە، بەلاّم دیسانەوە کچەکەی ناردییەوە بە شوێنیداو سوێندی لێ خوارد کە دەبێ هەر تەشریف بهێنێ بۆلای، پێغەمبەریش -دروودی خوای لەسەر بێ- هەڵسا لەگەڵ سەعدی کوڕی عوبادەو موعاذی کوڕی جەبەل و ئوبەیی کوڕی کەعب و زەیدی کوڕی ثابیتو چەند پیاوێکی تردا چوون بۆلای، کە منالّەکەیان هێنا بۆ پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- گیانی دەداو هەناسەی سوار بووبوو، وەك کوندەیێ کە بیژەنی بەدەم گیانەلاوە دەهات و دەچوو، جاهۆن هۆن فرمێسك بەچاوەکانی پێغەمبەردا -دروودی خوای لەسەر بێ- هاتە خوارەوە، سەعدیش (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەم گریانە چییە ؟ فەرمووی: ئەمە سۆزوڕەحمە خودا دەیخاتە دڵی بەندەکانی خۆیەوە، وەخودای گەورە لەناو بەندەکانی خۆیدا تەنیا ڕەحم بەوانەیان دەکات، کە بەڕەحم و میهرەبانن).
(تاج/١/ ١/٥٨٨- ش/د/ن).

### ڕاڤەو شیکردنەوە:

پەندو عیبرەت لەم جۆرە فەرمودانەدا ئەوەیە کە موسوڵمان لە هەموو بۆنەو کاتێکا، پێغەمبەر بکا بەسەر مەشق. ئیسلام حەزدەکا کە موسوڵمان گەشبین بێ، ڕەشبین نەبێ، هەمیشە لەگەڵ خەڵکا ڕوو خۆش و قسە شیرین و

ڕەفتار جوان و گراوەبێ، چەندەی لە تواناداپە هەوڵ بدات کە باریان سووك بکا. خەمیان بڕەوێنێتەوە، ببێ بەمایەی سەبوری خەم و پەژارەیان، پاداشی باشی گەورەی خۆیان لای خوا یاد بخاتەوە، بۆ ئێمە لەم سەردەمە ناسکەدا، کە هەوری خەم وەك توێژاڵی تەم باڵی کێشاوە بەسەر مینای دڵ و دەروونی هەموو کوردێکی مەردو موسوڵمانی پاکدا، عەرزی خوشك و برایان دەکەم، کەنائومێد نەبن، جڵەوی صەبروشەکیبایی‌و خۆگریی، لەکاتی لێقەومانی کارەسات و ڕووداوی دڵتەزێندا لەدەست نەدەن، تەسلیم بەخەم و خەفەت و ڕەشبینی نەبن. بابزانن کە کاری موسوڵمان هەموو هەرخێرە، هەرچی تووشی موسوڵمان دەبێ، دەبێ بەمایەی ڕەحمەت، دەبێ ئەوانەی کە ئازیزێکیان لە دەست دەچێ، پێغەمبەری ئازیزو نازدار بکەن بەپێشەواو سەرمەشق بۆ خۆیان، لەڕاستیدا ئەو هەموو ئازیز مردن و ناخۆشیی و زەحمەتەی کە بەسەر پێغەمبەردا -دروودی خوای لەسەر بێ- هاتووە، بۆ ئەوەیە کە یەك بەیەك ڕووداوەکانی ژیانی پێغەمبەر، ببن بەسەر مەشق بۆ ئێمە، پێغەمبەری خوا -دروودی خوای لەسەر بێ- لە سکی دایکی‌دا باوکی دەمرێ، لەهەتیوی دەرناچێ دایکی دەمرێ، هەروا باپیرەی ـ کە دالدەی بووە ـ ئەویش دەمرێ، لە شەش منالێ، پێنجیان لە پێش خۆیدا دەمرن، وەك ئیمامی جەزەری لە (ذات الشفاء) دا دەفەرمووێ:

**وَكُلُّهُم قَدْ مَاتَ فِي حَيَاتِهِ   إلاَّ البَتُولَ فَاطِمَ وَفَاتِهِ**

**واتە:**

**منالی، یەک یەک، بەر لەخۆی مردن   بەس فاتیمە ما، تا وەفات کردن**

حیکەمەتێکی تری ئەم لایەنەی ژیانی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ئەوەیە: کە کەس نەڵێ: ئەم منالەمان شووم بوو، یاپێی ڕەش بوو، یا ئەمە سەرەخۆرەیە، سەری باوکی خوارد، یا گوتەی بێ بایەخی تری لەم بابەتە.

پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (لاَ طَـيرَةَ وَخَيْرُهـا اَلفَـأْلُ): (نـە نوقلاّنەی خراپ هەیەو، نە پێ ڕەشی و بەدقوومی هەیە، بەلاّم باشترین نوقلاّنە نوخشە لێدانـە). کەواتـە دروستـە بڵێین: ئـەم منداڵە سـەری بـە ڕزقـە، یـا ئـەم دوکانە پێوقدومی باشە! یا من چووم بۆ حـەج نوخـشەش بـێ لـە تـۆش، چونکە ئەمەیان زیانی بۆ کـەس نییـە، بـەڵکوو دەبـێ بـەهۆی خۆشەویـستی زیـاتر. وەك ئەوەی کە حەلیمەی سـەعدییە پێغەمبـەری بـردەوە، بۆیـان بـوو بـەهۆی گوشـاد بوونی رزق و رۆزی. لە مامۆستا بەڕێزەکانی خـۆمم بیـستووە، لـەولاّتی خۆمانـا، پیرەژنی خواناسی وابووە کاتێ سوڵتان لەئەستەمبوڵ گۆڕاوە، ئـەو لێـرە هەسـتی پێکردووە، بەوەدا کە مانگا شیردەرەکەی، بەرەکەت کەوتووەتە شیری !

٥٣٢- عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْـنِ عُمَـرَ (رضـى الله عـنهمـا) قَـالَ: اشْـتَكَى سَـعْدُ بْـنُ عُبَادَةَ، شَكْوَى لَهُ، فَأَتَاهُ رَسُولُ اللّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَعُودُهُ مَعَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْـنِ عَوْفٍ وَسَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رضي الله عـنهم) فَلَمَّـا دَخَـلَ عَلَيْـهِ وَجَدَهُ فِي غَشِيَّةٍ أَهْلِهِ، فَقَالَ: « أَقَدْ قَضَى؟». قَالُوا: لاَ، يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَبَكَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَلَمَّـا رَأَى الْقَـوْمُ بُكَـاءَ رَسُـولِ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسـلم) بَكَوْا، فَقَالَ: « أَلاَ تَسْمَعُونَ؟ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُعَذِّبُ بِـدَمْعِ الْعَـيْنِ، وَلاَ بِحُـزْنِ الْقَلْـبِ، وَلَكِـنْ يُعَذِّبُ بِهَـذَا - وَأَشَـارَ إِلَـى لِـسَانِهِ - أَوْ يَـرْحَمُ وَإِنَّ الْمَيِّـتَ يُعَـذَّبُ بِبُكَـاءِ أَهْلِـهِ عَلَيْـهِ». {الحديث: ٢١٣٤ = ٢١٠٨ فم. تجريد/٢/٥٢ رقم: ٦٢٧ = ١٣٠٤ فتح}:[٥٣٢]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: جارێ سـەعدی کـوڕی عوبـادە نـەخۆش بـوو، پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) ڕۆیـشت بـۆ سـەرلێدانی، عەبـدوڕەحمانی کـوڕی عـەوفو سـەعدی کـوڕی ئـەبو وەقـاصو عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودیشی لەگەڵ بوون، کە پێغەمبـەر (درووودی خـودای

[٥٣٢] تجريد/٢، ژمارە: ٦٢٧ - بخاری: ١٣٠٤، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٤٦٢ = ٢١٣٤.

لەسەر بێ) رۆیشتە ژوورەوە بۆلای، روانی بووراوەتەوەو پەلو پۆی شکاوەو کەسوکارەکەی دەورەیان داوە، جا فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئایا ماوە یا مردووە؟). گوتیان: ئەی پێغەمەری خودا! هێشتا ماوە، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی کرد بە گریان، کاتێ خەڵکەکەیش کە دییان وا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەگری، ئەوانیش گریان، جا فەرمووی: (گوێتان لێ بێ: خودا لەسەر فرمێسکی چاوو لەسەر خەمو پەژارەی دڵ، ئازارو سزاتان نادا، بەلام بەهۆی ئەم زمانەوە سزاتان دەدا: ئەگەر شیوەنو نا سوپاسی پێ بکەن، یا رەحمتان پێ دەکا، ئەگەر لەکاتی سەختیو قۆرتو کۆستدا قسەی باشی پێ بکەن، وەك ئەوە بڵێن: إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ). ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (مردوو لەگۆڕا بەهۆی گریانی کەسوکاری لەسەری، سزادەدرێ). (١٥٦/٢). {بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ١٩٧، ژمارە: ١٠٣٦} + {ریاض/٢، لاپەڕە: ٣٥٦، زنجیرە: ١٥٣، ژمارە: ٩٢٥}.

### (٨) باب: في الصبر على المصيبة عند أول الصدمة
### ئەو سەبرو ئارامەی کە خودا پێی خۆشە لەسەر ناخۆشیو دەردو بەلا بگیرێ، دەشێ لەسەرتای خۆرپەلێکەوتنەوە بێت

٥٣٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَتَى عَلَى امْرَأَةٍ تَبْكِي عَلَى صَبِيٍّ لَهَا، فَقَالَ لَهَا: « اتَّقِى اللَّهَ وَاصْبِرِى ». فَقَالَتْ: وَمَا تُبَالِى بِمُصِيبَتِى، فَلَمَّا ذَهَبَ، قِيلَ لَهَا: إِنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَأَخَذَهَا مِثْلُ الْمَوْتِ، فَأَتَتْ بَابَهُ، فَلَمْ تَجِدْ عَلَى بَابِهِ بَوَّابِينَ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَمْ أَعْرِفْكَ، فَقَالَ: « إِنَّمَا الصَّبْرُ عِنْدَ أَوَّلِ صَدْمَةٍ ». أَوْ قَالَ: « عِنْدَ أَوَّلِ الصَّدْمَةِ

». {الحـديث: ٢١٣٧ = ٢١١١ فـم. تجريـد/١/٤١، رقـم: ٦١٥ = ١٢٨٣، ١٢٥٢، ١٢٨٣، ١٣٠٢، ٧١٥٤}: [٥٣٣]

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ژنێك لەسەر گۆڕی منالێکی خۆی دەگریا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلایەوە ڕەت بوو پێی فەرمووی: ژنەکە! لەخودا بترسەو ددان بەخۆتا بگرەو ئارام بگرە، لەبەر باری خودادا). ژنەکەیش نەیناسی کە ئەوە پێغەمبەرە، گوتی پێی: بەولاوە تۆ ئاگات لە دەردی من نییە، جا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆیشت، بە ژنەکەیان گوت: ئەوە پێغەمبەر بوو، چۆن ئەو قسە ڕەقەت دا لەڕووی؟! ئەویش لە تەریقیدا، سام گرتی وەك بمرێ وابوو، جا ژنەکە بۆ عوزر خوایی، چوو بۆ ماڵی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) روانی کە دەرکەوانی لێ نییە، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لێم مەگرە، کە ئەو قسە ڕەق‌و زەقەم کرد لەڕووی تۆدا، بمبوورە نەمناسیت فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەو صەبرو ئارام‌و خۆڕاگرتنەی کە خودا پێی خۆشە، دەبێ لەسەرەتای خورپە لێکەوتنەوە بێت). {تاج/١/٥١٨، زنجیرە: ١٩٨، ژمارە: ١٠٤٠} + {ریاض/١/٥٤، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٣١}.

---

[٥٣٣] تجرید/١، ژمارە: ٦١٥، بخاری: ١٢٨٣، مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٤٥٩ = مسلم: ٢١٣٧ شیحا.

## (٩) باب: الميت يعذب ببكاء أهله عليه

## مردوو سزا دەدرێ بەهۆی هەندێ لەو گریانەی کە کەس و کارەکەی لەسەری دەگرین

٥٣٤- عَنْ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِنَّ الْمَيِّتَ يُعَذَّبُ بِبَعْضِ بُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ) (الحديث ١٢٨٧- طرفاه في: ١٢٩٠- ١٢٩٢).

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ: فَلَمَّا مَاتَ عُمَرُ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعَائِشَةَ (رضى الله عنها) فَقَالَتْ: رَحِمَ اللّٰهُ عُمَرَ، وَاللّٰهِ مَاحَدَّثَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ اللهَ لَيُعَذِّبُ الْمُؤْمِنَ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ، وَلَكِنْ رَسُوْلُ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِنَّ اللّٰهَ لَيَزِيدُ الْكَافِرَ عَذَابًا بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ) وَقَالَتْ: حَسْبُكُمْ الْقُرْآنُ: (وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى). (الحديث ١٢٨٨ - طرفاه في ١٢٨٩- ٣٩٧٨):[٥٣٤]

کاتێ پێشەوا عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) پێکرا، صوهەیب (ڕەزای خوای لێ بێ) هاواری لێ هەڵسا دەیگوت: ئای براڕۆ ! عومەریش فەرمووی: ئەوە چۆن وادەڵێیت، ئەدیی نازانی کە پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ڕێگەی شتی وای نەداوە، ئەوەتا دەفەرموێ: (مردو لەگۆڕدا سزا دەدرێ بەهۆی هەندێ لەو گریانەوە کە کەس و کارەکەی لەسەری دەگرین).

ئیبنوعەباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) بەو پێکرانە مرد، قسەکەی عومەرم گێڕایەوە بۆ عائیشە: کە گوایە مردو سزا دەدرێ لەسەر ئەو گریانەی کە کەسوکارەکەی بۆی دەکەن، عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ڕەحمەتی خوا لە عومەر، عومەر پیاوی درۆ نەبوو، بەڵام یا باش لە یادی نەماوە، یا بە هەڵەدا چووە، چونکە بەخودا پێغەمبەر

[٥٣٤] تجرید/١، ژمارە: ٦١٨، لاپەڕە: ٥٥، بخاری: ١٢٩٠، ١٢٨٩، ٣٩٧٨، مسلم: ٩٢٧ = ٢١٤٠.

(دروودی خودای لەسەر بێ)و سەروماڵ و حاڵ و هەست و نەست بەقوربانی گەردی سەرگۆڕی پیرۆزی بێ - وەهای نەفەرموو، نەیفەرموو کە موسوڵمان بەهۆی گریانی کەسوکاری لەسەری ئێش وئازار دەدرێ، بەڵام فەرمووی -دروودی خوای لەسەر بێ- : (کافرو بێبڕوا کە کەسوکاری بۆی دەگرین، خودا بەهۆی ئەوەوە ئەوەندەی تر ئێش و ئازاری گرانتر دەکا). عائیشە فەرمووی: دەقی ئایەتی قورئانتان بەسە بۆ شایەتی ڕاستی و دروستی ئەم قسەی من، کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَـزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْـرَى/ الانعام /٦/١٦٤ واتە: هیچ کەسێ با گوناهباریش بێ، باروگوناهی کەسێکی تر، جگە لە خۆی هەڵناگرێ﴾. (بڕ: تاج/١/٣/٥٢٧ + ز – ١٩٦، ز ١٩٧، ١٩٨) + (فقهی ئاسان بەرگی /١ لاپەڕە /٢٧٥).

٥٣٥– وَعَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {اَلْمَيِّتُ يُعَذَّبُ فِي قَبْرِهِ بِمَا نِيحَ عَلَيْهِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. {تجریدی بوخاری = پوختەی بوخاری = مختصر صحيح البخاری/٢، ژمارە: ٦١٨ = ١٢٨٧، ١٢٩٠، ١٢٩٢، بوخاری. شیحا ٢١٤٠ = مسلم ٩٢٧. بڕوانە: پوختەی موسلیم ژمارە: ٤٦٥ = ٢١٥٣ شیحا}: [٥٣٥]

ئەم فەرموودەیە لە تجریدی بوخاریدا ئاوایە:

کاتێ پێشەوا عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) پێکراو ئەبو لوئلوئەی مەجووسی لەبەرنوێژیی نوێژی بەیانیدا، لەمزگەوتەکەی پێغەمبەردا، چەند برینێکی کاریگەرو سەختی لێ کرد، کەبوون بەهۆی شەهید بوونی، صوهەیبی ڕۆمی هاواری لێ هەڵسا دەیگوت: ئای براڕۆ! عومەریش فەرمووی: ئەوە چۆن وادەڵێیت، ئەدی نازانی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی شتی

---

[٥٣٥] تجرید/٢، ژمارە: ٦١٨ = ١٢٨٧، مسلم: ٩٢٧ = ٢١٥٣، شیحا + شەرحی بلوغ المرام/٢، ژمارە: ٦١٢، لاپەڕە: ٥٦، چ/١.

وای نەداوە، ئەوەتا دەفەرموێ: (مردوو لەگۆڕەکەیدا، بەهۆی ئەو گریانەوە کە لەسەری دەکرێ، ئێش‌و ئازار دەدرێ).

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: کاتێ عومەر (رەزای خودای لێ بێ) بەو پێکرانە مرد، قسەکەی عومەرم گێڕایەوە بۆ عائیشە: کەگوایە مردوو سزاو ئەشکەنجە دەدرێ لەسەر ئەو گریانەی کە کەسوکارەکەی بۆی دەکەن).

عائیشە (رەزای خودا لەهەموویان بێ) فەرمووی: رەحمەتی خودا لە عومەر، عومەر پیاوی درۆ نەبوو، بەڵام یان باش لەیادی نەماوە، یان بەهەڵەدا چووە، چونکە بەخودا پێغەمبەر (دروودو سڵاو سەڵاواتی خوداو فریشتەو پەری‌و مرۆڤی لەسەر بێ‌و، سەرو ماڵ‌و حاڵ‌و منداڵ‌و هەست‌و نەست گشتی بەقوربانی گەردی سەرگۆڕی پیرۆزی بێ) وەهای نەفەرموو، نەی فەرموو کە موسوڵمان بەهۆی گریانی کەسوکاری، ئێش‌و ئازار دەدرێ، بەڵام فەرمووی: کافرو بێباوەڕ کە کەسوکاری بۆی دەگرین، خودا بەهۆی ئەوەوە ئەوەندەی تر ئێش‌و ئازاری گرانتر دەکا!!).

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەقی ئایەتی قورئانتان بەسە، بۆ بەڵگەو شایەتی راست‌و دروستی ئەم قسەیەی من، کە بەدەق دەفەرموێ: {وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى – الأنعام/١٦٤}.

واتە: (هیچ کەسێ، باگوناهباریش بێ، باروگووناهی کەسێکی تر، جگە لەباروگوناهی خۆی، هەڵناگرێ!). {تاج/١، زنجیرە: ١٩٦، ژمارە: ١٠٣٣ + زنجیرە: ١٩٧و ١٩٨ + فیقهی ئاسان بەرگی/١، لاپەڕە/٢٧٥ + تجرید/٢، ژمارە: ٦١٩و ٦٢٠}.

٥٣٦- عن عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ عُبَيْدِ اللّٰهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ : تُوُفِّيَتِ ابْنَةٌ لِعُثْمَانَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ بِمَكَّةَ وَجِئْنَا لِنَشْهَدَهَا – قَالَ – وَحَضَرَهَا ابْنُ عُمَرَ وَابْنُ عَبَّاسٍ وَإِنِّي

لجَالِسٌ بَيْنَهُمَا – قَالَ – جَلَسْتُ إِلَى أَحَدِهِمَا ، ثُمَّ جَاءَ الآخَرُ فَجَلَسَ إِلَى جَنْبِي فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ لِعَمْرِو بْنِ عُثْمَانَ : أَلاَ تَنْهَى النِّسَاءَ عَنِ الْبُكَاءِ فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم– قَالَ :« إِنَّ الْمَيِّتَ لَيُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ ». فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ : قَدْ كَانَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَقُولُ بَعْضَ ذَلِكَ ، ثُمَّ حَدَّثَ قَالَ : صَدَرْتُ مَعَ عُمَرَ مِنْ مَكَّةَ حَتَّى كُنَّا بِالْبَيْدَاءِ إِذَا هُوَ بِرَكْبٍ تَحْتَ ظِلِّ سَمُرَةٍ فَقَالَ : اذْهَبْ وَانْظُرْ مَنْ هَؤُلاَءِ الرَّكْبِ – قَالَ – فَنَظَرْتُ فَإِذَا هُوَ صُهَيْبٌ فَأَخْبَرْتُهُ قَالَ : ادْعُهُ لِي فَرَجَعْتُ إِلَى صُهَيْبٍ فَقُلْتُ : ارْتَحِلْ فَالْحَقْ أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ. فَلَمَّا أُصِيبَ عُمَرُ دَخَلَ صُهَيْبٌ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَبْكِي يَقُولُ : وَاأَخَاهُ وَاصَاحِبَاهُ فَقَالَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ : يَا صُهَيْبُ أَتَبْكِي عَلَيَّ وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– :« إِنَّ الْمَيِّتَ لَيُعَذَّبُ بِبَعْضِ بُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ ». قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ : فَلَمَّا مَاتَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا فَقَالَتْ : رَحِمَ اللَّهُ عُمَرَ وَاللَّهِ مَا حَدَّثَ رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– إِنَّ اللَّهَ يُعَذِّبُ الْمُؤْمِنَ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ وَلَكِنْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– :« إِنَّ اللَّهَ لَيَزِيدُ الْكَافِرَ عَذَابًا بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ ». قَالَ وَقَالَتْ عَائِشَةُ : حَسْبُكُمُ الْقُرْآنُ (وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى) قَالَ وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ عِنْدَ ذَلِكَ : وَاللَّهُ أَضْحَكَ وَأَبْكَى قَالَ ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ : فَوَاللَّهِ مَا قَالَ ابْنُ عُمَرَ شَيْئًا.[٥٣٦]

**عەبدوڵڵای کوڕی عوبەیدوڵڵای کوڕی ئەبو مولەیکە، فەرمووی: کچێکی عوسمانی کوڕی عەففان، ناوی ئوم ئەبانی کچی عوسمان بوو، لە مەککە مرد، ئێمەیش چووین هەتا ئامادەی تەرمەکەی ببین، ئیبنو عومەرو ئیبنو عەبباسیش ئامادەی سەر تەرمەکە بوو بوون، من لەنێوانی هەردووکیانا دانیشتبووم (یا گوتی: من لەلای یەکێکیانا دانیشتبووم، ئەویتریشیان هات لەپاڵ منا دانیشت) عەمری کوڕی عوسمانیش لەلای ئیبنو عومەر بوو، لەوکاتەدا**

**[٥٣٦] تجريد/٢، ژمارە: ٦١٨، بخارى: ١٢٨٨، ١٢٨٧، مسلم: ٩٢٧، ٩٢٨ = شيحا: ٢١٤٦.**

دەنگی گریان لەناوماڵەکەدا بەرزەوە بوو، ئیبنو عومەریش، وەك بەعەمری کوڕی عوسمان بڵێ، فەرمووی: ئەوە بۆ جڵەوگیری لەگریان ناکەیت، چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەم بارەیەوە دەفەرموێ: (مردوو لەگۆڕەکەیدا، سزادەدرێ بەهۆی ئەو گریانەوە کە کەس‌وکارەکەی لەسەری دەگرین).

ئیبنو عەبباسیش (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: (کاتی خۆشی عومەری کوڕی خەتتابیش هەندێ شتی لەم بابەتە دەگوت).

ئەوجا ئیبنو عەبباس فەرمووی: جارێ لەخزمەت عومەردا لەمەککە دەرچووین بۆ حەج، هەتا گەیشتینە دەشتی بەیداء، عومەر روانی وا کۆمەڵێ سوار لەژێر سێبەری دار (سەمووره)یەکا دابەزیون، فەرمووی پێم: بڕۆ بزانە، ئەمانە کێن، کەوان لەبن ئەو شێخەڵەدا، فەرمووی: منیش چووم، کە تەماشام کرد صوهەیبو خێزانەکەیەتی. هاتمەوە پێیم گوت: کە ئەوانە صوهەیبو خێزانەکەیەتی. عومەر فەرمووی: بچۆ پێی بڵێ: با بێت لەگەڵمان بۆ ئەم حەجە.

جا کە لەحەجەکە گەڕاینەوە ئەوەندەی پێ نەچوو کە عومەر پێکرا، صوهەیب چوو بۆڵای‌و دەستی کرد بەگریان، دەیفەرموو: هەی براڕۆ! وای هاوڕێ عەزیزەکەم ڕۆ؟!

عومەریش (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی بەصوهەیب: ئەی صوهەیب! مەگری بۆمن، چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودا سزای مردووی موسوڵمان دەدا بەهۆی گریانی کەسوکاری لەسەری).

ئیبنو عەبباس فەرمووی: کاتێ عومەر مرد، ئەم قسانەی عومەرم گێڕایەوە بۆ عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (ڕەحمەتی خودا لە

عومــەر بــێ، عومــەر پیــاوی درۆ نــەبوو، وا دەرئەکــەوێ کــە یــان بــاش لــە فەرموودەکـەی پێغەمبـەر حـاڵی نـەبووە، یـان لـەیادی نـەماوە، چـونکە بـەخودا پێغەمبەر قسەی وای نەفەرمووە، کە بفەرموێ: (خودا سزای موسوڵمانی مـردوو دەدا، بەهۆی گریانی کەسوکارەکەی لەسـەری) پێغەمبـەر شـتی وای نەفـەرمووە، بەڵکوو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (خـودا سـزای مـردووی بـێ بـڕوا زیـاتر دەدا بـەهۆی گریـانی کەسـوکارەکەی لەسـەری!) ئـەوجا عائیـشە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: دەقـی ئایـەتی قورئانتـان بەسـە بـۆ بەڵگـەی ڕاستیو دروستی ئەم قسەی من، کە قورئـان بـەدەق دەفـەرموێ: {وَلاَ تَـزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى/ الأنعام : ١٦٤} واتە: (هیچ کەسێ، با گوناهباریش بێ، بارو گوناهی کەسێکی تر، جگە لەخۆی هەڵناگرێ)

ئەوجا ئیبنـو عـەبباس (ڕەزای خـودای لێ بـێ) بـە ئیقتیبـاس لـە ئایـەتی {وَأَنَّـهُ هُـوَ أَضْـحَكَ وَأَبْكَـى/ الـنجم : ٤٣} لـە پـاش گێڕانـەوەی بۆچـوونەکەی عائیشە، بۆ پشتیوانی قسەکانی عائیشە فـەرمووی: خـودا خـۆی هـۆی پێکـەنینو گریان دەسازێنێ، ئیتر چۆن لەسەر پێکـەنین، یـان لەسـەر گریـان سـزای بەنـدەی خۆی دەدا؟!

ئیبنو ئەبومولەیکە فەرمووی: بەخودا ئیتر ئیبنو عومەر (ڕەزای خـودای لێ بێ) هیچی نەگوت، وەك بڵێی ئەویش چووبێتە سەر قسەکەی عائیشە!

(تێبینی):

بەبۆچوونی بەندەی هەژارۆکە، ئەو ئایەتەی کە خاتوو عائیشە دەیکا بە بەڵگەی بۆچوونو داواکەی، لەدژیەتی، لـە بەرژەوەنـدی نییـە، چـونکە ئایەتەکـە بەڵگـەی ئەوەیـە، هەرکەسـێ موسـوڵمان بـێ، یـا ناموسـوڵمان، خـۆی بەرپرسـیارە لەکارو کردەوەی خۆی، وەکەس تاوانی کەسێکی تر هەڵناگرێ.

**جا بەبێ گومان، مەبەست لەم فەرموودەیە ئەم دوو بەهرەیەیە:**

**یەکـەم:** هەڕەشـەکردن لەشـین‌و شـەپۆڕو گریـەو زاری، چـونکە شـتی وا، هیچ سوودێکی نییەو کاریێ ناژیاریو نـا شارسـتانـیـیـەو زیـانی هەیـەو قـازانجی نییە.

**دووەم:** کەسێ راسپێرێ: کە لەپاش مـەرگی، شـین‌و شـەپۆڕی بۆبکـەن، یـا شتی تری بێ شەرعی بۆ بکەن، ئەوە بەبێ گومـان لەسـەر ئـەو شـین‌و شـەپۆڕەی کە دەکرێ لەسەری، سزاو ئەشکەنجە دەدرێ لە گۆڕەکەیدا. ((وەرگێڕ))

٥٣٧- عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ ابْنَ عُمَرَ يَرْفَعُ إِلَى النَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم- « إِنَّ الْمَيِّتَ يُعَذَّبُ فِي قَبْرِهِ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ ». فَقَالَتْ وَهَلَ إِنَّمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « إِنَّهُ لَيُعَذَّبُ بِخَطِيئَتِهِ أَوْ بِذَنْبِهِ وَإِنَّ أَهْلَهُ لَيَبْكُونَ عَلَيْهِ الآنَ ». وَذَاكَ مِثْلُ قَوْلِهِ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَامَ عَلَى الْقَلِيبِ يَوْمَ بَدْرٍ وَفِيهِ قَتْلَى بَـدْرٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ فَقَالَ لَهُمْ مَا قَالَ « إِنَّهُمْ لَيَسْمَعُونَ مَا أَقُولُ ». وَقَدْ وَهَـلَ إِنَّمَـا قَـالَ « إِنَّهُمْ لَيَعْلَمُونَ أَنَّ مَا كُنْتُ أَقُولُ لَهُمْ حَقٌّ ». ثُمَّ قَرَأَتْ (إِنَّكَ لاَ تُـسْمِعُ الْمَـوْتَى) ( وَمَـا أَنْتَ بِمُسْمِعٍ مَنْ فِي الْقُبُورِ) يَقُولُ حِينَ تَبَوَّءُوا مَقَاعِدَهُمْ مِنَ النَّارِ.[٥٣٧]

عوروە (رەحمەتی خودای لێ بێ) فـەرمووی: گـوترا بـە عائیـشەی پـوورم، کـە ئیبنـو عومـەر دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرموویـەتی: (مـردوو لەگۆڕەکەیـدا، بـەهۆی گریـانی کەسوکارەکەیەوە، کـەبۆی دەگرین، لەسەر ئەوە سزاو ئەشکەنجە دەدرێ!)

عائیشە فەرمووی: سۆزو میهرەبانی خودا لە ئیبنو عومـەر! لەمـەدا لێـی تێك چووەو تێکەڵ‌و پێکەڵی کـردووە، پێغەمبـەر ئـاوای فـەرموو: (ئـەو مـردووە

---

[٥٣٧] بخاری: ٣٩٧٨، مسلم: ٢١٥٠ شیحا.

بەهۆی تاوانو گوناهەکانیەوە، لەناو گۆڕەکەیدا سزا دەدرێ، کەسوکارەکەیشی ئێستا بۆی دەگرین!)

ئەوجا عائیشە فەرمووی: عومەر ئەم قسەیەیشی وەك ئەو قسەی تری وایە کە دەڵێ: لەغەزای بەدردا، لەپاش سەرکەوتنی موسوڵمانان بەسەر بێباوەڕاندا، کەلاکی کوژراوەکانی قورەیشیان توورِدایە ناو بیرێ لە بیرەکانی بەدر، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ڕۆیشتە سەر قەراخی ئەو بیرەو یەکە یەکە بانگی دەکردن، ئەی فیساری کوڕی فیسار! ئەی ئەوەو ئەوە! ئایا پەشیمانیتان حاسڵ کردو ئێستاخۆزگە دەخوازن کە ئەم پەندەتان بەخۆتان نەدایە.......تاد.

عومەریش عەرزیکرد: قوربان! قسەی چی لەگەڵ جەستەی بێ گیاندا دەکەیت؟ عومەر دەڵێ: لە وەڵامی ئەم پرسیارەی مندا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (درودی خودای لەسەر بێ) (بەخودا ئێستا ئەوانیش وەك ئێوە ئاوا گوێیان لەم قسانەی منە، بەڵام ئەوەندە هەیە کە ناتوانن وەڵام بدەنەوە!).

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وای نەفەرموو، بەڵکوو ئاوای فەرموو: (ئێستا ئەوان باش باش دەزانن، کە ئەوەی کە من پێیانم دەگوت ڕاستو دروستە).

ئەوجا عائیشە بۆ پشتیوانی ئەم بۆچوونەی خۆی ئەم دوو ئایەتەی خوێندەوە، کە یەکەمیان دەفەرموێ: {إِنَّكَ لاَتُسْمِعُ المَوْتَي: ئەی موحەممەد! تۆ ناتوانیت کە شت بەمردووان ببیستی} وە ئایەتی دووەم کە دەفەرموێ: {وَمَا أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي الْقُبُورِ/فاطر : ٢٢} واتە: دەنگی تۆ ناگات بەکەسێ لەناو

**گۆڕدا بێ، فەرمووی: دیارە مەبەست ئەوکاتەیە، کە کافرەکان لەناو ئاگردا جێنشین دەبن!**

**ئەمەیش داستانی ئەم بێباوەڕانەیە:**

**عَنْ ابِي طَلْحَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّ نَبِيَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) امَرَ يَوْمَ بَدْرٍ بارْبَعَةٍ وَعِشْرِينَ رَجُلا مِنْ صَنَادِيدِ قُرَيْشٍ فَقُذِفُوا فِي طوِيّ مِنْ اطوَاء بَدْرٍ خَبِيث مُخْبِث وَكَانَ اذا ظهَرَ عَلَى قَوْمٍ اقَامَ بالْعَرْصَةِ ثلاث لَيَالٍ فَلَمَّا كَانَ بِبَدْرٍ الْيَوْمَ الثالِث امَرَ بِرَاحِلَتِهِ فَشُدَّ عَلَيْهَا رَحْلُهَا ثمَّ مَشَى وَاتَّبَعَهُ اصْحَابُهُ وَقَالُوا: مَا نُرَى يَنْطلِقُ الا لِبَعْض حَاجَتِهِ حَتَّى قَامَ عَلَى شَفَةِ الرَّكِيِّ فَجَعَلَ يُنَادِيهِمْ باسْمَائِهِمْ وَاسْمَاء ابائِهِمْ يَا فُلانُ بْنَ فُلان وَيَا فُلانُ بْنَ فُلانٍ ايَسُرُّكُمْ انَّكُمْ اطعْتُمْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَانَّا قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا) قَالَ: فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا تُكَلِّمُ مِنْ اجْسَادٍ لا ارْوَاحَ لَهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): وَالَّذي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ مَا انْتُمْ باسْمَعَ لِمَا اقُولُ مِنْهُمْ) (الحديث: ٣٩٧٦)[٢].**

**ئەبو طەلحە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) لە ڕۆژی بەدردا، فەرمانی فەرموو لاشەی بیست و چوارکەسیان لەگەورە پیاوانی قوڕەیش، کە لەغەزای بەدردا کوژرا بوون، برك دایە ناو بیرێ لەبیرەکانی بەدرەوە کە بەبەرد هەڵچنرابوون، بەڕاستی تابڵێی بیرێکی پیس و چەپەڵ بوو، پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) دەستووری وابوو کە خودا سەری دەخست بەسەر هۆزێکا سێ شەو لەو مەیدانەدا، لەدەشتایی بەرمالان دا دەمایەوە، لە غەزای بەدریش دا لە ڕۆژی سێیەمی زاڵبوونی دا، فەرمانی فەرموو وشترەکەیان بۆ کۆپان کرد، ئەوسا سواربوو و ڕۆیشت و، یارانی شوێنی کەوتن و**

---

**(٢) اخرجه مسلم في الجنة وصفة نعيمها واهلها ، باب: عرض مقعد الميت من الجنة و النار عليه ، رقم: ٢٨٧٥ .**

گوتیان: ببێ و نەبێ بۆ کارێکی تایبەتی خۆی دەچێ، خەشەویست (دروودی خودای لێ بێ) سواربوو، ڕۆیشت هەتا چووە سەر لێواری بیرەکەو، لەوێ ڕاوەستاو دەستی کرد بە بانگ کردنی کافرە کوژراوەکانی ناو بیرەکەو یەکە یەکە بەناوی خۆیان و بەناوی باوکیانەوە بانگی دەکردن و دەیفەرموو: (ئەی فیساری کوڕی فیسار! ئەی ئەوەو ئەی ئەوە! ئایا پەشیمانیتان حاسڵ کردو، ئێستا خۆزگە دەخوازن کە ئەم پەندەتان بەخۆتان نەدایە، وە لە دنیادا موسوڵمان ببونایەو، لە فەرمانی خودا و پێغەمبەری خودا دەرنەچوونایەو، ئەم ڕۆژی ڕەشەتان بەسەرخۆتان نەهێنایە، دەی بزانن ئەوا ئێمە لە سایەی خواوە بە ئاواتی خۆمان گەیشتین و ئەو مژدەو بەڵێنەی کە خودای خۆمان وا دەی پێ دابووین دەستمان کەوت و بە چاوی خۆمان دیمان، دیارە ئێوەش بەتوڵەی سەختی کاری بەدی خۆتان گەیشتوون و ئەو هەڕەشەو ئێش و ئازارەی کە خودا وادەی ئەوەی پێیتان دابوو، بەچاوی خۆتان دیتان، عومەر(ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: قوربان! قسەی چی لەگەڵ جستەی بێ گیاندا دەکەی؟ فەرمووی: (بەو خودایەی کەرۆحی من والە دەستیدا، ئەوانیش وەك ئێوە ئاوا گوێیان لەم قسانەی منە، بەڵام ئەوەندە هەیە کە ناتوانن وەڵام بدەنەوە) (تاج/٨ ل/٢٠٠ ز/٨٤ ف/٦- باسی غەزای بەدر).

٥٣٨- عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ (رضى الله عنها): أَنَّهَا سَمِعَتْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) - وَذُكِرَ لَهَا أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ يَقُولُ: إِنَّ الْمَيِّتَ لَيُعَذَّبُ بِبُكَاءِ الْحَيِّ - فَقَالَتْ عَائِشَةُ: يَغْفِرُ اللَّهُ لأَبِى عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَمَا إِنَّهُ لَمْ يَكْذِبْ، وَلَكِنَّهُ نَسِىَ أَوْ أَخْطَأَ، إِنَّمَا مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلَى يَهُودِيَّةٍ يُبْكَى عَلَيْهَا، فَقَالَ: « إِنَّهُمْ لَيَبْكُونَ عَلَيْهَا، وَإِنَّهَا لَتُعَذَّبُ فِى قَبْرِهَا ». {الحديث: ٢١٥٣ = ٢١٢٦ فم.

تجريد/٢/٤٥، رقم: ٦١٩ = ١٢٨٩. ترمذي. جنائز: ١٠٠٦. نسائي. جنائز: ١٨٥٥. تحفة الأشراف: ١٧٩٤٨}:(٥٣٨)

عەمرەی کچی عەبدورەحمان (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: کاتێ ئەو قسەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەریان گێڕایەوە بۆ عائیشە، (رەزای خودا لەهەموویان بێ)، کە گوایە عەبدوڵڵا گوتوویەتی: (مردوو سزا دەدرێ لەسەر ئەو گریانەی کە زیندووو لەسەری دەگری) عائیشە فەرمووی: خوا لە ئەبو عەبدورەحمان واتە: لە ئیبنو عومەر خۆش بێ، ئەو پیاوی درۆ نییە، کەشتی وا بەدەم پێغەمبەرەوە دەڵێ، بەڵام یا باش لەیادی نەماوە، یا بەهەڵەدا چووە، چونکە شتەکە خۆی وابوو: جارێ پێغەمبەر (درروودی خودای لەسەر بێ) لەلای گۆڕی ژنە جوولەکەیەکەوە رەت بوو، کەسوکارەکەی لەسەری دەگریان، فەرمووی: (سەیرە! ئەوان لەسەری دەگرین، کەچی ئەویش لە گۆڕەکەیدا سزا دەدرێ). {تاج/١، ژمارە: ١٠٣٣}.

٥٣٩- وَعَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {الْمَيِّتُ يُعَذَّبُ فِي قَبْرِهِ بِمَا نِيحَ عَلَيْهِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. {تجريدی بوخاری = پوختەی بوخاری = مختصر صحيح البخاری/٢، ژمارە: ٦١٨ = ١٢٨٧، ١٢٩٠، ١٢٩٢، بوخاری. شيحا ٢١٤٠ = مسلم ٩٢٧. بڕوانە: پوختەی موسليم ژمارە: ٤٦٥ = ٢١٥٣ شيحا}:(٥٣٩)

ئەم فەرموودەیە لە تجریدی بوخاریدا ئاوایە:

(٥٣٨) تجريد/٢، ژمارە: ٦١٩ = بخاری: ١٢٨٩، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٤٦٥ = ٢١٥٣ شيحا.

(٥٣٩) تجريد/٢، ژمارە: ٦١٨ = ١٢٨٧، مسلم: ٢١٤٠، بڕوانە پوختەی موسليم ژمارە: ٤٦٥ = ٢١٥٣ شيحا + تجريد/٢، ژمارە: ٦٢٠ = ١٢٩١، مسلم/شيحا: ٢١٥٤ = مسلم، محمج فؤاد: ٩٣٣.

کاتێ پێشەوا عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) پێکراو ئەبو لوئلوئەی مەجووسی لەبەرنوێژیی نوێژی بەیانیدا، لەمزگەوتەکەی پێغەمبەردا، چەند برینێکی کاریگەرو سەختی لێ کرد، کەبوون بەهۆی شەهید بوونی، صوهەیبی ڕۆمی هاواری لێ هەڵسا دەیگوت: ئای براڕۆ! عومەریش فەرمووی: ئەوە چۆن وادەڵێیت، ئەدی نازانی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی شتی وای نەداوە، ئەوەتا دەفەرموێ: (مردوو لەگۆڕەکەیدا، بەهۆی ئەو گریانەوە کە لەسەری دەکرێ، ئێش‌و ئازار دەدرێ).

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: کاتێ عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) بەو پێکرانە مرد، قسەکەی عومەرم گێڕایەوە بۆ عائیشە: کەگوایە مردوو سزاو ئەشکەنجە دەدرێ لەسەر ئەو گریانەی کە کەسوکارەکەی بۆی دەکەن).

عائیشە (ڕەزای خودا لەهەموویان بێ) فەرمووی: ڕەحمەتی خودا لە عومەر، عومەر پیاوی درۆ نەبوو، بەڵام یان باش لەیادی نەماوە، یان بەهەڵەدا چووە، چونکە بەخودا پێغەمبەر (درووددو سڵاو سەڵاواتی خوداو فریشتەو پەری‌و مرۆڤی لەسەر بێ‌و، سەرو ماڵ‌و حاڵ‌و منداڵ‌و هەست‌و نەست گشتی بەقوربانی گەردی سەرگۆڕی پیرۆزی بێ) وەهای نەفەرموو، نەی فەرموو کە موسوڵمان بەهۆی گریانی کەسوکاری، ئێش‌و ئازار دەدرێ، بەڵام فەرمووی: کافرو بێباوەڕ کە کەسوکاری بۆی دەگرین، خودا بەهۆی ئەوەوە ئەوەندەی تر ئێش‌و ئازاری گرانتر دەکا!!).

## (١٠) باب: التشديد في النياحة

## هەڕەشەكردنی سەخت لەگریەو زاریو شینو شەپۆڕو شیوەنكردن

٥٤٠- عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْها قَالَتْ: لَمَّا جَاءَ النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَتْلُ ابْنِ حَارِثَةَ وَجَعْفَرٍ وَابْنِ رَوَاحَةَ، جَلَسَ يُعْرَفُ فِيهِ الْحُزْنُ، وَأَنَا أَنْظُرُ مِنْ صَائِرِ الْبَابِ، شَقِّ الْبَابِ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ إِنَّ نِسَاءَ جَعْفَرٍ وَذَكَرَ بُكَاءَهُنَّ فَأَمَرَهُ أَنْ يَنْهَاهُنَّ، فَذَهَبَ، ثُمَّ أَتَاهُ الثَّانِيَةَ، لَمْ يُطِعْنَهُ، فَقَالَ: (انْهَهُنَّ) فَأَتَاهُ الثَّالِثَةَ، قَالَ وَاللّٰهِ لَقَدْ غَلَبْنَنَا يَارَسُولَ اللّٰهِ. فَزَعَمَتْ أَنَّهُ قَالَ: (فَاحْثُ فِي أَفْوَاهِهِنَّ التُّرَابَ). فَقُلْتُ أَرْغَمَ اللّٰهُ أَنْفَكَ ، لَمْ تَفْعَلْ مَا أَمَرَكَ رَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) وَلَمْ تَتْرُكْ رَسُولَ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) مِنَ الْعَنَاءِ. (الحديث ١٢٩٩- طرفاه في: ١٣٠٥، ٤٢٦٣):[٥٤٠]

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- كاتێك هەواڵی شەهیدبوونی ئەم سێ سەركردەیەی بۆ هات، كە لە شەڕی مۆتەدا كوژرابوون، كە عەبدوڵڵای كوڕی ڕەواحەو جەعفەرو زەیدی كوڕی حاریسە بوون پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لە مزگەوت بەغەمباری دانیشت و خەموخەفەت و پەستی لەڕووی دیاربوو، من لەدرزی دەرگاكەوە تەماشام دەكرد، پیاوێ هاتە خزمەتی عەرزی كرد: ئەی پێغەمبەری خودا ! ژنانی جەعفەر شین و شەپۆڕ دەكەن !؟ ئەویش فەرمانی پێ كرد كە نەهییان لێ بكات، ئەویش ڕۆیشت، بەڵام سوودی نەبوو، ژنەكان بە گوێیان نەكرد، دیسان پیاوەكە هاتەوەو پێی گووتەوە، ئەویش فەرموویەوە: (نەهیان لێ بكەن).

جا بۆ جاری سێیەم پیاوەكە هاتەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەرو عەرزی كرد بەخودا ئەی پێغەمبەری خودا! چاریان ناكەین! عایشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- پێی فەرموو: (دەی قوڕبدەن

---

[٥٤٠] تجريد/٢، ژمارە: ٦٢٤ = ١٢٩٩، ١٣٠٥، مسلم: ٩٣٥.

بەدەمیانـدا). (بـڕ: ژمـارە/٦٠٤). منـیش بـە پیاوەکـەم گـوت: دەك داوەشـێیت، نەتوانیت فەرمانەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جێبەجێ بکەی، وە نەوازیشت لێ هێنا، تاتووشی ئەم جەخارەی نەکەیت.

## راڤەو شیکردنەوە:

ئـەم فەرموودەیـە وەك شـێخی عـەینی دەفـەرمووێ: بەڵگـەی دەسـتوریی دانیشتن بۆ تازێی واتیـادا، لەگێڕانـەوەی ئیمـامی ئـەبوداودا دەڵێـت: پێغەمبـەر - دروودی خـوای لەسـەر بـێ- لـە مزگـەوت دانیـشت.کەواتـە: ئەمـەی کـە ئێـستا موسوڵمانان لە مزگەوت دادەنیشن بۆ پرسەی مردووی خۆیـان لـەم فەرموودەیـە وەرگیراوە.

٥٤١- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِي اللَّهُ عَنْها قَالَتْ: (أَخَذَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ عِنْدَ الْبَيْعَةِ أَنْ لَا نَنُوحَ، فَمَا وَفَتْ مِنَّا امْـرَأَةٌ غَيْـرَ خَمْـسِ نِـسْوَةٍ، أُمِّ سُـلَيْمٍ، وَأُمِّ الْعَلَاءِ، وَابْنَةِ أَبِي سَبْرَةَ امْرَأَةِ مُعَاذٍ، وَامْرَأَتَانِ أَوْ ابْنَةِ أَبِـي سَـبْرَةَ، وَامْـرَأَةِ مُعَـاذٍ وَامْـرَأَةٍ أُخْرَى) (الحديث ١٣٠٦ – طرفاه في:٤٨٩٢، ٧٢١٥).[٥٤١]

ئوم عەتییە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەو کاتەی کـە ئێمـەی ژنـان پـەیمانمان بەسـت لەگـەڵ پێغەمبـەردا، لەسـەر پابەنـدبوون بەدەسـتوورەکانی ئیـسلام، حـەزرەت -دروودی خـوای لەسـەر بـێ- بەتایبـەتی پـەیمانی ئـەوەی لێسەندین: کـە شیوەن و زاری نەکـەین، بـەڵام پێـنج ئافرەتمـان نـەبێ کـەسمان نەمان بردەسەر، ئەوانیش ئەم ژنانە بوون: ئوم سولەیم و ئوم عـەلاءو کچەکەی ئەبو سەبرەی ژنی موعازو دووژنی تربوون، یا، کچەکەی ئەبو سـەبرەو ژنەکـەی موعازو ژنێکی تر بوون).

---

[٥٤١] تجرید/٢، ژمارە: ٦٢٨ = ١٣٠٦، ٤٨٩٢، ٧٢١٥، مسلم: ٩٣٦ ترقیم محمد فؤاد عبدالباقی.

٥٤٢- عَنْ امِّ عَطِيَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (بايَعْنَا رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فقَرَا عَلَيْنا: ﴿انْ لا يُشْرِكْنَ باللّهِ شَيْئًا﴾ وَنَهَانَا عَنْ النِّيَاحَةِ فقَبَضتْ امْرَاةٌ يَـدَهَا فقَالَتْ: اسْعَدَتْنِي فُلانَةُ اريدُ انْ اجْزِيَهَا فَمَا قَالَ لَهَا النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شَـيْئًا فَانْطَلَقَتْ وَرَجَعَتْ فَبايَعَهَا). (الحديث ٤٨٩٢- سبق طرفـه فـي: رقـم: ٦٢٨ تجويـد =١٣٠٦ فتح =مجلد/٢ص ٥٣). [٥٤٢]

ئـوم عـەطييـە (رەزاى خـوداى لـێ بـێ) فـەرمووى: كـاتێ پـەيمانمان بەست، ئێمـەى ژنـان لەگـەڵ پێغەمبـەر دا (دروودى خـوداى لـێ بـێ) ئـەم ئايەتـەى بەسـەرماندا خوێنـدەوە :﴿ انْ لا يُـشْرِكْنَ باللّـهِ شَـيْئًا﴾ ٦٠/١٢، واتـاى تـەواوى ئايەتەكـە ئاوايـە : ئـەى پێغەمبـەر! كـاتێ ئافرەتـە موسـڵمانەكان هـاتن بـۆ لات، كەپەيمان وبەيعەتت بـدەنێ، لەسـەر ئـەوە پـەيمانيان لێ وەربگـرە كـە : بـە هـيچ جۆرێ هاوبـەش بـۆ خـودا بڕيارنـەدەن و دزى نەكـەن وحيـزى نەكـەن ومنـداڵى خۆيـان نـەكوژن وكـچى خۆيـان زينـدە بەچـاڵ نەكـەن وبوختـانى درۆ لـەنێوان دەست وپاى خۆياندا نەكەن واتە: منـداڵى بێگانـە نـەهێنن و لـە بـەينى دەستـو پێى خۆيانا دايبنێن و بەدرۆ و ناهەق بيكەن بەمنداڵى مێردەكەيان وە لەكردنى كارى خێردا نا فەرمانى تۆ نەكەن وسەرپێچى لە فەرمانى تۆ نەكەن، جا لەپاش ئەمە لەخودا بپاڕێرەوە بۆيان كە خودا لێيان خۆش ببـێ، بەڕاسـتى خـودا تـاوان بەخش وميهرەبانە (تاج/١ ل/٤٩).

وە پێغەمبەر (دروودى خـوداى لـێ بـێ) نـەهى لێ كـردين لـە شـين وشـەپۆڕ لەسەر مردوو، جا لەم كاتەدا ژنێ لە ژنـەكان كـەئوم عـەتێ خـۆى بـووە، دەسـتى خۆى كێشايەوە لە پەيمانەكەو، گوتى: (كاتى خۆى فيسارە ژن لە گەڵمدا شيوەنى

---

[٥٤٢] تەجريد/٤، ژمـارە: ٤٧٠٥ = بخـارى: ٤٨٩٢ + تـەجريـد/ژمـارە: ٦٢٨ = ١٣٠٦، مجلـد/٢، مـسلم: ٩٣٦ ترقيم محمد فؤاد عبدالباقى.

بۆم گێڕاوە، ئەو دەستیاوەی لەسەرمە، دەمەوێ ئێستا ئەو قەرزەی بدەمەوە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) هیچی پێ نەگوت و لێی بێدەنگ بوو ژنەکە ڕۆیشت وشین و زاریەکەی لەگەڵ دەستە خوشکەکەی کرد، وگەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر و پەیمانی لەگەڵ پێغەمبەر دا بەست ).

**ڕوونکردنەوە:**

لە هەندێ فەرمودەدا، جۆرە ئاسان کارییەکی ڕەچاونەکراو هەیە، وەك فەرمووەدەی پێشوو، وە هەروەها ئەم فەرموودەیەی کە بۆنی ئەوەی لێ دێ شین وزاری بۆ مردوو دروست بێ، لەبەر ئەوە نابێ بەپەلە حوکم وبڕیار لەکاتی وا دا لەو جۆرە فەرموودەیێ وەربگیرێ.دەبێ بەوردی موتالای شەرح وکتێبی شەرع لەکاتی وا دا بکرێ.

**(١١) باب: نهى النساء عن إتباع الجنائز**
**جڵەوگیری لەشوێنکەوتنی تەرم لەلایەنی ژنانەوە**

٥٤٣- وَعَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {نُهِينَا عَنِ اتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ، وَلَمْ يُعْزَمْ عَلَيْنَا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. {تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٦١٣ = ١٢٧٨ فتح الباری. پوختەی موسلیم/٤٧١ = ٢١٦٤ شیحا = مسلم/٩٣٨}: (٥٤٣)

ئوم عەتێ (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئێمەی ژنان، جڵەوگیریمان لێکراوە، لە شوێنکەوتنی تەرم، کە لەکاتی بەڕێکردنەدا لەگەڵیدا بچین بۆ گۆڕستان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یاساغ نەکراوە لێمان کە لەگەڵ تەرمدا بڕۆین بۆسەر قەبران). {تاج/١، زنجیرە: ٢١٨، ژمارە: ١١٢١}.

(٥٤٣) تجرید/٢، ژمارە: ٦١٣ - ١٢٧٨، مسلم: ٤٧١ - ٢١٦٤ = مسلم: ٩٣٨.

**ڕوونکردنەوە:**

**واتە: چوونی ژنان لەگەڵ تەرمی مردوودا بۆ گۆڕستانو ئامادەبوونی ڕێو ڕەسمی ناشتنی تەرم، لەلایەن ژنانەوە، ناباشە، واتـە: کەراهەتو ناباشـی هەیـە، بەڵام حەرامو نادروست نییە. {ریاض/٢، زنجیرە: ١٥٤، ژمارە: ٩٣١}.**

## (١٢) باب: في غسل الميت
## باسی شۆردنی مردوو

**٥٤٤- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ الْأَنْصَارِيَّةِ رَضِي اللَّهُ عَنْها قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ تُوُفِّيَتْ ابْنَتُهُ، فَقَالَ: (اغْسِلْنَهَا ثَلَاثًا، أَوْ خَمْسًا، أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ إِنْ رَأَيْتُنَّ ذَلِكَ، بِمَاءٍ وَسِدْرٍ وَاجْعَلْنَ فِي الْآخِرَةِ كَافُورًا أَوْ شَيْئًا مِنْ كَافُورٍ فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي). فَلَمَّا فَرَغْنَا آذَنَّاهُ، فَأَعْطَانَا حِقْوَهُ فَقَالَ: (أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ) تَعْنِي إِزَارَهُ). (الحديث ١٢٥٣):[٥٤٤]**

**ئوم عەتیّ (ڕەزای خوای لیّ بیّ) فەرمووی: خەریکبووین تەرمی زەینەبی کچی پێغەمبەرمان دەشۆرد، پێغەمبەر خۆی (دروودی خوای لەسەر بیّ) هاتە ژورەوە بۆلامان، فەرمووی: (بە ئاوو مۆرد سیّجار، یاپێنج جار بیشۆن، یازیاتریش ئەگەر زیاترتان بە پێویست زانی، وە لەدواترین دەستا کافووریشی تیّ بکەن، کاتێکیش لێبوونەوە لە شۆردنەکەی ئاگادارم بکەن). جا کەلێبووینەوە پێمان گوت. جا پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بیّ- کراس (ئیزار)ەکەی خۆی هەڵدا بۆمان و فەرمووی: (بیکەن بەژێرکراس بۆی). واتە: لەسەر گۆشتەوە بیکەنە بەری. (تاج /١/٥٤٦ ز – ٢٠٣).**

---

[٥٤٤] تجريد/٢، ژمارە: ٦٠٦ = ١٢٥٣، مسلم: ٩٢٩ شيحا.

وَفِي رِوايَةٍ أخرى: أَنَّهُ قَالَ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ: (ابْدَأْنَ بِمَيَامِنِهَا وَمَوَاضِعِ الْوُضُوءِ مِنْهَا). قَالَتْ: (وَمَشَطْنَاهَا ثَلَاثَةَ قُرُونٍ). (الحديث ١٢٥٤):

لەگێڕانەوەیەکی تردا: ئوم عەتییە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- بۆ شۆردنی تەرمی زەینەبی کچی فەرمووی پێمان: (لەئەندامە ڕاستەکانیەوە و لەئەندامەکانی دەستنوێژیەوە دەست بکەن بەشۆردنی). ئوم عەتییە فەرموویشی: قژەکەیشیمان شانەکردو کردمان بەسێ پەلك و بەپشتیا شۆڕمان کردەوە.

ئەمەیش دەقی کوردی ژمارە (٤٦٧)ی پوختەی موسلیمە، گۆشەیەکی ئەم باسە ڕوون دەکاتەوە:

ئوم عەتیێ (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ زەینەبی کچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مرد، خەریك بووین تەرمەکەیمان دەشۆرد، پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتە ژوورەوە بۆلامان، فەرمووی: (بە ئاوو مۆرد سێ جار، یا پێنج جار، یا زیاتریش بیشۆرن، وە لەدوا دەستا هەنێ کافووریشی تێ بکەن، کاتێکیش لێ بوونەوە لە شۆردنەکەی ئاگادارم بکەن).

جا کەلێ بووینەوە، پێمان گوت: جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) کراس (إزار)ەکەی خۆی هەڵدا بۆمانو فەرمووی: (بیکەن بەژێرکراس بۆی). واتە: لەژێر کفنەکەیەوە، لەسەر گۆشتەوە بۆ پیرۆزی بیکەنە بەری). {تاج/١، زنجیرە: ٢٠٣، ژمارە: ١٠٧٠}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- ئەم فەرموودەیە بنەمایەکە لە بنەماکانی خۆ پیرۆز کردنو خۆ مووفەڕك کردن، بە شۆنەوارو شمەکی پیاو چاکان.

زەینەبی کچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو کەسوکارەکەی بێ)، لە خەدیجەی کوبرایە، کە یەکەم هاوسەری پێغەمبەر بوو، کچە گەورەی پێغەمبەرە، ڕاجیایی هەیە لەوەدا کە زەینەب گەورەترە، یا قاسمی برای، یەکەم کچی پێغەمبەر بووە کە شووی کردووە، شووی کرد بە ئەبول عاصی کوڕی ڕەبیع کە پووورزای خۆی بوو، کە کوڕی هالەی کچی خووەیلید بوو، زەینەب لەگەڵ باوکی‌و لەگەڵ باوکی مێردەکەیدا، لە مەککەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە، لە ئەبول عاصی مێردی کوڕێك‌و کچێکی بوو، کوڕەکە ناوی عەلی بوو، مێرد منداڵ بوو کە مرد، کچەکە ناوی ئومامە بوو، ما هەتا لەدوا مردنی فاطیمەی زەهرای پووری، شووی کرد بە عەلی کوڕی ئەبو تالیب. مێردەکەی زەینەب زۆری خۆش دەویست، زەینەب، لەژیانی باوکیا، لەساڵی هەشتی کۆچیدا وەفاتی کرد. {بڕوانە: تەجریدی بوخاری/٤، ژمارە: ١٥٢٢ (تێبینی) لاپەڕە: ٢٣٩ + بەرگی/٤، لاپەڕە: ١٢٥، ژمارە: ١٤٦٢ + لاپەڕە: ١٨٦، ژمارە: ١٥٠٠ + مسلیم ژمارە: ٣٦}.

٥٤٥- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَنَحْنُ نَغْسِلُ ابْنَتَهُ فَقَالَ « اغْسِلْنَهَا ثَلاَثًا أَوْ خَمْسًا أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ ، وَاجْعَلْنَ فِي الآخِرَةِ كَافُورًا ، فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي » . فَلَمَّا فَرَغْنَا آذَنَّاهُ ، فَأَلْقَى إِلَيْنَا حِقْوَهُ فَقَالَ « أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ » . فَقَالَ أَيُّوبُ وَحَدَّثَتْنِي حَفْصَةُ بِمِثْلِ حَدِيثِ مُحَمَّدٍ وَكَانَ فِي حَدِيثِ حَفْصَةَ « اغْسِلْنَهَا وِتْرًا » . وَكَانَ فِيهِ : « ثَلاَثًا أَوْ خَمْسًا أَوْ سَبْعًا » . وَكَانَ فِيهِ أَنَّهُ قَالَ « ابْدَأْنَ بِمَيَامِنِهَا وَمَوَاضِعِ الْوُضُوءِ مِنْهَا » . وَكَانَ فِيهِ أَنَّ أُمَّ عَطِيَّةَ قَالَتْ وَمَشَطْنَاهَا ثَلاَثَةَ قُرُونٍ.[٥٤٥]

لەپێشەوە لەژمارە (٥٤٤)دا، واتاکەی بەتەواوی ڕابورد.

[٥٤٥] بڕوانە: (٥٤٤).

**٥٤٦– عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ – رضى الله عنها – قَالَتْ لَمَّا غَسَّلْنَا بِنْتَ النَّبِيِّ – صلى الله عليه وسلم – قَالَ لَنَا وَنَحْنُ نَغْسِلُهَا « ابْدَأْنَ بِمَيَامِنِهَا وَمَوَاضِعِ الْوُضُوءِ ».[٥٤٦]**

**واتاكەی لەپێشەوە لەژمارە (٥٤٤)دا رابورد.**

## (١٣) باب: في الكفن الميت
## باسی كفنی مردوو

**٥٤٧– عَنْ خَبَّابٌ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: هَاجَرْنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَلْتَمِسُ وَجْهَ اللَّهِ، فَوَقَعَ أَجْرُنَا عَلَى اللَّهِ، فَمِنَّا مَنْ مَاتَ لَمْ يَأْكُلْ مِنْ أَجْرِهِ شَيْئًا، مِنْهُمْ مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ، وَمِنَّا مَنْ أَيْنَعَتْ لَهُ ثَمَرَتُهُ، فَهُوَ يَهْدِبُهَا قُتِلَ يَوْمَ أُحُدٍ، فَلَمْ نَجِدْ مَا نُكَفِّنُهُ إِلَّا بُرْدَةً، إِذَا غَطَّيْنَا بِهَا رَأْسَهُ خَرَجَتْ رِجْلَاهُ، وَإِذَا غَطَّيْنَا رِجْلَيْهِ خَرَجَ رَأْسُهُ، فَأَمَرَنَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ نُغَطِّيَ رَأْسَهُ، وَأَنْ نَجْعَلَ عَلَى رِجْلَيْهِ مِنَ الْإِذْخِرِ (احديث ١٢٧٦– اطرافه في: ٣٨٩٧، ٣٩١٣،٣٩١٤، ٤٠٤٧، ٤٠٨٢، ٦٤٣٢، ٦٤٤٨):[٥٤٧]**

**خەبباب (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: كاتێ لەخزمەت پێغەمبەردا -دروودی خوای لەسەر بێ- كاتێك كۆچمان كرد، مەبەستمان بەس رەزای خوا بوو، ئیتر ئەجرو پاداشی باشمان كەوتە سەر خودا، جا گەلێ كەسمان لێ مردو هیچی لە ئەجرو پاداشتی خۆی لە دونیادا نەخواردوو، گشتی برد بۆ قیامەتی، یەكێ لەم خودا پێداوانەی كە ئەمە حاڵیان بوو، كە مردووە موصعبی كوڕی عومەیر بوو، وەگەلێك كەسیشمان ماوون و لە خودای گەورە بەزیاد بێت، باخەكەیان خەملیوەو پەیتا پەیتا دەیڕنن! موصعبی كوڕی عومەیر (رەزای**

---

[٥٤٦] **بڕوانە: (٥٤٤).**

[٥٤٧] **تجرید/٢، ژمارە: ٦١١ = ١٢٧٦، مسلم: ٢١٧٤ شیحا.**

خـوای لێ بـێ) کـه لەغـەزای ئوحـوددا شـەهید کـرا، یـەك لـۆ بـەرگی لـەپاش بـەجێمابوو کـەبریتی بـوو لەعەبایـەك، ئـەو عەبایـەمان بـۆکرد بـەکفن، بـەڵام ئەویش ئەوەندە نەبوو کە هەموو لەشی داپۆشێ، ئەگەر دەیاندا بەسـەر سـەریدا قاچەکانی دەردەکەوتن، ئەگەر دەیاندا بەسـەر قاچـەکانیدا سـەری دەردەکـەوت ! لەبەرئەوە حەزرەت -دروودی خـوای لەسـەر بێ- فـەرمووی: (سـەری بەجلەکـەی داپۆشـن و پوشـە سـورپناتك (گیـای ئیـذخر) یـش بـدەن بەسـەر قاچـەکانیدا). (تاج/١/١٢٩/٥).

## راڤەو شیکردنەوە:

١- خەبابی کوڕی ئـەرەتت (رەزای خـوای لێ بـێ)، یەکێکـە لـە موسوڵمانە هـەرە پێشینەکان، یەکەم کەس بوو کە ئیسلامبوونی خۆی ئاشکرا کـرد، لـەپێناوی ئـایینی خـودادا تووشـی ئەشـکەنجەو ئـازاردانێکی زۆربـوو، لـەپێش ئیـسلامدا ئاسـنگەر بـوو شمشێری دروست دەکرد، لە کۆچکارە پێشینەکانە دەیفەرموو: هاوبەش پەیداکارەکان ئاگرێکـان کـردەوە بـۆم و بەسـەر ئـەو ئـاگرەدا ڕایـان کێـشام، قرچـە قـرچ جەسـتەم دەسووتا، تا بەرە بەرە بەزە تواوەکەی لەشـم ئاگرەکـەی کوژانـدەوە ! هـەتا مـرد چـاڵ وچـۆڵی ئـەو سـووتانە بەپـشتییەوە مـابوو، لـەکاتی بەسـتنی پـەیمانی برایەتیـدا پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- کردی بەبرای جوبەیری کوڕی عەتیك، خـەباب ئامـادەی جـەنگی بـەدرو هـەموو شـەڕگاکانی تـری پـاش بـەدر بـوو لەخزمـەت پێغەمبەردا، لە کوفـە نیشتەجێ بـوو هـەر لـەوێش مـرد، لەساڵی ٣٧ی کۆچیدا، لـەو دەمەدا کـە عـەلی کوڕی ئـەبو تالیب -دروودی خـوای لەسـەر بـێ- لـە شـەڕی صـەفین گەڕایەوە عەلی نوێژی لەسەرکرد، ٦٣ساڵ ژیاوە.

٢- موصـــعەبی کـــوڕی عومــــەیر (ڕەزای خـــوای لێ بـــێ)، لەموســـوڵمانە هەرەپێـــشینەکانە، جـــوانترین و شـــۆخ و شـــەنگترین و تەڕپۆشـــترین لاوبـــوو لەمەککەدا ئەو کاتە موسوڵمان بـوو کەپێغەمبـەر لـەماڵی ئەرقەمـدا بەدزییـەوە لەگەڵ موسوڵمانەکاندا کۆ دەبوونەوە، کە دایك و باوکی پێیـان زانـی پێوەنـدیان کردو حەپسیان کرد، تا هەلی بۆ هەڵکەوت و هـەڵهاتو کۆچـی کـرد بـۆ حەبەشـە، پاشان گەڕایەوە بۆ مەککەو لەوێوە کۆچی کـرد بـۆ مەدینـە، لـە پـاش عەقەبـەی دووەم پێغەمبـەر -درروودی خـوای لەسـەر بـێ- نـاردی بـۆ مەدینـە، لـەوێ فێـری قورئانی دەکردن و شارەزای دەکـردن لـە ئایینـدا، ئـەو یەکـەم کـەس بـوو کـە لـە مەدینـە لـەپێش کۆچـی پێغەمبـەردا نوێـژی هـەینی کـرد بـۆ موسـوڵمانەکانی مەدینە، ئامادەی جەنگی بەدر بوو، لە جەنگی ئوحوددا ئالآی ئیسلام بـەو بـوو، کە لەم جەنگەدا شەهید کـرا، عـەلی ئالآکـەی هـەڵگرت، موصعب لەتەمـەنی چل ساڵیدا لەشـەڕی ئوحـوددا بـە دەسـتی ئیبنـو قمئـەی لەیـسی شـەهید کـرا (ڕەزای خوای لێ بێ).

٥٤٨- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: كُفِّنَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِى ثَلاَثَةِ أَثْوَابٍ بِيضٍ سَحُولِيَّةٍ مِنْ كُرْسُفٍ لَيْسَ فِيهَا قَمِيصٌ، وَلاَ عِمَامَـةٌ، أَمَّـا الْحُلَّةُ فَإِنَّمَا شُبِّهَ عَلَى النَّاسِ فِيهَا أَنَّهَا اشْتُرِيَتْ لَهُ لِيُكَفَّنَ فِيهَا، فَتُرِكَتِ الْحُلَّـةُ، وَكُفِّـنَ فِى ثَلاَثَةِ أَثْوَابٍ بِيضٍ سَحُولِيَّةٍ، فَأَخَذَهَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِى بَكْرٍ، فَقَالَ: لأَحْبِـسَنَّهَا حَتَّـى أُكَفَّنَ فِيهَا نَفْسِى، ثُمَّ قَالَ: لَوْ رَضِيَهَا اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لِنَبِيِّهِ لَكَفَّنَهُ فِيهَا. فَبَاعَهَا وَتَـصَدَّقَ بِثَمَنِهَا. {الحديث: ٢١٧٦ = ٢١٤٩ فم. تجريد/٢/٢٨، رقـم: ٦٠٧ = ١٢٦٩، ١٢٧١، ١٢٧٢، ١٢٧٣، ١٣٨٧}:[٥٤٨]

[٥٤٨] تجريد/٢، ژمارە: ٦٠٧ - ١٢٦٩، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٤٦٨ - ٢١٧٦.

**٦٢- ئەم جۆرە شتانەی دواوە بۆ گۆڕ سوننەتن:**

**١- لەپاش ناشتنی تەرمەکەو ڕێکخستنی گۆڕەکە بەتەواوی کەمێ ئاوی لێ بپرژێنرێ، دەبێ ئاوەکە پاكو سارد بێ.**

**٢- وردە چەوی لەسەر دابنرێ، بەڵام سوتاندنی داری عوودو بخوور لەسەر گۆڕ زۆر ناباشە، چونکە ئاگر نیشانەی دۆزەخە.**

**٣- دوو کێلی بۆ بکرێ، یەکێ لەسەرینیو یەکی لەپایینیو واباشە بەرد بن.**

**٤- لەپاش ناشتن، ئەگەر کەمێ گوڵاویش لەگۆڕەکە بدرێ، بۆ ڕێزی فریشتەکان، کارێ دروستە، دەنا نا.**

**٥- ڕێزگرتنی گۆڕ سوننەتە، سەردانیکاری وادابنێ، کە دەچێ بۆلای، لەکاتی ژیانیدا.**

**٦- دروستە ڕێحانەو نێرگزو گوڵو گیای بۆنخۆشی تری تەڕ، لەسەر گۆڕ دابنرێ، چونکە هەتا تەڕاییيان تیابێ، یادو زیکری خودا دەکەنو بەوە باری مردووەکە سووك دەبێو گۆڕەکەیان پێ مووفەڕكو فەڕدار دەبێ.**

**هەروەك دروستە، بۆ هەمان مەبەست، ڕێحانەو نێرگزو گیاو گوڵ، لەسەر گۆڕ بنێژرێ، یان دارو درەختو نەمام لەپاڵ گۆڕدا بنێژرێن، وەلەکاتی وادا، حەرامە بردنی ئەو گوڵو دارو نەمامانەی کە لەسەر گۆڕ دانراون، یان نێژراون، هەتا وشك دەبن، بەڵام دروستە بەری داری سەر گۆڕ بخورێ، وەك بەری دار توویێ لەگۆڕستان نێژرابێ.**

**٧- لە (إعانة الطالبين)دا دەفەرموێ:**

١- کەسێ بۆ باوكو دایکی خراپ بووبێ، لەپاش مەرگیان، نزای زۆریان بۆ بکا، خودا لێی خۆش دەبێو بەرۆڵەیەکی بەوەفاو بەئەمەکداری دادەنێ بۆیان.

٢- سەردانی گۆڕ واباشە لە رۆژی هەینیدا بێ، چونکە هەرکەسێ لەرۆژی هەینیدا، سەردانی گۆڕی مردوو بکا، مردووەکە ئاگای لێیەتی.

٣- هەموو شەوێ، گیانی مردوو دێ بۆ ئاسمانی یەکەمو بەرابەر ماڵەکەی خۆی ڕادەوەستێو داوا لەکەسوکاری دەکا، یەکە یەکە، کەیادی خێری بکەن، نزای باشی بۆ بکەن، خێری بۆ بکەن، سکاڵای حاڵی خۆیان دەکەنو پێیان دەڵێن: رەحمێکمان پێ بکەن، خودا ڕەحمتان پێ بکا، پێش ئەوەی کەئێوەیش بێن بۆلای ئێمە.

٦٣- مردوو باش بێ، یان خراپ بێ، بەمەرجێ لەسەر ئیسلامەتی مردبێو خۆی بە موسوڵمان دانابێ، سوننەتە بەپێی حاڵ ئەمانەی بۆ بکرێ:

١- ئیسقاتی بۆ بکرێ.

٢- قوربانی بۆ بکرێ.

٣- حەج، یان عەمرەی بۆ کرێ.

٤- لەبۆنەکانا، خێرو حەسەناتی بۆ بکرێ.

٥- هەمیشە ناوی بەباشە ببرێ.

٦- بەهیچ جۆرێ، باسی خراپەی نەکرێ، نەڵێن: لەوەلاتر بڕوا، ئارەقخۆر بوو، یاقومارچی بوو، یادز بوو، یانوێژنەکەر بوو، بەڵکوو دەبی وادابنێین، کە ئەو مردووە برامانە، یاخوشکی ئیمانیمانەو تووشی کێشەیەکی گەورە بووە، ئەوەندەی دەتوانین رزگاری بکەین، وەك ئەوە بڵێین: لەخودا بەزیاد بێ لەسەر ئیمان مردووە، یان دراوسێیەکی بێوەی بوو، یان رۆژی هەینی، یامانگی

رەمەزانی بەنسیب بوو، یا لەو گۆڕستانە پیرۆزەدا نێژراوە یاسوپاس بۆ خودا، ماڵو منالّی باشی هەیە، خێرو چاکەی بۆ دەکەن، رەحمەت لەو داناو زانایەی کە دەفەرموێ:

(مـن لـەباتی ئـەوەی لەعنـەتێ لەشـەیتان بکـەن، سـڵاواتێ لـەدیاری پێغەمبەر دەدەم).

من دڵنیـام لـەوەی: کـە هەیـە عـەرەقخۆر بـووەو لەسـەر ئیمـان مـردووە، ئەوەنـدە خەڵك لەپاش مەرگی، زەمیان کردووە، لەسەر عـەرەقخواردن، ئـەو پـاك بۆتـەوەو غەیبەتکـەرەکانی تـووش بـوون!! وەك لـە فـەرموودەدا، لەپێناسـەی موفلیسی ئۆمەتی پێغەمبەردا، باسی شتی واکراوە. بەمە دەڵێن:

(نوێژکـــەر کـــردیو نـــارەقخۆر بـــردی!!)

**روونکردنەوە:**

بڕیارە شەرعییەکانی نامەی تەرم:

١- سەردانی نەخۆش، سوننەتە، بەتایبـەتی ئەگـەر خـزمو ناسـیاوو دراوسـێ بێ، بابەدکار، یا بێ باوەڕیش بێ.

٢- واباشـە سـەردانەکە مـاوەی کـەم بـێ، نـەبێ بەزەحمـەت بـۆ نەخۆشـەکەو بەهۆی گواستنەوەی نەخۆشی بۆ کەسێ تر.

٣- واباشە لەلای نەخۆش، یا لەلای مردوو، قسەی باشو نزای باش بکـرێ، وە ورەی نەخۆشەکە بەرزەوە بکرێ، وە ئامۆژگاری خێری کەسوکاریان بکرێ.

٤- وتنی (لا إله إلاَّ الله) لەلای نەخۆش لەسەرە مەرگا، واباشـە هـەوڵ بـدرێ، کە ئەم وشە پیرۆزە دوا قسەی بێ.

٥- لـە سـەرەمەرگا، ئومێـدی بـاش بـە بەخشـشی خـودا زۆر باشـە، واباشـە نەخۆشەکە بەم شێوازە ئاراستە بکرێ.




٦- لەپاش مـردن چاوی لێك بنـرێ، بـە چەرچەفێ، یـا شتێ وا تەرمەکەی دابپۆشرێ.

٧- سەبرو ئارام لەکاتی ڕووداوی ناخۆش‌و مردندا سوننەتە.

٨- منداڵ مردن پاداشی گەورەی هەیە.

٩- گریـان بـۆ مـردوو، بـەبێ شـین‌و شـەپۆڕو ناشـوکری کـردن دروسـتە، پێغەمبەر بۆ دایکی‌و بۆ ئیبراهیمی کوڕی گریاوە.

١٠- هەڕەشە کردن لەشین‌و زاری‌و سینگ کوتان‌و جل دڕین.

١١- کەسێ ڕاسپێرێ لەپاش مەرگی بۆیبگرین، لەگۆڕا سزا دەدرێ.

١٢- شۆردن (غوسڵ)ی مردوو فەرزە، دەستووری تایبـەتی خۆی هەیـە، دەبـێ پیاو پیاو بشوات‌و ژن ژن.

١٣- کفن کردن فەرزە، سوننەتە سپی بێ، لەسێ لۆ کەمتر نەبێ.

١٤- واباشە تەرم زوو بەزوو بەڕێ بکرێ، مەگەر لەبەر هۆیێ.

١٥- شوێنکەوتنی تەرم هەتا ناشتن بۆ پیاو سوننەتە، بـەڵام بـۆژن کەراهـەتی هەیە، بەڵام نادروست نییە.

١٦- نوێژی تەرم فەرزی کیفایەیە، کردنی خێرێکی گەورەیە.

١٧- نـزاو پاڕانــەوە بــۆ مــردوو ســوننەتە، لــەکاتی ســەردانی گۆڕەکەیــدا بەتایبـەتی‌و لـەکاتی ناوهێنانیـدا، وەك: بـاوکم (بەڕەحمـەت بـێ) نـاوی حـاجی فارس حەمە خان حەسەن بوو.

١٨- مـردوو واباشـە گۆڕەکـەی دیـاری بکـرێ، تـا کەسوکارەکەی بیناسـنەوەو سەردانی بکەن‌و مردووی تری خۆیانی لەنزیکەوە بنێژن‌و نزای بۆ بکەن.

١٩- نوێــژی تــەرم لەســەر هــەموو مردوویــەك دەکــرێ، بەمــەرجێ بــە موسوڵمانەتی بمرێ، با لەژیانیـدا خـراپ بووبـێ، یـاخۆی بکوژێ، یـا لـەژێر داری

حەددا بمرێ، یا لەسەر داوێنپیسی رەجم کرابێ، یا زۆڵ بێ، یا لەژیانیا سەر بەم پارتە زەندیقانە بووبێ، یا سەر بە مەزاهیبی دژە سوننە بێ، وەك رافیزەو کاکەیی‌و شیعە بەهەموو تاقمەکانیانەوە، ئەوەی ئەهلی قیبلە بێ، بۆ مەبەستی نوێژی تەرم بە موسوڵمان دائەنرێ.

٢٠- واباشەو سوننەتە نوێژی مردوو بە کۆمەڵ بکرێ، جەماعەتەکەی لەسێ ریز کەمتر نەبێ، ئەگەر چل کەس یا زیاتر نوێژی لەسەر بکەن‌و تکای بۆ بکەن، زۆر زۆر باشە.

٢١- ناوهێنانی مردوو بە باشە زۆر باشە، واباشە باسی چاکەی بکرێ‌و بەخراپە ناوی نەبرێ.

٢٢- سوننەتە لەگەڵ تەرما، بەپێ برۆن، مەگەر لەبەر ناچاری وەك ئێستا، بەڵام لە گەڕانەوەدا سوار بوون کەراهەتی نییە.

٢٣- وا سوننەتە گۆڕ سادە بێ، گەچکاری نەکرێ، خانووی لەسەر نەکرێ، گومەزی لەسەر نەکرێ، جێگە زۆر نەگرێ.

٢٤- لەسەری دانەنیشی، پێی لێ نەنێی، پیسی نەکەی، رێزی بگیرێ، هەموو بێ رێزییەك بە گۆڕو گۆڕستان نادروستە.

٢٥- سەردانی گۆڕو گۆڕستان سوننەتە، لەکاتی سەردانا سڵاویان لێ دەکرێ، نزای باشیان بۆدەکرێ، زیکرو قورئانیان لەسەر بخوێنرێ دروستەو کارێکی ناباش نییە.

٢٦- لەکاتی نوێژکردنا، بەقەستی روو نەکرێتە گۆڕ.

٢٧- لەپاش مردن، خێرو خێرات بۆ مردوو دروستە، باسی ناوی جوانی بکرێ، دروستەو کارێ باشە، دروستە شتی بۆ وەقف بکرێ، وەك بیرو دەستاڕو پردو باخ‌و قورئان.

٢٨- بڕوانە تەجریدی بوخاری، بەرگی یەکەم، لاپەڕە: ١٧٣ هەتا لاپەڕە: ١٨١. نێوانی ژمارە: ٢١٦/١٥٩و ژمارە: ٢٢٠/١٦١.

٢٩- لە ریاض الصالحیندا دەفەرموێ: ئیمامی شافیعی (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (لەپاش ناشتن واباش‌و پەسەندە، هەندێ قورئانی لەسەر بخوێنرێ، خۆ ئەگەر خەتمەیەکی قورئانی بە تەواوی لەسەر بکرێ، ئەوە کارێکی زۆر جوانە). {ریاض/٢/٣٧٥، زنجیرە: ١٦١، ژمارە: ٩٤٦}.

٣٠- ناشتنی دارو گوڵ‌و ڕووەك لەسەر گۆڕ ناباش نییە، بەڵکوو لەزۆر ڕووەوە سوودی هەیە.

## ١٢- كتاب الزكاة
## نامەی زەكات

٥٦٧– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ يَقُولُ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ) (الحديث ١٤٠٥– اطرافه في: ١٤٤٧، ١٤٥٩، ١٤٨٤).[٥٦٧]

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (زیو لە پێنج ئۆقیە کەمتر بێ زەکاتی لێ ناکەوێ، پێنج ئۆقیە دەکاتە دوو سەد درهەم، ژمارەی وشتر لەپێنج وشتر کەمتربێ زەکاتی لێ ناکەوێ، دانەوێڵە لە پێنج ویسق کەمتربێ، زەکاتی لێ ناکەوێ.(تاج/٢/١٥ ف/٤ + ل/٢٥ ف/١).

### ڕاڤەو شیکردنەوە:

١- پێنج وەسق دەکاتە سەد صاع، بەپێوانەی کوردەواری دەکاتە نزیکەی چل و پێنج تەنەکە.

٢- درەمێ شەش دانقە، دە درەم حەوت مسقاڵە، کەواتە: دوو سەد درەم دەکاتە: سەدو چل مسقاڵ.

---

[٥٦٧] تجرید/٢، ژمارە: ٦٧٢ = ١٤٠٥، مسلم: ٩٧٩ = ٢٢٦٨ شیحا.

## (٢) باب: لا زكاة على المسلم في عبده وفرسه
## كۆیلەو ئەسپو ماین زەکاتی ناکەوێ

٥٦٨- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) أن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قال: « لَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِ فِى عَبْدِهِ، وَلاَ فَرَسِهِ صَدَقَةٌ ». {الحديث: ٢٢٧٠ = ٢٢٤٨ فم. تجريد/٢/١٢٥، رقم: ٧٠٢ = ١٤٦٣، ١٤٦٤. أبو داود. زكاة: ١٥٩٤، ١٥٩٥. ترمذي. زكاة: ٦٢٨. نسائي. زكاة: ٢٤٦٦، ٢٤٦٧، ٢٤٦٨، ٢٤٦٩، ٢٤٧٠، ٢٤٧١. ابن ماجة. زكاة: ١٨١٢. تحفة الأشراف: ١٤١٥٣}:[٥٦٨]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرموی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (موسوڵمان لەم دوو شتەیدا زەکاتی لەسەر نییە: لە وڵاخی بەرزەی داو، لە کۆیلەیدا) واتە: ماینو ئەسپو کۆیلە ژن بێ، یا پیاو. بەمەرجێ هی بازرگانی نەبن، زەکاتیان لێ ناکەوێ. {تاج/٢/١٦، زنجیرە: ٣، ژمارە: ١١٩٠ چاپی چوارەم}.

## (٣) باب: في تقديم الزكاة ومنعها
## پێشخستنی زەکات، یا نەدانی زەکات

٥٦٩- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عُمَرَ عَلَى الصَّدَقَةِ، فَقِيلَ: مَنَعَ ابْنُ جَمِيلٍ، وَخَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ وَالْعَبَّاسُ عَمُّ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَا يَنْقِمُ ابْنُ جَمِيلٍ إِلاَّ أَنَّهُ كَانَ فَقِيرًا فَأَغْنَاهُ اللَّهُ، وَأَمَّا خَالِدٌ فَإِنَّكُمْ تَظْلِمُونَ خَالِدًا قَدِ احْتَبَسَ أَدْرَاعَهُ وَأَعْتَادَهُ فِى سَبِيلِ اللَّهِ وَأَمَّا الْعَبَّاسُ فَهِىَ عَلَىَّ، وَمِثْلُهَا مَعَهَا ». ثُمَّ قَالَ: « يَا عُمَرُ أَمَا شَعَرْتَ أَنَّ عَمَّ الرَّجُلِ صِنْوُ أَبِيهِ ». {الحديث: ٢٢٧٤ = ٢٢٥٢ فم.

---

[٥٦٨] تجريد/٢، ژمارە: ٧٠٢ = ١٤٦٣، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٠٤ = ٩٨٢ - ٢٣٧٠ شيحا.

تجريد/٢/١٢٩، رقم: ٧٠٦ = ١٤٦٨. نسائي. زكاة: ٢٤٦٦. أبو داود. زكاة: ١٦٢٣. تحفة الأشراف: ١٣٩٢٢} :[٥٦٩]

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خودای لەسـەر بێ) عومـەری نـارد كـردی بەسـەركاری سـەر زەكـات كـە كۆی بكاتـەوە، گـوترا: ئیبنـو جـەمیلو خالیـدی كـوڕی وەلیـدو عەبباسـی مامـەی پێغەمبـەر زەكاتەكـەیان نـەداوە. كـە ئـەم هەواڵـە درا بـە پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئیبنو جەمیل تۆڵەی ئەوە دەستێنێ، كە لەپێش ئیـسلامبوونیدا هـەژار بـوو، لـەپیتو فـەڕی ئیـسلامو، لـە سـایەی خـوداو پێغەمبەرەوە ئێستا دەوڵەمەند بووە، واتە: ئەم كارەی ئیبنـو جـەمیل ئەوپـەڕی سپڵەییو پێنەزانییە، بەڵام ئێوە ناهەقی لەخالید دەكەن، چونكە ئـەو تەنانـەت زرێكەیو چـەكو تفـاقی جـەنگی خـۆیی تـەرخان (وەقف) كـردووە، لەڕێگـەی خودادا، ئیتر چۆن زەكات نـادات، عەبباسی كوڕی عەبدولموتتـەلیبیش، كـە هـەق مامـەی منـە، كـە پێغەمبـەری خـودام، بـەڵێنتان دەدەمـێ ئـەو زەكاتـەی كـە لەسەریەتی دەیدات، وە ئەوەندەی تریش لەگەڵیدا دەبێ بدات.

ئەوجا فەرمووی: (ئەی عومەر! ئەوە نازانی كە مامەی پیاو لەجێی باوكیەتی؟).

{بۆ باسی ئیبنو جەمیل بڕوانە تەجرید ژمارە: ٧٠٦}.

## ڕوونكردنەوە:

١- گەلێجار باسی كەسێ بەخراپە دەكرێ، لـەپێش ئیسلام بـوونیدا، وەك زۆر لەهاوڕێیانی پێغەمبەر -درودی خوای لەسـەر بێ- بگـرە هەنـدێكیان هـەتا ئـەو دەمـەی كـە ئیـسلام بـوون، دژایـەتی ئیـسلامیان كـردووە، بـەڵام لـەپاش

---

[٥٦٩] تجرید/٢، ژمارە: ٧٠٦ = ١٤٦٨، مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٠٥ = ٢٢٧٤.

ئیسلامبوون یەکسەر گۆڕاون‌و لە دوژمنێکی سەرسەختەوە بوون بەدۆستێکی دڵسۆزی ئیسلام.

٢- هەروا جاروبار لەفەرموودەو شتی وادا، بەتایبەت لەکاتی جەرح‌و تەعدیلدا، باسی خراپەی هەندێ کەس دەکرێ، بگرە پێغەمبەر خۆی زەمی هەندێ کەسی کردووە، وەك ئەوە بەکابرایەکی فەرموو: (ڕێگەی پێ بدەن با بێ بۆ لام، بەڕاستی کابرایەکی زۆر بەدە).

وەك لەم فەرموودەیش دا پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- باسی خراپیی ئیبنوجەمیل دەکا. دەبێ لەم جۆرە شوێنانەدا هەڵوێستی ئێمە چی بێ؟ وەڵام: کورت‌و پوخت دەبێ ئێست لەکارەکەدا بکەین، یەکسەر حوکمی ئەو کسە بەپێی ئەو شوێنە نەدەین، بەڵکوو دەبێ چاوەڕوان بکەین، زانا گەورە پسپۆرەکان چییان بڕیارداوە لەو بارەیەوە، ئێمەیش پەیڕەوی بڕیاری ئەوان بکەین، تەنانەت ئەگەر زاناکان لەناوخۆیاندا سەبارەت بەوکەسە ڕایان جیاجیا بوو ئێمە سەرپشکین ڕای کامیان بەهێزتر بوو، ئەو ڕایە دەکەین بە سەرمەشق.

با ئیبنوجەمیل بکەین بەنموونە بۆ ئەم بابەتە:

١- قازی حوسەین -ڕەحمەتی خودای لێ بێ- دەڵێ: ناپاك (منافق) بوە. بەقسەی ئەوبێ گوایە ئەم ئایەتە: ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ عَاهَدَ اللّٰهَ﴾ سەبارەت بەو هاتووە. عەسقەلانی لە ئیصابەدا ئەمە بە (إدعاء) دادەنێ، وە دەفەرموێ: (وا باوو ناسراوە کە ئەم ئایەتە سەبارەت بە ثەعلەبە هاتووە).

٢- موهەللەب -ڕەحمەتی خودای لێ بێ- دەفەرموێ: (ئیبنو جەمیل ناپاك بوو، لەبەرئەوە زەکاتی نەدا، بەڵام کاتێ خودا داوای تەوبەی لێکرد بەم ئایەتە:

﴿وَمَا نَقَمُوا إِلَّا أَنْ أَغْنَاهُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ مِنْ فَضْلِهِ فَإِنْ يَتُوبُوا يَكُ خَيْراً لَهُمْ. التوبة: ٧٤﴾

ئیبنوجەمیل گوتی: پەروەردگارم داوای تۆبەو پەشیمانیم لێدەکا، ئیتر تۆبەی کردو مسوڵمانێکی جوانی لێ دەرچوو.

٣- شێخی عەینی دەفەرموێ: (ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دووپات کردنەوەی مەدحە لەشێوەی زەم دا). عەسقەلانیش هەروا دەفەرموێ.

٤- پێشەوا نەوەوی -ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ- پشتگیری ئیبن قەصار دەکا، کە داستانەکە دەبڕێ بەسەر نەدانی خێری سوننەتداو دەڵێ: (گومانی ئەوە نابرێ بە هاوڕێیانی پێغەمبەر کە فەرز جێبەجێ نەکەن).

**کەواتە: کورت و پوخت:** زۆرینەی فەرمایشتەکان لە بەرژەوەندی ئیبنو جەمیلە، لەبەرئەوە بەر ئەم فەرموودەیە دەکەوێ: (باسی چاکەی مردووتان بکەن و باسی خراپەیان مەکەن). ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لە ئیبنوجەمیل بێ.

## (٤) باب: زكاة الفطر على المسلمين من التمر والشعير
## سەرفیترە لەخورماو جۆیش دەدرێ

٥٧٠- عَنِ عَبْدُ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَرَضَ زَكَاةَ الْفِطْرِ مِنْ رَمَضَانَ عَلَى النَّاسِ: صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، عَلَى كُلِّ حُرٍّ أَوْ عَبْدٍ، ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى مِنَ الْمُسْلِمِينَ. {الحديث: ٢٢٧٥ = ٢٢٥٣ فم. تجريد/٢/١٥٤، رقم: ٧٢٥ = ١٥٠٣، ١٥٠٤، ١٥٠٧، ١٥٠٩، ١٥١١، ١٥١٢.

أبو داود. زكاة: ١٦١١. ترمذي. زكاة: ٦٧٦. نسائي. زكاة: ٢٥٠١. ابن ماجة. زكاة: ١٨٢٦}: [٥٧٠]

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رەزای خودایان لیٚ بیٚ) فەرمووی: پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) مەنیٚ خورما، یا مەنیٚ جۆ، سەرفترەی دانا: لەسەر هەموو موسوڵمانیٚ، ئیتر کۆیلە بیٚ، یا ئازادبیٚ، نیٚرینە بیٚ، یا میٚیینە بیٚ، گەورەبیٚ، یا بچووك) لە تەجریدی بوخاریدا ئەمەی پترە، وە فەرمانیشی کرد: کە لەپیٚش ئەوەدا مەردوم بڕۆن بۆ نویٚژی جەژن، سەرفترەکە بدەن. واتە: واباشە کە سەرفترە نەکەویٚتە دوای نویٚژی جەژن، بەڵکوو لەپیٚشتر بدریٚ). {تاج/٢/٣٦، زنجیرە: ١٥، ژمارە: ١٢٣٠}.

٥٧١- عن عَبْدَ اللَّهِ بن عمر قَالَ أَمَرَ النَّبِيُّ - صلى الله عليه وسلم - بِزَكَاةِ الْفِطْرِ ، صَاعًا مِنْ تَمْرٍ ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ . قَالَ عَبْدُ اللَّهِ - رضى الله عنه - فَجَعَلَ النَّاسُ عِدْلَهُ مُدَّيْنِ مِنْ حِنْطَةٍ. [٥٧١]

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رەزای خودا لەخۆیو لەباوکی) فەرمووی: پیٚغەمبەر (درودی خودای لەسەر بیٚ) لەسەردەمی خۆیدا، فەرمانی کرد، کە سەرفترە بدریٚ، سەرفترەی یەك کەس مەنیٚ خورما بوو، یان مەنیٚ جۆ بوو، جا لەپاش پیٚغەمبەر (درودی خودای لەسەر بیٚ) خەڵکەکە بەرابەر بەمەنیٚ جۆ، یان مەنیٚ خورما، دوو موددە گەنمیان دەدا.

٥٧٢- عَنْ ابى سعيدٍ الخدريّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: كُنَّا نُخْرِجُ في عهدِ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ الفِطْرِ صَاعاً مِنْ طَعَامٍ أَوْ صَاعَاً مِنْ شَعِيرٍ أَو صَاعَاً مِنْ

---

[٥٧٠] تجريد/٢، ژمارە: ٧٢٥ = ١٥٠٣، مسلم: ٩٨٤ - مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٢٠ = ٢٢٧٥ شيحا.

[٥٧١] بخاري. زكاة: ١٥١١، مسلم: ٢٢٧٧.

تَمْرٍ أَوْ صَاعاً مِنْ إِقِطٍ أَوْ صَاعَاً مِنْ زَبِيبٍ. وَقَالَ أبو سعيد: وَكَانَ طَعَامُنَا الشَّعِيرُ وَالزبيبُ وَالأَقِطُ وَالتَمْرُ). (الحديث ١٥٠٦). [٥٧٢]

ئەبوسەعیدی خودری (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا -دروودی خوای لەسەر بێ- مەنێ خۆراکمان دەدا لەباتی سەرفترە، وەك: مەنێ خورما، یامەنێ جۆ، یامەنێ مێووژ، یامەنێ کەشك) (تاج/٢/٣٥ز – ١٥ –ش/د/ت/ن).

٥٧٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضى الله عنه) قَالَ: كُنَّا نُخْرِجُ إِذْ كَانَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) زَكَاةَ الْفِطْرِ عَنْ كُلِّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ، حُرٍّ أَوْ مَمْلُوكٍ، صَاعًا مِنْ طَعَامٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ أَقِطٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ، فَلَمْ نَزَلْ نُخْرِجُهُ حَتَّى قَدِمَ عَلَيْنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ، حَاجًّا أَوْ مُعْتَمِرًا، فَكَلَّمَ النَّاسَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَكَانَ فِيمَا كَلَّمَ فِيهِ النَّاسَ أَنْ قَالَ: إِنِّي أُرَى أَنَّ مُدَّيْنِ مِنْ سَمْرَاءِ الشَّامِ، تَعْدِلُ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، فَأَخَذَ النَّاسُ بِذَلِكَ. قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَأَمَّا أَنَا فَلاَ أَزَالُ أُخْرِجُهُ كَمَا كُنْتُ أُخْرِجُهُ أَبَدًا مَا عِشْتُ). {الحديث: ٢٢٨١ = ٢٢٥٩ فتح الملهم. تجريد/٢، لاپەڕە: ١٥٤، رقم: ٧٢٦ = ١٥٠٦، ١٥٠٨، ١٥١٠. أبو داود. زكاة: ١٦١٦. ترمذي. زكاة: ٦٧٣. نسائي. زكاة: ٢٥١٠. ابن ماجة. زكاة: ١٨٢٩} : [٥٧٣]

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرفترەمان بەم شێوەیە دەدا، لەبری هەموو سەرێ، بچووك بێ، یا گەورە، ئازادبێ، یا کۆیلە، لەبری هەر سەرێ لەمانە، مەنێ خۆراکمان لەباتی سەرفترە دەدا، وەك مەنێ کەشك، یا مەنێ جۆ،

---

[٥٧٢] تجريد/٢، زمارە: ٧٢٦ = ١٥٠٦، مسلم: ٩٨٥ = ٢٢٨٠.

[٥٧٣] تجريد/٢، زمارە: ٧٢٥ = ١٥٠٣، ١٥٠٤، مختصر صحيح مسلم/٢، زمارە: ٥٢٠ = ٢٢٧٥ = محمد فؤاد عبدالباقي: ٩٨٤.

یا مەنێ خورما، یا مەنێ مێووژ، ئیتر هەر بەم شێوەیە زەکاتی سەرفترەمان دەدا، هەتا سەردەمی جێنشینیی موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان (رەزای خودایان لێ بێ) لەو سەردەمەدا، موعاوییە لە شامەوە هات بۆ حەج، یا هات بۆ عەمرە، گەنمیش پەیدا بوو بوو، جا موعاوییە خۆی لەسەر دوانگە قسەی بۆ مەردووم کرد، یەکێك لە قسەکانی ئەمە بوو فەرمووی: من وادەزانم کە دوو مست (مودد) لەم گەنمەی شام هاوتای مەنێ خورما دەکا).

ئیتر خەڵکیش رەفتاریان بەم قسەیەی ئەوکرد، ئەبو سەعید دەیفەرموو: بەڵام من بەش بەحاڵی خۆم، هەتا ماوم، هەروەك جاران مەن (صاع)ێ دەدەم بە سەرفترە، لەهەموو جۆرە خۆراکێ). {تاج/٢، لاپەڕە: ٣٧، زنجیرە: ١٥، ژمارە: ١٢٣١}.

**روونکردنەوە:**

بەپێی فەرمایشتی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی بیارە، (رەحمەتی خودای لێ بێ)، پێنج وەسق دەکاتە سێ سەد صاع، بەپێوانەی کوردەواری دەکاتە نزیکەی چلو پێنج تەنەکە (شەریعەتی ئیسلام، بەرگی یەکەم، لاپەڕە: ٢٢٢).

کەواتە: تەنەکەیێ دەکاتە شەش صاعو نیو، کەمێ‌پتر، لە (النهایة فِي غَرِيب الحديث والأثر)ی ئیبنولئەثیریشدا دەفەرموێ: صاعێ یەکسانە بەچوار موودد، مووددیش لەلای شافیعیو شەرعزانانی حیجاز دەکاتە رەتلو سێ یەکە رەتلێ، بە رەتلی عیراقی، لەلای ئەبو حەنیفەو شەرعزانەکانی عێراقیش مووددێ دەکاتە دوو رەتڵ، کەواتە: صاع لەلای شافیعیو هاوڕایانی دەکاتە:

$$4 \times 1\frac{1}{3} = \frac{4}{1} \times \frac{4}{3} = \frac{16}{3} = 5\frac{1}{3}$$ ڕەتڵ

لەلای حەنەفییەکانو هاوڕاکانیان صاع دەکاتە: ٤ × ٢ = ٨ رەتڵ.

هەروا مامۆستای بیارە دەفەرموێ: (بزانن هەرکەسێ لەبەر پیری، نەتوانێ بەرۆژوو بێ... واجبە لەجیاتیی رۆژووی هەر رۆژێ (مُدّ)ێك، یەعنی مشتێك، قووت بدا بە فەقیرێك (شەریعەتی ئیسلام، بەرگی یەکەم، لاپەڕە:٢٥٣ باسی رۆژووی مانگی رەمەزانی پیرۆز).

لە (سُبُلُ السَّلَامِ شرحُ بلوغ المرام)یشدا دەفەرموێ: (مودد) پڕ بە هەردوو لەپی دەستە، کە بنووسێنرێن بەیەکەوە، کە نە بنووقێنرێنو نە پانیش بکرێنەوە).

لە مونجیدیشدا دەڵێ: مودد نزیکەی هەژدە لیترە، بە لیتری أفرنجی.

گوتەی پوخت: (صاعو مەنو موددو مشتو ربەو تەغارو رەتڵو لیتر) جۆرێکن لە ئامێری پێوانو کێشان، جا چ خۆیان، وەچ وەرگەڕاویان، جۆرە فەرقو جیاوازییەك، لەنێوان واتای شەرعیو واتای زمانییانا هەیە، گەرچی لەزۆریانا وەجهە تەسمییە رەچاوکراوە، لەنێوان واتای زمانیو زاراوەییاندا.

## (٦) باب: إثم مانع الزكاة
## تۆڵەی تاوانی زەکاتنەدەر

٥٧٤- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ - رضى الله عنه - أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - قَالَ « الْخَيْلُ لِثَلاَثَةٍ لِرَجُلٍ أَجْرٌ ، وَلِرَجُلٍ سِتْرٌ ، وَعَلَى رَجُلٍ وِزْرٌ ، فَأَمَّا الَّذِى لَهُ أَجْرٌ فَرَجُلٌ رَبَطَهَا فِى سَبِيلِ اللَّهِ ، فَأَطَالَ فِى مَرْجٍ أَوْ رَوْضَةٍ ، فَمَا أَصَابَتْ فِى طِيَلِهَا ذَلِكَ مِنَ الْمَرْجِ أَوِ الرَّوْضَةِ كَانَتْ لَهُ حَسَنَاتٍ ، وَلَوْ أَنَّهَا قَطَعَتْ طِيَلَهَا فَاسْتَنَّتْ شَرَفًا أَوْ شَرَفَيْنِ كَانَتْ أَرْوَاثُهَا وَآثَارُهَا حَسَنَاتٍ لَهُ ، وَلَوْ أَنَّهَا مَرَّتْ بِنَهَرٍ فَشَرِبَتْ مِنْهُ وَلَمْ يُرِدْ أَنْ يَسْقِيَهَا كَانَ ذَلِكَ حَسَنَاتٍ لَهُ ، وَرَجُلٌ رَبَطَهَا فَخْرًا وَرِئَاءً وَنِوَاءً لأَهْلِ الإِسْلاَمِ فَهْىَ وِزْرٌ عَلَى ذَلِكَ » . وَسُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - عَنِ الْحُمُرِ ،

فَقَالَ « مَا أُنْزِلَ عَلَيَّ فِيهَا إِلاَّ هَذِهِ الآيَةُ الْجَامِعَةُ الْفَاذَّةُ ( فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ * وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ). [٥٧٤]

**ئەمە دەقى فەرموودەى ژمارە (٥٠٧) لە (مختصرصحيح مسلم)دا، بۆ روونكردنەوەى ئەم بابەتە ئەم دەقە راگوێزدەكەين:**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَا مِنْ صَاحِبِ ذَهَبٍ وَلاَ فِضَّةٍ لاَ يُؤَدِّى مِنْهَا حَقَّهَا، إِلاَّ إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ صُفِّحَتْ لَهُ صَفَائِحَ مِنْ نَارٍ فَأُحْمِىَ عَلَيْهَا فِى نَارِ جَهَنَّمَ، فَيُكْوَى بِهَا جَنْبُهُ وَجَبِينُهُ وَظَهْرُهُ، كُلَّمَا بَرَدَتْ أُعِيدَتْ لَهُ، فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ فَيُرَى سَبِيلُهُ، إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إِلَى النَّارِ ». قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَالإِبِلُ؟ قَالَ: « وَلاَ صَاحِبُ إِبِلٍ لاَ يُؤَدِّى مِنْهَا حَقَّهَا، وَمِنْ حَقِّهَا حَلَبُهَا يَوْمَ وِرْدِهَا، إِلاَّ إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ بُطِحَ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ، أَوْفَرَ مَا كَانَتْ، لاَ يَفْقِدُ فَصِيلاً وَاحِدًا مِنْهَا، تَطَؤُهُ بِأَخْفَافِهَا، وَتَعَضُّهُ بِأَفْوَاهِهَا، كُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ أُولاَهَا، رُدَّ عَلَيْهِ أُخْرَاهَا، فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ، فَيُرَى سَبِيلُهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إِلَى النَّارِ ». قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: فَالْبَقَرُ وَالْغَنَمُ؟ قَالَ: « وَلاَ صَاحِبُ بَقَرٍ وَلاَ غَنَمٍ، لاَ يُؤَدِّى مِنْهَا حَقَّهَا، إِلاَّ إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ بُطِحَ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ، لاَ يَفْقِدُ مِنْهَا شَيْئًا لَيْسَ فِيهَا عَقْصَاءُ، وَلاَ جَلْحَاءُ وَلاَ عَضْبَاءُ، تَنْطِحُهُ بِقُرُونِهَا وَتَطَؤُهُ بِأَظْلاَفِهَا، كُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ أُولاَهَا رُدَّ عَلَيْهِ أُخْرَاهَا فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ، فَيُرَى سَبِيلُهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إِلَى النَّارِ، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَالْخَيْلُ؟ قَالَ: « الْخَيْلُ ثَلاَثَةٌ: هِىَ لِرَجُلٍ وِزْرٌ، وَهِىَ لِرَجُلٍ سِتْرٌ، وَهِىَ لِرَجُلٍ أَجْرٌ. فَأَمَّا الَّتِى هِىَ لَهُ وِزْرٌ، فَرَجُلٌ رَبَطَهَا رِيَاءً وَفَخْرًا وَنِوَاءً عَلَى أَهْلِ الإِسْلاَمِ، فَهِىَ لَهُ وِزْرٌ، وَأَمَّا الَّتِى هِىَ لَهُ سِتْرٌ، فَرَجُلٌ

---

[٥٧٤] تجريد/٢، ژمارە: ٦٧٠ - ١٤٠٢، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٠٧ - ٢٢٨٧ - ترقيم محمد فؤاد: ٩٨٧.

رَبَطَهَا فِى سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ لَمْ يَنْسَ حَقَّ اللَّهِ فِى ظُهُورِهَا وَلاَ رِقَابِهَا، فَهِىَ لَـهُ سِتْرٌ، وَأَمَّـا الَّتِى هِىَ لَهُ أَجْرٌ، فَرَجُلٌ رَبَطَهَا فِى سَبِيلِ اللَّهِ لأَهْلِ الإِسْلاَمِ فِى مَرْجٍ وَرَوْضَةٍ فَمَا أَكَلَتْ مِنْ ذَلِكَ الْمَرْجِ أَوِ الرَّوْضَةِ، مِنْ شَىْءٍ إِلاَّ كُتِبَ لَهُ عَدَدَ مَـا أَكَلَـتْ حَسَنَاتٌ، وَكُتِـبَ لَـهُ عَدَدَ أَرْوَاثِهَا وَأَبْوَالِهَا حَسَنَاتٌ وَلاَ تَقْطَعُ طِوَلَهَا فَاسْتَنَّتْ شَرَفًا أَوْ شَرَفَيْنِ، إِلاَّ كَتَبَ اللَّهُ لَهُ عَدَدَ آثَارِهَا وَأَرْوَاثِهَا حَسَنَاتٍ، وَلاَ مَرَّ بِهَا صَاحِبُهَا عَلَى نَهْرٍ فَشَرِبَتْ مِنْـهُ وَلاَ يُرِيـدُ أَنْ يَسْقِيَهَا إِلاَّ كَتَبَ اللَّهُ لَهُ عَدَدَ مَا شَرِبَتْ حَسَنَاتٍ ». قِيلَ: يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ: فَـالْحُمُرُ؟ قَالَ: « مَا أُنْزِلَ عَلَىَّ فِى الْحُمُرِ شَىْءٌ إِلاَّ هَذِهِ الآيَةُ الْفَاذَّةُ الْجَامِعَةُ: (فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْـرًا يَـرَهُ، وَمَـنْ يَعْمَـلْ مِثْقَـالَ ذَرَّةٍ شَـرًّا يَـرَهُ)». {الحديث: ٢٢٨٧ = ٢٢٦٥ فـم. تجريـد/٢/٩٥، رقـم: ٦٧٠ = ١٤٠٢، ٢٣٧٨، ٣٠٧٣، ٩٦٥٨ + ١٠٤٢ = ٢٣٧١، ٢٨٦٠، ٣٦٤٦، ٤٩٦٢، ٤٩٦٣، ٧٣٥٦. نـسائي. خيـل: ٣٥٦٥. تحفـة الأشـراف: ١٢٣١٦}:

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسـەر بێ) دەفـەرموێ: (ئەوکەسـەی خـاوەنی زێـڕو زیوبێو زەکـاتی لێ دەرنـەکا، لـەڕۆژی قیامەتـدا، ئـەو زێـڕو زیـوە سـوور دەکرێتـەوە، لـەناو ئـاگری دۆزەخـا، تادەبـێ بەیـەك پلێـتو یـەك پارچـە ئـاگری سـوور، ئـەوجا تەنیـشتیو ناوچەوانیو پشتیو هەموو لەشی تری پێی داخ دەکـرێ، هـەموو جارێ کەسـارد دەبێتـەوە، سـەرلەنوێ سـوور سـووری دەکەنـەوە بـۆیو دیـسان وای لێ دەکەنـەوە، ئیتر لەو ڕۆژەدا کە پەنجا هەزار ساڵ درێژە، ئـەو کابرایـە ئەمـە حاڵـیەتی، هـەتا دادگایی بەندەکان لەناو خۆیانـا لـە دادگـای خـودادا تـەواو دەبـێ، ئـەوجا ڕێگـەی خۆی پێ نیشان دەدرێ، سا یا بۆ بەهەشت، یا بۆ دۆزەخ.

گوتـرا: ئەی پێغەمەری خـودا! ئـەی بڕیـاری وشـتر چییە؟! فـەرمووی: (وە ئەوەی کەخاوەنی وشتربێو، مافی مافدارانی لێ نەدات کە یەکێ لەو مافانـەی کە

لەوشتردا هەن ئەومیە: ئەو رۆژەی کە وشترەکە دەبەن بۆ سەرئاوو ئاو دەدرێو دەدۆشرێ، لەو شیرەی ئەو رۆژەیشدا، مافی هەژارانی واتیادا، وەك خەرمانلۆغەی خەرمانی دانەوێڵە، ئەو خاوەن وشترەی کە مافی مافدارانی لێ نەدا، لەرۆژی قیامەتدا، لە دەشتێکی کرکای کرکدا، لەسەردەم، رایدەخەن بۆ ئەو وشترانە، وە تابڵێیت زل زلو فیلەتەنو قەبەنو، یەك پارینەشیان کەم نییە، ئیتر ئەوانیش بەپێ دەیشێلنو، بەدەم دەیگەزنو قەپی لێ دەگرن، گشت جارێ کەدواییەکەیان بەسەریدا تێدەپەرێ، دیسانەوە بەراییەکەیان دەگێڕنەوە بۆسەری، ئیتر ئەمە حاڵیەتی لەو رۆژەدا کە پەنجا هەزار ساڵ درێژە، هەتا دادگاییو دادپرسیی نێوان بەندەکان تەواو دەبێ، ئەوجا رێگەی خۆی پیشان دەدرێ، سایا بۆ بەهەشت یا بۆ دۆزەخ.

گوترا: ئەی پێغەمەری خودا! ئەی رەشە وڵاخو مەڕو بزن؟!

فەرمووی: (وە ئەوەی خاوەنی رەشە وڵاخو مەڕو بزن بێ، مافی هەژارانیان لێ نەداو زەکاتی شەرعییان لێ دەرنەکا، لەرۆژی زینەوەدا، لە قیامەتدا، لە دەشتێکی کرکای کرکا، لەسەردەم بۆیان تەخت دەکرێ، ئەو ئاژەڵە لەو کاتەدا، نە تاقە یەکێکیان کەمە، نە شاخ بادراوێکیان واتیادا، نە کۆڵێ، نە شاخ شکاوێ، بەڵکوو هەموو زرتو زیتو بزو ئامادەن بۆ شەڕە شۆقو قۆچ وەشاندن، ئیتر بەشاخ دەیدەنە بەرقۆچو، بەسم گێرەی دەکەن، گشت جارێ کەدواییەکەیان بەسەریدا تێدەپەرێ، دیسانەوە بەراییەکەیان دەگێڕنەوە بۆسەری، ئیتر ئەمە حاڵیەتی لەو رۆژەدا کە پەنجا هەزار ساڵ درێژە، هەتا مەحکەمەی نێوان بەندەکان تەواو دەبێ، ئەوجا رێگەی خۆی پێ پیشان دەدرێ، جایا بۆ دۆزەخ، یا بۆ بەهەشت.

گوترا: ئەی پێغەمەری خودا! ئەوا بڕیار (حوکم)ی زێڕو زیوو وشترو ڕەشەوڵاخ و بزن و مەڕمان زانی، ئەی بڕیاری وڵاخی بەرزە چییەو چۆنە!

فەرمووی: (وڵاخی بەرزە سێ جۆرە: بۆ هەندێ پیاو مایەی شەڕە، بۆ هەندێ پیاو پەردەو داپۆشەرە، بۆ هەندێ پیاویش مایەی پاداش و خێرە، مایەی تاوان و شەڕە بۆ کەسێ کە رایدەگرێ بۆ ریاو چاوەو خۆنواندن و شانازی کردن و هەروا بۆ دوژمنایەتی و دژایەتیی گەلی ئیسلام و لەدژی موسوڵمانان بەکاری دەهێنێ!

پەردەو تارایەکی داپۆشەریشە بۆ ئەو پیاوەی کە لەڕێگەی خودادا رایدەگرێ و بۆ ڕوو سووریی هەردوو جیهان، کارو کەسابەتی پێوە دەکاو، ئەو مافەی کەخودا لەسەر ئەو وڵاخەی داناوە، کە برێتییە لە خەباتگێڕان لەسەر پشتی، ئەو مافە فەرامۆش ناکا، لەکاتی خۆیدا ئاوو ئالیکی دەدا، وچانی دەدا، نایڕەتێنێ، مایەی پاداشی باش و خێری زۆریشە بۆ ئەو پیاوەی کە رایدەگرێ، بۆ غەزاکردن و تێکۆشان لەبەر ڕەزای خودا، بۆ بەرژەوەندیی گەلی ئیسلام، لە مێرگێکدا، یا لەمێرغوزارێکا دەیبەستێتەوە، ئیتر ئەو وڵاخە هەرچی بخوات لەو مێرگ و مێرغوزارەو، چەندە لەو لەوەڕە بلەوەڕێ، بە ژمارەی ئەوە چاکەو خێرو خێرات بۆ خاوەنەکەی دەنووسرێ، تەنانەت ئەگەر مەڕبەندەکەی بپسێنێ، یان پەت و گوریسەکەی بپچڕێنێ، وە سەرێ دوو سەر غاربکاو، بای باڵی خۆی بداو، یاری و تەراتێن بکاو، تەنانەت ئەگەر بەبێ سوارەکەیشی تەراتێن بکا، هەتا لەکاتی وایشدا خودا بە ژمارەی شوێن سم و بە ژمارەی تەرس و میزەکەی، چاکەو خێر بۆ خاوەنەکەی دەنووسرێ.

گریمان خاوەنەکەی بەسەر ئاوێکا بردی، نیازی ئەوەیشی نەبێ کە ئاوی بدا، بەڵام وڵاخەکە لە خۆیەوە دەمی نایە ئاوەکەوەو لێی خواردەوە، ئەوە بەقەد ژمارەی ئەو ئاوەی کەدەیخواتەوە چاکەی بۆ دەنووسرێ.

گوترا: قوربان! ئەی بڕیاری شەرع، سەبارەت بە گوێدرێژ چییە؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (لەبارەی گوێدرێژەوە هیچ سرووشێکم بەتایبەتی بۆ نەهاتووە، تەنیا ئەم ئایەتە دانسقەو کەم هاوتایە نەبێ، کە کۆگیرەو تێکرا گشت جۆرە خێرو چاکەیەك، کەم‌و زۆر، دەگرێتەوە، کە دەفەرموێ: {فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ (٧) {وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ (٨) – زلزلة – ٩٩/٧ – ٨}. واتە: هەرکەسێ بەقەی سەنگی تۆسقاڵێ چاکەی کردبێ، پاداشە باشەکەی وەردەگرێ، هەروا هەرکەسێ بەقەی سەنگی تۆسقاڵێ خراپەی کردبێ، پاداشتەکەی وەردەگرێ). {ریاض/٣، زنجیرە: ٢١٦، ژمارە: ١٢١٤ + تاج/٤ چاپی چوارەم، ژمارە: ٤٣٩٤}.

## (٨) باب: تغليظ عقوبة من لا يؤدي الزكاة
## سەختی تۆڵەی کەسێ زەکات نەدات

٥٧٥– عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رضى الله عنه) قَالَ: انْتَهَيْتُ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ جَالِسٌ فِي ظِلِّ الْكَعْبَةِ، فَلَمَّا رَآنِي قَالَ: « الأَخْسَرُونَ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ ». قَالَ: فَجِئْتُ حَتَّى جَلَسْتُ، فَلَمْ أَتَقَارَّ أَنْ قُمْتُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي مَنْ هُمْ؟ قَالَ: « هُمُ الأَكْثَرُونَ أَمْوَالاً، إِلاَّ مَنْ قَالَ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا (مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ وَعَنْ يَمِينِهِ، وَعَنْ شِمَالِهِ) وَقَلِيلٌ مَا هُمْ، مَا مِنْ صَاحِبِ إِبِلٍ وَلاَ بَقَرٍ وَلاَ غَنَمٍ، لاَ يُؤَدِّي زَكَاتَهَا، إِلاَّ جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْظَمَ مَا كَانَتْ وَأَسْمَنَهُ، تَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا وَتَطَؤُهَا بِأَظْلاَفِهَا كُلَّمَا نَفِدَتْ أُخْرَاهَا، عَادَتْ عَلَيْهِ أُولاَهَا حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ ». {الحديث:

٢٢٩٧ = ٢٢٧٥ فم. بخاري. زكاة: ١٤٦٠، ٦٦٣٨. ترمذي. زكاة: ٦١٧. نسائي. زكاة: ٢٤٣٩. تحفة الأشراف: ١١٩٨١} : [٥٧٥]

ئـەبو زەڕ (رەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: چـووم بـۆلای پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسێبەری کەعبەدا دانیشتبوو، کە گەیشتمە لایو چاوی بەمن کەوت، فەرمووی: (سوێندم بەخودای کەعبە زیانمەندترین کەس خۆیانن!).

ئەبو زەڕ فەرمووی: منیش چووم لەخزمەتیدا دانیشتم، بەڵام ئۆقرەم پێ نەگیراو هەڵسامو عەرزیم کرد: ئەی پێغەمەری خودا! باوكو دایكم بەقوربانت بن، ئەوانە كێن كە گەورەترین زیانمەند خۆیانن؟ فەرمووی: (ئەوانە ئەوانەن كە زۆرترین ماڵو سامانیان هەیەو مافی مافدارانی لێ نادەن) ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەهەردوو دەستی ئاماژەی بۆ هەرچوار لای خۆی كرد، بۆ بەردەمیو بۆ پشتیو بۆلای راستیو بۆلای چەپیو فەرمووی: (مەگەر ئەوانەیان كە ئاوا بەهەر چوار لادا، سامان ببەخشنو لەرێگەی خوادا ماڵی خۆیان خەرج بكەن، وە ئەم جۆرە خودا پێداوانەیش زۆر كەمن).

ئەوجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (وە ئەوەی خاوەنی وشتربێ، یاهی رەشەوڵاخ بێ، یاهی مەڕو بزنبێو مافی مافدارانیان لێ نەداو، زەكاتیان لێنەدا، لەرۆژی ژینەوەدا، لە قیامەتدا، لە دەشتێكی كاكی بەكاكی تەختدا، لەسەر سك وەك بەرە رادەخرێ بۆیان، ئەوجا ئەو ئاژەڵە دێن، هەتا بڵێی زل زلو قەڵەو قەڵەون، بە شاخ شۆقی تێ هەڵ دەدەن، بەسم گێرەی دەكەن، هەموو جارێ كەدواییەكەیان تێ دەپەڕێ بەسەریا، دیسانەوە بەراییەكەیان دەگێڕنەوە بۆسەری ئیتر ئەو كابرایە ئەمە حاڵیەتی، تا دادگایی

[٥٧٥] بخاري. زكاه: ١٤٦٠، ٦٦٣٨، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٠٦.

**نێوانی ئەوخەڵکە تەواو دەبێ). {تاج/٢/١٤، زنجیرە: ٣، ژمارە: ١١٨٦}، لێرەدا ئەمەی پترە: {قلتُ مَاشَأنِي، أَيُرى فيَّ شَيءُ، مَاشَأنِي؟} : واتە: لەبەر خۆمەوە گوتم: دەبێ من شتێکی وەهام تێدا بێت کە شایانی ئەوە بم ببم بە زیانمەنترین کەس؟.**

٥٧٦- عَنْ أَبِي ذَرٍّ - رضى الله عنه - قَالَ انْتَهَيْتُ إِلَى النَّبِيِّ - صلى الله عليه وسلم - قَالَ « وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ - أَوْ وَالَّذِى لاَ إِلَهَ غَيْرُهُ ، أَوْ كَمَا حَلَفَ - مَا مِنْ رَجُلٍ تَكُونُ لَهُ إِبِلٌ أَوْ بَقَرٌ أَوْ غَنَمٌ لاَ يُؤَدِّى حَقَّهَا إِلاَّ أُتِىَ بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْظَمَ مَا تَكُونُ وَأَسْمَنَهُ ، تَطَؤُهُ بِأَخْفَافِهَا ، وَتَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا، كُلَّمَا جَازَتْ أُخْرَاهَا رُدَّتْ عَلَيْهِ أُولاَهَا ، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ». (٥٧٦)

**تەواوی واتای ئەم فەرموودەیە لە زنجیرە (٦) لەژمارە: (٥٧٤)دا رابورد.**

## (٩) باب: الترغيب في الصدقة
## هاندان لەسەر خێرکردنو زەکاتدان

٥٧٧- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قال: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي حَرَّةِ الْمَدِينَةِ فَاسْتَقْبَلَنَا أُحُدٌ فَقَالَ: (يَا أَبَا ذَرٍّ) قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: (مَا يَسُرُّنِي أَنَّ عِنْدِي مِثْلَ أُحُدٍ هَذَا ذَهَبًا تَمْضِي عَلَيَّ ثَالِثَةٌ وَعِنْدِي مِنْهُ دِينَارٌ إِلاَّ شَيْئًا أَرْصُدُهُ لِدَيْنٍ إِلاَّ أَنْ أَقُولَ بِهِ فِي عِبَادِ اللَّهِ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ وَمِنْ خَلْفِهِ ثُمَّ مَشَى فَقَالَ: إِنَّ الأَكْثَرِينَ هُمْ الأَقَلُّونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلاَّ مَنْ قَالَ: هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ وَمِنْ خَلْفِهِ وَقَلِيلٌ مَا هُمْ ثُمَّ قَالَ لِي: مَكَانَكَ لا تَبْرَحْ حَتَّى آتِيَك ثُمَّ انْطَلَقَ فِي سَوَادِ اللَّيْلِ حَتَّى تَوَارَى فَسَمِعْتُ صَوْتًا قَدْ ارْتَفَعَ فَتَخَوَّفْتُ أَنْ يَكونَ قَدْ عَرَضَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَرَدْتُ أَنْ آتِيَهُ

---

(٥٧٦) **بخاری. زکاه: ١٤٦٠، ٦٦٣٥، مسلم: ٢٢٩٧.**

فَذَكَرْتُ قَوْلَهُ لِي لا تَبْرَحْ حَتَّى آتِيَكَ فَلَمْ أَبْرَحْ حَتَّى أَتَانِي قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَقَدْ سَمِعْتُ صَوْتًا تَخَوَّفْتُ فَذَكَرْتُ لَهُ فَقَالَ وَهَلْ سَمِعْتَهُ قُلْتُ نَعَمْ قَالَ ذَاكَ جِبْرِيلُ أَتَانِي فَقَالَ مَنْ مَاتَ مِنْ أُمَّتِكَ لا يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ قُلْتُ وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ قَالَ وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ) (الحديث ٢٣٨٨).[٥٧٧]

ئەبوذەڕ(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: شێوان بوو، لەخزمەتی خۆشەویستدا بووم، لەناو خڕە بەردەڵانیەکەی مەدینەدا دەڕۆیشتین، سەیری چیای ئوحودمان دەکرد، فەرمووی(دروودی خوای لەسەر بێ) : ئەبوذەڕ! گوتم: فەرموو بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! واوام لەخزمەتدا فەرمووی: (ئەم کێوی ئوحودە ئەگەر هەمووی زێڕبێ‌و هی من بێ، حەزدەکەم گشتی بەسێ شەو داغان بکەم‌و هەمووی بکەم بەخێرو بەپیاوەتی‌و، یەك دیناری لەلام نەمێنێ، مەگەر ئەو دینارە کە هەڵی بگرم بۆ دانەوی قەرزێ).

ئەوجا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەقیامەتدا، ئەوانەی کەلەدنیادا داراتربوون‌و ماڵ‌و سامانیان زۆرتر بووە، لەوێ لەهەموو کەسێ نەداراترو کەم دەست ترن، مەگەر کەسێ ئاواوئاوا بەهەرچوارلادا لەخێرکردن دریغی‌و کۆتایی نەکا، ئەو جۆرە کەسانەیش بەراستی زۆر کەمن) جا زوهری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) بۆ روونکردنەوەکەی ئاماژەکەی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ، فەرمووی: واتە: بەهەر چوارلای خۆیدا، بەراست‌و چەپدا، خێر بکاو شت ببەخشێ لەڕێگای خودادا.

ئەبوزەڕ فەرمووی: لەپاشا رۆیشتین هەتا فەرمووی: (ئەی ئەبوزەڕ! تۆ لێرەبە لێرە مەبزوێ تا خۆم دێمەوە بۆلات). تەشریفی رۆیشت تالەبەر چاوم

---

[٥٧٧] تجريد/٣، ژمارە: ١٠٤٧ = ٢٣٨٨، مسلم: ٢٣٠١ شيحا.

ون بـوو، بـەڵام زۆر دوور نەکەوتـەوە گـوێم لەغەڵبەغـەڵبو دەنگـەدەنگێ بـوو، گـوتم: دەترسـم کەپێغەمبـەر(دروودی خـوای لەسـەر بـێ) شتێـکی بەسـەر بـێ، ویستم بەشوێنیا بچم بۆ سوراخی ئەو مشتو مڕە، بەڵام ئەوەم بیرکەوتـەوە کـە فەرمووی: لەجێی خۆت مەبزوە تا خۆم دێمەوە بۆلات، کـاتێ تەشـریفی هاتـەوە، باسی ئەو دەنگە دەنگەم بۆی کرد کەبەرگوێم کەوت، فـەرمووی: (بـۆ گوێت لـێ بوو؟!) گوتم: بەڵـێ: فەرمووی: (ئـەوە جبرائیـل بـوو-درروودی لـێ بـێ- تەشـریفی هـات بـۆ لام پێـی فـەرمووم: ئـەی موحەممـەد! مـژدەبێ: هەرکەسـێ لەنەتـەوەی ئیـسلامی تـۆ، لەسـەرەمەرگا، لەسـەر موسـوڵمانەتی بمـرێو لەسـەر شـیركو فرەخـوایی‌و ناموسـوڵمانی نـەمرێ دەچـێتە بەهەشـت!) منـیش گـوتم: ئـەی جبرائیـل! بـادزیو حیـزیش بکـات؟ فـەرمووی: (بەڵـێ، بـادزیو حیـزیش بکـا). (تـاج/١٠ال ٧١+تـاج/٥ ص٢١٧+عمـدة القـارئ ج/٢٣ ص٥٢+٥٠+اقـتران الـنیرین بـەرگی هەشتەم، لاپەڕە/٧٠).

٥٧٨- عَنْ أَبِى ذَرٍّ – رضى الله عنه – قَـالَ خَرَجْـتُ لَيْلَـةً مِـنَ اللَّيَـالِى فَـإِذَا رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – يَمْشِى وَحْـدَهُ ، وَلَـيْسَ مَعَـهُ إِنْـسَانٌ – قَـالَ – فَظَنَنْتُ أَنَّهُ يَكْرَهُ أَنْ يَمْشِىَ مَعَهُ أَحَدٌ – قَالَ – فَجَعَلْتُ أَمْشِى فِى ظِـلِّ الْقَمَـرِ فَالْتَفَـتَ فَرَآنِى فَقَالَ « مَنْ هَذَا » . قُلْتُ أَبُو ذَرٍّ جَعَلَنِى اللَّهُ فِدَاءَكَ . قَالَ « يَا أَبَا ذَرٍّ تَعَالَهْ » . قَالَ فَمَشَيْتُ مَعَهُ سَاعَةً فَقَالَ « إِنَّ الْمُكْثِرِينَ هُمُ الْمُقِلُّونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ، إِلاَّ مَـنْ أَعْطَـاهُ اللَّهُ خَيْرًا ، فَنَفَحَ فِيهِ يَمِينَهُ وَشِمَالَهُ وَبَـيْنَ يَدَيْـهِ وَوَرَاءَهُ ، وَعَمِـلَ فِيـهِ خَيْـرًا » . قَـالَ فَمَشَيْـتُ مَعَهُ سَاعَةً فَقَالَ لِى « اجْلِسْ هَا هُنَا » . قَالَ فَأَجْلَسَنِى فِى قَاعٍ حَوْلَهُ حِجَـارَةٌ فَقَالَ لِى « اجْلِسْ هَا هُنَا حَتَّى أَرْجِعَ إِلَيْكَ » . قَـالَ فَـانْطَلَقَ فِـى الْحَـرَّةِ حَتَّـى لاَ أَرَاهُ فَلَبِثَ عَنِّى فَأَطَالَ اللُّبْثَ ، ثُمَّ إِنِّى سَمِعْتُهُ وَهْوَ مُقْبِلٌ وَهْوَ يَقُولُ « وَإِنْ سَرَقَ وَإِنْ زَنَـى » . قَالَ فَلَمَّا جَاءَ لَمْ أَصْبِرْ حَتَّى قُلْتُ يَا نَبِىَّ اللَّهِ جَعَلَنِـى اللَّـهُ فِـدَاءَكَ مَـنْ تُكَلِّـمُ فِـى

جَانِبِ الْحَرَّةِ مَا سَمِعْتُ أَحَدًا يَرْجِعُ إِلَيْكَ شَيْئًا . قَالَ « ذَلِكَ جِبْرِيلُ – عَلَيْهِ السَّلاَمُ – عَرَضَ لِي فِي جَانِبِ الْحَرَّةِ ، قَالَ بَشِّرْ أُمَّتَكَ أَنَّهُ مَنْ مَاتَ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ ، قُلْتُ يَا جِبْرِيلُ وَإِنْ سَرَقَ وَإِنْ زَنَى قَالَ نَعَمْ . قَالَ قُلْتُ وَإِنْ سَرَقَ وَإِنْ زَنَى قَالَ نَعَمْ ، وَإِنْ شَرِبَ الْخَمْرَ ».(٥٧٨)

ئەبو زەڕ (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: شەوێ دەرچووم، ڕوانیم وا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) تەنیا خۆی دەرچووەو دەڕوا، گومانم وا برد کە حەزدەکا خۆی بەتەنیا بێ، لەبەر ئەوە خۆم لێ ئاشکرا نەکرد، مانگە شەو بوو، لەو شوێنانەوە کە سێبەری مانگە شەوەکە بوو، شوێنی کەوتم، جا ئاوڕی دایەوە، تارمایی منی بینی، فەرمووی: (ئەوە کێیە؟) عەرزیمکرد: منم ئەبو زەڕم، خودا بمکات بەقوربانت، فەرمووی: (ئەی ئەبو زەڕ! وەرە، منیش چووم ماوەیێ لەخزمەتی‌دا ڕۆیشتم، فەرمووی: (لە قیامەتا، ئەوانەی کە لەدونیادا داراتر بوونو ماڵو سامانیان زۆرتر بووە، لەو دونیا لەهەموو کەسێ نەداراترو کەم دەستتر دەبن، تەنیا ئەو کەسانە نەبێ کە خودا لەدونیادا ماڵی ڕەحمەتی پێ بەخشیون، ئەوانیش درێغی لێ ناکەنو بەهەر چوار لادا، بەڕاستو بەچەپا، لەبەردەمیانو، لەپشتیانەوە، خێرو چاکەی پێ دەکەنو لێی دەبەخشنەوە). جا تاوێ لەخزمەتیدا ڕۆیشتم، ئەوجا فەرمووی: (ئالێرەدا دابنیشە تا دێمەوە بۆلات). فەرمووی: لەشوێنێکی تەختایی‌دا داینیشانم، چواردەوری کەڵەکە بەردبوو، ئەوجا فەرمووی پێم: (ئائەلێرەدا دانیشە هەتا خۆم دێمەوە بۆلات!).

فەرمووی: جا لەخرە بەرداوییەکەوە ڕۆیشت هەتا لەبەرچاوم ون بوو، جا ماوەیەکی درێژ مایەوە، هەتا کەگەڕایەوە بۆلای من، بەدەم ڕێگەوە گوێم لێی

(٥٧٨) بخاری: ٢٣٨٨، مسلم: ٢٣٠٢ شیحا.

بوو لەگەڵ کەسێ قسەی دەکرد، وە پێی دەفەرموو: (با دزیش بکاو با حیزیش بکا؟). ئەبو زەڕ فەرمووی: ئیتر کەهاتە بەرەوە خۆم پێ ڕانەگیرا، تا عەرزیمکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خودا بمکات بەقوربانت، ئەوە لەتەنیشتی بەردەڵانە رەشەکەوە لەگەڵ کێدا قسەت دەکرد، قسەکانی تۆم دەبیست بەڵام قسەکانی ئەوم نەدەبیست؟

فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): (ئەوە جوبرائیل بوو، لەکەناری بەردەڵانەکەوە هات بۆلام، فەرمووی: (ئەی موحەممەد! ئەم مژدە خۆشە بدە بەنەتەوەی ئیسلامی خۆت: هەرکەسێ لەگەلی موسوڵمانی تۆ لەسەر باوەڕی ساخ بەخوداو بە پێغەمبەرو بە ئایینی ئیسلام بمرێو هیچ هاوەڵو هاوبەش بڕیارنەدا بۆخوا دەچێتە ناو بەهەشت!! منیش لێیم پرسی: ئەی جوبرائیل! با دزیو باداوێنپیسیش بکا؟ فەرمووی: بەڵێ، با دزیش بکاو با حیزیش بکا، مادام باوەڕی بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هەیەو هاوەڵ بۆ خودا دانانێ دەچێتە بەهەشت، منیش لێم دووبارە کردەوە: با دزیو حیزیش بکا؟ فەرمووی: (بەڵێ. با دزیو حیزیش بکا، با ئارەقیش بخواتەوە).

### (١٠) باب: في الكنازين للأموال والتغليظ عليهم
### هەڕەشەکردن لەوانەی کە هەر پووڵو پارە کەڵەکە دەکەن

٥٧٩- عَنْ أَبِي ذَرّ عن الأَحْنَفَ بْنَ قَيْسٍ حَدَّثَهُمْ قَالَ جَلَسْتُ إِلَى مَلإٍ مِنْ قُرَيْشٍ ، فَجَاءَ رَجُلٌ خَشِنُ الشَّعَرِ وَالثِّيَابِ وَالْهَيْئَةِ حَتَّى قَامَ عَلَيْهِمْ فَسَلَّمَ ثُمَّ قَالَ بَشِّرِ الْكَانِزِينَ بِرَضْفٍ يُحْمَى عَلَيْهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ ، ثُمَّ يُوضَعُ عَلَى حَلَمَةِ ثَدْيِ أَحَدِهِمْ حَتَّى يَخْرُجَ مِنْ نُغْضِ كَتِفِهِ ، وَيُوضَعُ عَلَى نُغْضِ كَتِفِهِ حَتَّى يَخْرُجَ مِنْ حَلَمَةِ ثَدْيِهِ يَتَزَلْزَلُ . ثُمَّ وَلَّى فَجَلَسَ إِلَى سَارِيَةٍ ، وَتَبِعْتُهُ وَجَلَسْتُ إِلَيْهِ ، وَأَنَا لاَ أَدْرِى مَنْ هُوَ فَقُلْتُ لَهُ لاَ أُرَى الْقَوْمَ إِلاَّ قَدْ كَرِهُوا الَّذِى قُلْتَ . قَالَ إِنَّهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ شَيْئًا. قَالَ لِي خَلِيلِي – قَالَ

قُلْتُ مَنْ خَلِيلُكَ قَالَ النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسلم – – « يَا أَبَا ذَرٍّ أَتُبْصِرُ أُحُـدًا » . قَالَ فَنَظَرْتُ إِلَى الشَّمْسِ مَا بَقِيَ مِنَ النَّهَارِ وَأَنَا أُرَى أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ – صـلى الله عليـه وسلم – يُرْسِلُنِي فِي حَاجَةٍ لَهُ ، قُلْتُ نَعَمْ . قَالَ « مَا أُحِبُّ أَنَّ لِي مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا أُنْفِقُهُ كُلَّهُ إِلاَّ ثَلاَثَةَ دَنَانِيرَ » . وَإِنَّ هَـؤُلاَءِ لاَ يَعْقِلُـونَ ، إِنَّمَـا يَجْمَعُـونَ الـدُّنْيَا . لاَ وَاللَّـهِ لاَ أَسْأَلُهُمْ دُنْيَا ، وَلاَ أَسْتَفْتِيهِمْ عَنْ دِينٍ حَتَّى أَلْقَى اللَّهَ.[٥٧٩]

ئەحنـەفی کـوڕی قـەیس (ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: لەگـەڵ کۆمەڵێ پیاوی قورەیشدا دانیشتبووم، پیاوێکی موو زبری، جل زبـری، شێوەزبر هات، لەسەر سەریان ڕاوەستاو سڵاوی لێیان کرد، ئەوجا فـەرمووی: (مـوژدە بـدە بەوانە کە بەناهەق، هەر ماڵو سامانو زێڕو زیو کەڵەکە دەکەنو مـافی ڕەوای خـۆی لێ نـادەن، بـە بـەردێکی داخـی ئـاگرین، دائـەنرێ لەسـەر گـۆی مـەمکیان، لەچـاڵی دەفـەی شـانیانەوە دەرئەچـێ، وە دائـەنرێ لەچـاڵایی دەفـەی شـانیانا، لـەگۆی مەمکیانـەوە دەرئەچـێ!! ئـەو بـەردە داخـە بـەرە بـەرە جێگەکـەی دەسووتێنێو کونی تێ دەکا، هەتا لەودیوەوە دەرئەچێ!!).

ئـەوجا ڕۆیـشتو چـوو پـاڵی دا بـە پایەیەکەوە، منـیش شـوێنی کـەوتمو لەلایا دانیشتم، وە نەمدەزانی کە ئەمە کێیە، جا پێیم گـوت: بـەزەینم، مـن وای بۆدەچم کە ئەو پیاوانە قسەکەی تۆیان بەدڵ نەبوو؟ فەرمووی: ئەوانە هۆشـیان بەهیچ ناشکێ، ئەوە قسەی من نییە، ئەوە دۆستـە خۆشەویستەکەم پێی گوتووم، فەرمووی پێـیم گـوت: دۆسـتە ئازیزەکـەت کێیـە؟ فـەرمووی: (جـارێ پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (ئـەی ئـەبو زەڕ! ئایـا چـیای ئوحـود دەبینی؟) فەرمووی: منیش تەماشایەکی خـۆرم کـرد، تـا بـزانم چـەنی ڕۆژمـاوە، چونکە زەینم بۆئەوە چوو، کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) مەبەستی

---

[٥٧٩] بوخاری: ١٤٠٧، مسلم: ٢٣٠٣، ترقیم شیحا.

لەم پرسیارە ئەوەیە کە بمنێرێ بۆ کارێکی خۆی، جا گوتم: بەڵێ دیبینم. فەرمووی: (حەزدەکەم بەقەد کێوی ئوحود زێڕم هەبێ، هەمووی ببەخشمەوە لەڕێگەی خودادا، تەنیا سێ دیناری نەبێ کە بیدەمەوە بەقەرزا).

ئەوجا ئەبو زەڕ فەرمووی: دیارە کە ئەمانە هۆشیان بە قازانجی خۆیان ناشکێ، هەر خەریکی کۆکردنەوەی پڕوپیتی ئەم جیهانەن، نا بەخودا من داوای خۆشی جیهان لەمانە ناکەم، وە هەتا ئەشچمەوە بەردیوانی خودا، سەبارەت بەبابەتی یاسانامەی خودا پرسیار لەمانە ناکەم!

ئەمەیش ژمارە: (٥٠٨)ی پوختەی موسلیمە:

عَنِ الأَحْنَفِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: كُنْتُ فِى نَفَرٍ مِنْ قُرَيْشٍ، فَمَرَّ أَبُو ذَرٍّ (رضى الله عنه) وَهُوَ يَقُولُ: (بَشِّرِ الْكَانِزِينَ بِكَيٍّ فِى ظُهُورِهِمْ، يَخْرُجُ مِنْ جُنُوبِهِمْ، وَبِكَيٍّ مِنْ قِبَلِ أَقْفَائِهِمْ يَخْرُجُ مِنْ جِبَاهِهِمْ. قَالَ: ثُمَّ تَنَحَّى فَقَعَدَ. قَالَ: قُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: هَذَا أَبُو ذَرٍّ. قَالَ: فَقُمْتُ إِلَيْهِ فَقُلْتُ: مَا شَىْءٌ سَمِعْتُكَ تَقُولُ قُبَيْلُ؟ قَالَ: مَا قُلْتُ إِلاَّ شَيْئًا قَدْ سَمِعْتُهُ مِنْ نَبِيِّهِمْ (صلى الله عليه وسلم)، قَالَ: قُلْتُ: مَا تَقُولُ فِى هَذَا الْعَطَاءِ؟ قَالَ: خُذْهُ فَإِنَّ فِيهِ الْيَوْمَ مَعُونَةً، فَإِذَا كَانَ ثَمَنًا لِدِينِكَ فَدَعْهُ). {الحديث: ٢٣٠٤ = ٢٢٨٢ فم. بخاری. زكاة: ١٤٠٧. تحفة الأشراف: ١١٩٠٠}:

ئەحنەفی کوڕی قەیس (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەگەڵ کۆمەڵێ پیاوی قوڕەیشدا دانیشتبووم، ئەبو زەڕی غەفاری (ڕەزای خودای لێ بێ) تێپەڕیو دەیفەرموو: موژدە بدە بەئەوانە، کە بەناهەق ماڵو سامان کەڵەکە دەکەنو مافی ڕەوای خۆی لێ نادەن، بەداخێکی ئاگرین، کە دەنرێ بە پشتیانا لە لاتەنیشتیانەوە دەردەچێ، وەدەنرێ بە پشتملیانا، لەناوچاوانیانەوە دەردەچێ). فەرمووی: ئەوجا پەڕی گرتو بەتەنها دانیشت، فەرمووی: گوتم: ئەمە کێیە؟ گوتیان: ئەمە ئەبو زەڕە فەرمووی: (جا هەڵسام چووم بۆلای، عەرزیم کرد:

تۆزێ لەمەوبەر گوێم لێت بوو، شتێکت فەرمووو، ئەوە چی بوو؟ فەرمووی: (ئەوەی کە گوتم فەرمایشتی پێغەمبەرە، کە پێغەمبەری هەمموومانە، شتێك نییە کە لەخۆمەوە بیلێم!!). فەرمووی: عەرزیم کرد: ئەی چی دەفەرمووی، سەبارەت بەم بەراتو مووچەیەی کە ئێستە دەوڵەت دەیدا بە ئێمەومانان؟ فەرمووی: وەری بگرە، بەپێی ئەم رۆژگارە دەبێ بە کۆمەکی لەسەر باری ژیان، بەڵام هەرکاتێ بوو بە بەهای فرۆشتنی ئایینەکەت ئەوە وەری مەگرەو وازی لێ بهێنە).

## (١١) باب: الحث على النفقة وتبشير المنفق بالخلف

## هاندان لەسەر شت بەخشینو موژدەدان بە شت بەخش کەخودا بەزیادەوە جێگەی بۆ پڕ دەکاتەوە

٥٨٠- حديث عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ - رضى الله عنه - أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - قَالَ «قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَنْفِقْ أُنْفِقْ عَلَيْكَ - وَقَالَ - يَدُ اللَّهِ مَلأَى لاَ تَغِيضُهَا نَفَقَةٌ ، سَحَّاءُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ - وَقَالَ - أَرَأَيْتُمْ مَا أَنْفَقَ مُنْذُ خَلَقَ السَّمَاءَ وَالأَرْضَ فَإِنَّهُ لَمْ يَغِضْ مَا فِى يَدِهِ، وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ، وَبِيَدِهِ الْمِيزَانُ يَخْفِضُ وَيَرْفَعُ»[٥٨٠]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودای گەورە لە فەرموودەیەکی پیرۆز (حەدیسێکی قودسی)دا دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزاد! ماڵ بەخت بکەو خێر زۆر بکە، تۆڵەت بۆدەکەمەوە، وەتۆ چاوت لەبەندەکانی من بێ، منیش چاوی خێرم لەتۆ دەبێ).

---

[٥٨٠] تجريد/٤٤٨/٤، ژمارە: ١٦٦٦ = ٤٦٨٤، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٢٥ - شيحا: ٢٣٠٥.

فەرمووی: حەزرەت فەرمووشی: (دەستی راستی خودا هەمیشە پڕەو سەرڕێژ دەکا، خەزێنەو گەنجینەی خودا هەمیشە لیپان لیپە لە خێرو بێر، ئەوەتا وا بە بەرچاوەوە، هەمەدەم، شەوو رۆژ، خودای گەورە، بەدرێژایی ساڵ، لێی دەبەخشێ، نازو بەهرە دەرێژێ بەسەر دروستکراوەکانیدا، رزق و رۆزی تێرو تەسەلیان دەدا، بەڵام هیچ کەم ناکا، خۆباش دەزانن ئەوەتی خودا ئاسمانەکان و زەمینی دروست کردووە، چەندەی بەخشیوەتەوە، دیارە کە زۆر زۆری بەخشیوەتەوە، دەسا لەگەڵ ئەوەشدا خەزێنەو گەنجینەی خودا، یەك تاقە دەنك چییە کەمی نەکردووە، وە وەك خۆی ماوە!).

فەرمووی: (وە لەپێش دروستکردنی دروستکراوەکاندا، تەخت و بارەگا (عەرش)ی خودا، لەسەر ئاو بوو، تەرازوویش وا لەدەستەکەی تریداو، بە ئارەزووی خۆی تاوتووی پێ دەکاو، سەر بەرەو ژوورو سەر بەرەو خواری پێ دەکا، لەنگەری دادپەروەری پێ رادەگرێ، بەپێی دانایی خۆی کە لەئێمە پەنهانە. رزق و رۆزیی کەسێ، زیاد دەکاو رۆزیی کەسێکی تر، کەم دەکات، ئەم بەرزەوە دەکاو ئەوی تر نەوی دەکا، ئیتر هەروەها). {تاج/١/٦٤، ژمارە: ١٢٨٥} .

## (١٣) باب: الإبتداء في النفقة بالنفس ثم أهله ثم القرابة
## خێر بۆ خۆت و خوێش ئەوجا بۆ دەروێش

٥٨١- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أنه قَالَ: أَعْتَقَ رَجُلٌ {زاد في روايـة: مـن الأنصار يقال له أبو مذكور} مِنْ بَنِى عُذْرَةَ عَبْدًا لَهُ عَنْ دُبُرٍ {في الرواية الأخرى: يقال له يعقوب} فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَقَالَ: «أَلَكَ مَالٌ غَيْرُهُ؟» فَقَالَ: لاَ، فَقَالَ: « مَنْ يَشْتَرِيهِ مِنِّى؟ ». فَاشْتَرَاهُ نُعَيْمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الْعَدَوِىُّ بِثَمَانِمِائَةِ دِرْهَمٍ، فَجَاءَ بِهَا رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَدَفَعَهَا إِلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: « ابْدَأْ بِنَفْسِكَ فَتَصَدَّقْ عَلَيْهَا فَإِنْ فَضَلَ شَىْءٌ فَلأَهْلِكَ، فَإِنْ فَضَلَ عَنْ أَهْلِكَ شَىْءٌ فَلِذِى

قَرَابَتِكَ، فَإِنْ فَضَلَ عَنْ ذِى قَرَابَتِكَ شَىْءٌ، فَهَكَذَا وَهَكَذَا ». يَقُولُ فَبَيْنَ يَدَيْكَ، وَعَنْ يَمِينِكَ، وَعَنْ شِمَالِكَ). {الحديث: ٢٣١٠ شيحا = ٢٢٨٨ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٧٠ = ٢١٤١، ٢٢٣٠، ٢٣٢١، ٢٤٠٣، ٢٤١٥، ٦٧١٦، ٦٩٤٧، ٧١٨٦} : [٥٨١]

جابیری كوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێكی ئەنصاری لەخێڵی بەنی عوزرە، كەناوی ئەبو مەزكوور بوو، خولامێكی هەبوو ناوی یەعقووب بوو، ئازادی كرد، بەمەرجێ كە لەپاش مردنی خۆی ئازاد ببێ، كە بەمە لەزاراوی شەرعی پیرۆزدا دەگوترێ: مودبەر، واتە: پاشە مەرگە، پیاوەكە هیچ ماڵێكی تری نەبوو، وە داما بۆ ماڵ، جا لەپاشا كە ئەم باسە گەیشتەوە بە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بە ئەبو مەزكووری فەرموو: (ئایا دارایی ترت هەیە، بێجگە لەم كۆیلەیە؟) گوتی: (نەء نیمە) جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كۆیلەكەی خستە سەر سەواو فەرمووی: (كێ ئەم پیاوەم لێ دەكڕێ؟). جا نوعەیمی كوڕی عەبدوڵلای عەدەوی لێی كڕی بەهەشت سەد درەمو پارەكەی هێنا بۆ پێغەمبەرو پێغەمبەر لێی وەرگرتو دای بەخاوەنەكەی، كەناوی ئەبو مەزكوور بوو. لەپاشا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (لەپێشا لەخۆتەوە دەست پێ بكە، ئەگەر ماڵت هەبوو، لەپێشا خێر بەخۆت بكە، جا ئەگەر لەخۆت مایەوە بابۆ خاوو خێزانت بێ، ئەگەر لەوانیش مایەوە بابۆ خزمو خوێشت بێ، ئەگەر لەوانیش مایەوە ئەوا بەهەر چوار لاتا درێغی لەخێر كردنو سامان بەخشین مەكە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٢٠٢٢، ج/٤ + زنجیرە: ٢١، ژمارە: ١٢٧٦}.

---

[٥٨١] مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٨٣ = ٢٣١٠ شيحا. تجريد/٣، ژمارە: ٩٧٠ = ٢١٤١ بخارى.

## (١٤) باب: فضل النفقة والصدقة على الأقربين والزوج والأولاد والوالدين ولو كانوا مشركين

## خێری بەخشینو خێر بەخزمانو بەهاوسەرو بەمناڵی خۆتو بە باوكو دایك، با ناموسوڵمانیش بن

٥٨٢- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رضى الله عنه) قَالَ: كَانَ أَبُو طَلْحَةَ أَكْثَرَ أَنْصَارِيَ بِالْمَدِينَةِ مَالاً، وَكَانَ أَحَبَّ أَمْوَالِهِ إِلَيْهِ بَيْرَحَى وَكَانَتْ مُسْتَقْبِلَةَ الْمَسْجِدِ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَدْخُلُهَا، وَيَشْرَبُ مِنْ مَاءٍ فِيهَا طَيِّبٍ، قَالَ أَنَسٌ: فَلَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: (لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ) قَامَ أَبُو طَلْحَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَقُولُ فِي كِتَابِهِ: (لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ) وَإِنَّ أَحَبَّ أَمْوَالِي إِلَيَّ بَيْرَحَى، وَإِنَّهَا صَدَقَةٌ لِلَّهِ، أَرْجُو بِرَّهَا وَذُخْرَهَا عِنْدَ اللَّهِ، فَضَعْهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ حَيْثُ شِئْتَ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « بَخْ ذَلِكَ مَالٌ رَابِحٌ، ذَلِكَ مَالٌ رَابِحٌ، قَدْ سَمِعْتُ مَا قُلْتَ فِيهَا، وَإِنِّي أَرَى أَنْ تَجْعَلَهَا فِي الأَقْرَبِينَ». فَقَسَمَهَا أَبُو طَلْحَةَ فِي أَقَارِبِهِ، وَبَنِي عَمِّهِ). {الحديث: ٢٣١٢ = ٢٢٩٠ فـم. زكـاة. تجريد/٢/١٢٣، رقم: ٧٠٠ = ١٤٦١، ٢٣١٨، ٢٧٥٢، ٢٧٥٨، ٢٧٦٩، ٤٥٥٤، ٤٥٥٥، ٥٦١١}:[٥٨٢]

ئیمامی ئەنەسی كوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لە مەدینە، ئەبو تەلحە، لەناو یاریدەدەراندا (لەناو ئەنصارەكاندا) لە هەموویان دەوڵەمەندتر بوو، بەتایبەتی باخە خورمای زۆری هەبوو، باخێ خورمای هەبوو ناوی بەیرەحا بوو، بەرابەر قیبلەی مزگەوتەكەی پێغەمبەر بوو، ئەم باخە خۆشەویسترین سامانی بوو، كانیاوێكی سازگاری تیادا بوو، گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی دەچوو لەئاوی ئەو كارێزەی نۆش دەفەرموو.

---

[٥٨٢] تجرید/٢، ژمارە: ٧٠٠ = ١٤٦١، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٢٩ = ٢٣١٢.

ئەنــەس (رەزای خــودای لیّ بــێ) فــەرمووی: جـا کاتــێ ئــەم ئایەتــە هاتــە خوارەوە: {لَن تَنَالُواْ الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ - آل عمـران – ٣/٩٢} . واتـە: ناگەن بە پاداشتی زۆر چاك‌و نایاب‌و خێری هەرە تەواو، هەتا خەرج نەکەن، لە رێگەی خـودادا، لـە ماڵە نایـاب‌و سـامانە خۆشەویـستەکانتان‌و، لـەنازو بـەهرەو نیعمەت‌و پایەو بەهرە باشانەی کە خودا بە ئێوەی داوە). جا کاتـێ ئـەم ئایەتـە هات ئەبو طەلحە هەڵسا چوو بۆ خزمـەتی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) عـەرزی کـرد: قوربـان! خـودای گـەورە لـە قورئـانی پـیرۆزدا، کـە نامـەی خۆیەتی، دەفەرموێ: {لَن تَنَالُواْ الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ} وە منیش باشترین ماڵم بەلامەوە، باخی بەیرەحایە، جا ئەوا ئەو بـاخی بەیرەحایـەم کـرد بـەخێر، سـاخ لەبـەر رەزای خـودا، ئومێـد دەکـەم کـە خـودا بەچـاکە بینووسـێ بـۆم، وە پاشەکەوتی بکا بۆم، بۆ رۆژی دوایـیم، جا تـۆیش ئـەی پێغەمـەری خـودا! خۆت سەرپشك بە، چۆنی بەباش دەزانی ئاوای لیّ بکە،، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەهـ، بـەهـ، لـەم خێـرە جوانـە! بەڕاسـتی مـاڵی بەسـوودو خێردار هەر ئاوا دەبێ! تێـگەیشتم دەڵێی چی، من وا بەباشـی دەزانم کـە بیـدەی بە خزم‌و خوێشانی خۆت!). ئەبو تەلحەش فەرمووی: باشە وادەکەم، ئەوسا ئەبو تەلحە باخەکەی دابەش کرد بەسەر خزم‌و ئامۆزاکانی خۆیدا). {تاج/٢، زنجیرە: ١٨٢، ژمارە: ١٩٥٢ ج/٤} .

٥٨٣- عَنْ مَيْمُونَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ (رضى الله عنها): أَنَّهَا أَعْتَقَتْ وَلِيـدَةً فِـي زَمَانِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَذَكَرَتْ ذَلِـكَ لِرَسُـولِ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسلم) فَقَالَ: « لَوْ أَعْطَيْتِهَا أَخْوَالَكِ كَانَ أَعْظَمَ لأَجْـرِكِ ». {الحديث: ٢٣١٤ = ٢٢٩٢

فـــتح الملـــهم. تجريـــد/٣/١٩٥، رقـــم: ١١٠٦ = ٢٥٩٢، ٢٥٩٤. تحفـــة الأشـــراف: ١٨٠٧٨}:[٥٨٣]

مەیموونەی کچی حاریـث (ڕەزای خـودای لێ بێ) کـە هاوسـەری پێغەمبـەر بوو (دروودی خودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: کـەنیزەکێکم هـەبوو، کۆیلـەم بـوو، ئازادم کرد، بەبێ ئاگا لێبـوونی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) جـا لـە نۆرە سەرەی ڕۆژی خۆمدا، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) شـەو لای من مایەوە، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمەری خـودا! ئایـا دەزانـی کـە کەنیزەکەکـەم ئازادکرد؟ فەرمووی: (ئاها کردت؟ گوتم: ئەرێ فەرمووی: (دەی ئەگەر بتدایە بە خاڵۆکانت پاداشی گەورەتر بوو بۆت!).

٥٨٤- عَنْ زَيْنَبَ امْرَأَةِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رضى الله عنهما) قَالَـتْ: قَـالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « تَصَدَّقْنَ يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ وَلَـوْ مِـنْ حُلِـيِّكُنَّ ». قَالَتْ: فَرَجَعْتُ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ فَقُلْتُ: إِنَّكَ رَجُلٌ خَفِيفُ ذَاتِ الْيَدِ، وَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَدْ أَمَرَنَا بِالـصَّدَقَةِ فَأْتِـهِ فَاسْـأَلْهُ، فَـإِنْ كَـانَ ذَلِـكَ يَجْزِى عَنِّـى، وَإِلاَّ صَرَفْتُهَا إِلَى غَيْرِكُمْ، قَالَتْ: فَقَالَ لِى عَبْدُ اللَّهِ: بَلِ ائْتِيهِ أَنْـتِ، قَالَـتْ: فَانْطَلَقْـتُ فَـإِذَا امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ بِبَابِ رَسُولِ اللَّهِ (صـلى الله عليـه وسـلم) حَـاجَتِى حَاجَتُهَـا قَالَـتْ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَدْ أُلْقِيَتْ عَلَيْهِ الْمَهَابَةُ، قَالَتْ: فَخَـرَجَ عَلَيْنَـا بِلاَلٌ، فَقُلْنَا لَهُ: ائْتِ رَسُولَ اللَّهِ (صـلى الله عليـه وسـلم) فَـأَخْبِرْهُ أَنَّ امْـرَأَتَيْنِ بِالْبَـابِ تَسْأَلاَنِكَ: أَتَجْزِى الصَّدَقَةُ عَنْهُمَا إِلَى أَزْوَاجِهِمَا، وَعَلَى أَيْتَامٍ فِى حُجُورِهِمَا؟ وَلاَ تُخْبِـرْهُ مَنْ نَحْنُ، قَالَتْ: فَدَخَلَ بِلاَلٌ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَـسَأَلَهُ، فَقَـالَ لَـهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): «مَنْ هُمَـا؟». فَقَـالَ: امْـرَأَةٌ مِـنَ الأَنْـصَارِ وَزَيْنَـبُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسـلم): «أَىُّ الزَّيَانِـبِ؟». قَـالَ: امْـرَأَةُ عَبْـدِ اللَّـهِ بْـنِ

[٥٨٣] تجريد/٣، ژمارە: ١١٠٦ = ٢٥٩٢، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٣٠ = ٢٣١٤.

مَسْعُودٍ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لَهُمَا أَجْرَانِ: أَجْرُ الْقَرَابَةِ، وَأَجْرُ الصَّدَقَةِ ». {الحديث: ٢٣١٥ = ٢٢٩٣ فـم. زكـاة. تجريد/٢/١٢٧، رقم: ٧٠٤ = ١٤٦٦. ترمذي. زكـاة: ٦٣٥، ٦٣٦. ابن ماجة. زكـاة: ١٨٣٤ تحفة الأشراف/١٥٨٨٧}:(٥٨٤)

زەینەبی ژنی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی ژن گەل! خێرو خێرات بکەن، ئەگەر خشڵی بەری خۆتان کردووە بەخێر بیکەن). فەرمووی: منیش چوومەوە بۆماڵەوە بە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودم گوت: تۆ پیاوێکی دەست کورتی، پێغەمبەریش (درووودی خودای لەسەر بێ) بە ئێمەی ژنانی فەرموو کە خێربکەن، جا تۆ بچۆ بۆلای و لێی بپرسە: ئەگەر خێرەکەم بدەم بە ئێوە، برێتی خێر دەکەوێ؟ دەنا دەیبەم بۆ کەسێکی تر کەپێی بشێ. عەبدوڵڵا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەڵکوو خۆت بچۆ بۆ خزمەتی، منیش کە چووم روانیم کە ئافرەتێکی ئەنصاریش لە دەرگاکەی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) راوەستابوو، ئەویش وەك من بۆ هەمان پرسیار هاتبوو، ئەوسەردەمەیش پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) گەلێ بەسام بوو، لەخوداوە شەرم و شکۆی لێ دەکرا، جا بیلال هاتە دەرەوە بۆلامان و پێمان گوت: بچۆ عەرزی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) بکە بڵێ: کە دوو ژن وان لەبەردەرگا، پرسیارت لێ دەکەن: ئایا دروستە کە خێرەکانیان بدەن بە مێردەکانیان و بەچەند هەتیوێ کەوان لەلای خۆیان و خۆیان هەقداریانن، وە عەرزی مەکە کە ئێمە کێین، جا بیلال رۆیشتەوە بۆ ژوورەوە بۆلای حەزرەت (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کێ و کێن؟). بیلال فەرمووی: ژنێکی

---

(٥٨٤) تجريد/٢، ژمارە: ٧٠٤ = ١٤٦٦، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٢٨ = ٢٣١٥.

ئەنصاریو زەینەبن، دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): (کام زەینەب؟). دەفەرموێ: ژنەکەی ئیبنو مەسعوود، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەوە لەباتی پاداشتێ دوو پاداشتیان بۆ هەیە: پاداشتی خزمایەتیو پاداشتی خێرکردن). {ریاض/١/٢٦٢، زنجیرە: ٤٠، ژمارە: ٣٢٦} + {تاج/١، زنجیرە: ٣، ژمارە: ١٨}.

٥٨٥- عَنْ أمّ سَلَمَةَ رضي الله عنها قالَتْ: قُلْتُ: يَارَسُولَ اللهِ أليَ أَجْرٌ أنْ أُنْفِقَ عَلى بَني أبي سَلَمَةَ إنّما هُمْ بَنِيَّ ؟ فَقَالَ: (أنْفِقِي عَلَيْهِمْ فَلَكِ أجْرُ مَا أنْفَقِتِ عَلَيْهِمْ). (الحديث ١٤٦٧- طرفه في ٥٣٦٩).[٥٨٥]

ئوم سەلەمە -رەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! چەند منداڵێکم هەیە لە ئەبوسەلەمەی مێردی پێشووم، هێشتا لەهەتیوی دەرنەچوون، ئایا خێرم دەگا ئەگەر مەسرەفیان بۆ بکەم وەکی تریش خۆ ناتوانم بەرەڵاشیان بکەم بەم لاو بەم لادا، چونکە منداڵی خۆمن؟! فەرمووی: (مەسرەفیان بکە، ئەو مەسرەفەی بۆیان دەکەی، پاداشتی باشی هەیە بۆت).

٥٨٦- عَنْ أَبِى مَسْعُودٍ الْبَدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « إِنَّ الْمُسْلِمَ إِذَا أَنْفَقَ عَلَى أَهْلِهِ نَفَقَةً، وَهُوَ يَحْتَسِبُهَا كَانَتْ لَهُ صَدَقَةً ». {الحديث: ٢٣١٩ = ٢٢٩٧ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٩٧ = ٥٣٥١ فتح البارى = ٥١. تجريد = ٥٥ فتح البارى. ترمذى. برصلة: ١٩٦٥. نسائى. زكاة: ٢٥٤٤. رياض/١/٢٩٣، زنجيره: ٢٦}:[٥٨٦]

ئەبو مەسعوودی بەدری (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەر موسوڵمانێ لەبەر رەزای خودا.

---

[٥٨٥] تجريد/٢، ژمارە: ٧٠٥ = ١٤٦٧، ٥٣٦٩، مسلم: زكاة: ١٠٠١ = ٢٣١٧.

[٥٨٦] تجريد/٥، ژمارە: ١٧٩٧ = ٥٣٥١، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٨٦ = ٢٣١٩.

مەسرەفی ماڵو منالّی خۆی بكا، هەرچییان بۆ خەرج بكا، كەم بێ یازۆر، بەخێرو خێرات دائەنرێ بۆی). {تاج/٢، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ١٢٧٩}.

٥٨٧- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبي بكر (رضى الله عنهما) قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّهِ إِنَّ أُمِّي قَدِمَتْ عَلَيَّ وَهْيَ رَاغِبَةٌ - أَوْ رَاهِبَةٌ - أَفَأَصِلُهَا؟ قَالَ: « نَعَمْ ». {الحديث: ٢٣٢١ = ٢٢٩٩ فـم. تجريد/٣/٢٠٠، رقم: ١١١٢ = ٢٦٢٠، ٣١٨٣، ٥٩٧٨، ٥٩٧٩. أبو داود. زكاة: ١٦٦٨. تحفة الأشراف: ١٥٧٢٤}: [٥٨٧]

ئەسمائی كچی ئەبوبەكری صدیق (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە مەدینە قوتەیلەی دایكم لە مەككەوە هات بۆلام، لەكاتی رێكەوتنەكەی حودەیبییەدا، عەرزی حەزرەتم كرد: ئەی پێغەمەری خودا! دایكم هاتووە بۆ سەردانم، بەتەمای ئەوەیشە كە یارمەتی بدەمو دیاریو دەسەنەی پێ بدەم، جا ئایا سیلەی رەحمی دایكم بەجێ بهێنم یانا؟ فەرمووی: (بەڵێ، سیلەی رەحمی دایكت بەجێ بهێنە، گەرچی نا موسوڵمانیشە، بەلاّم لەبەرئەوەی كە دایكتە مافی ئەوەی هەیە لەسەرت كە سیلەی رەحمی بەجێ بهێنی). {ریاض/١/٢٦٢، ژمارە: ٣٢٥}.

## (١٥) باب: وصول ثواب الصدقة عن الميت إليه
## خێركردن بۆ مردوو دروستەو پێی دەگات

٥٨٨- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها): أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّهِ! إِنَّ أُمِّيَ افْتُلِتَتْ نَفْسَهَا وَلَمْ تُوصِ، وَأَظُنُّهَا لَوْ تَكَلَّمَتْ

---

[٥٨٧] تجرید/٣، ژمارە: ١١١٢ = ٢٦٢٠ بخاری، مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٣١ = ٢٣٢١.

تَصَدَّقَتْ، أفَلَهَا أجْرٌ، إنْ تَصَدَّقْتُ عَنْهَا؟ قَالَ: « نَعَمْ ». {الحديث: ٢٣٢٣ = ٢٣٠١ فم. تجريد/٣/٨٤، رقم: ٦٦٢ = ١٣٨٨، ٢٧٦٠}:[٥٨٨]

عائيشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سەعیدی کوڕی عوبەیدە (ڕەزای خودای لێ بێ) عەرزی پێغەمبەری کرد (دروودی خودای لەسەر بێ)، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! دایکم لەناکاو مرد، فریا نەکەوت کە راسپێری و وەسێت بکا، تا خێری بۆ بکەین، وەها دەزانم ئەگەر مەودای قسەکردنی ببوایە خێرێکی بڕیار دەدا بۆ خۆی، کە لەپاش مردنی بۆی بکرێ، جا ئایا خێری دەگا ئەگەر من ئێستا، لەجیاتی خۆی خێری بۆ بکەم؟ فەرمووی: (بەڵێ خێری دەگا بۆیبکە). {تاج/١/٥٨١، زنجیره: ٢٢٩، ژماره: ١١٦٨ + ١١٦٩ + ١١٧٠ + زنجیره: ١٩ + ١١٥٢} + {ریاض/٣/٣، زنجیره: ١٦٢، ژماره: ٩٤٨}.

### (١٦) باب: بيان أن إسم الصدقة يقع على كل نوع من المعروف
### ناوی خێری (صەدەقە) هەموو جۆرە چاکەیە دەگرێتەوە

٥٨٩- عَنْ أبي مُوسى رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ عَنِ النَبِيِّ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (عَلى كُلِ مُسْلِم صَدَقَةٌ). فَقَالُوا: يَانَبِيَّ اللهِ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ؟ قَالَ: (يَعْمَلَ بِيَدِهِ، فَيَنْفَعُ نَفْسَهُ وَيَتَصَدَّقُ). قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَجِدْ؟ قَالَ: (يُعِينُ ذَا الحَاجَةِ المَلْهُوفَ). قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَجِدْ؟ قَالَ: (فَلْيَعْمَلْ بِالمَعْرُوفِ وَلْيُمْسِكْ عَنِ الشَّرِّ، فَإِنَّهَا لَهُ صَدَقَةٌ). (الحديث ١٤٤٥ – طرفه في: ٦٠٢٢).[٥٨٩]

ئەبوموسا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (هەموو مسوڵمانێ لەسەریەتی کە خێری بکا) عەرزیان

---

[٥٨٨] مختصر صحيح مسلم/٢، ژماره: ٥٣٢ = ٢٣٢٣، تجريد/٣، ژماره: ٦٦٢ = ١٣٨٨.

[٥٨٩] تجريد/٢، ژماره: ٦٩٢ = ١٤٤٥، ٦٠٢٢، مسلم: ١٠٢١ = ٢٣٣٠.

كـرد: ئـەی پێغەمبـەری خودائـەی ئەگـەر مـسوڵمانێ نـەیبوو چۆن؟ فـەرمووی: (قۆڵی لێهەڵماڵیو ئیش بکا، هەم خۆی بـەخێو بکـا، هـەم خێـریش لەدەسـکەوتی کارەکەی بکا). گوتیان: ئەی ئەگەر ئەمەی بۆ نەکرا چۆن؟ فـەرمووی: (یاریـدەی لێقـەوماوێکی دامـاو بـدات) گوتیـان: ئـەی ئەگـەر ئەمەشـی بـۆ نـەلوا چـی بکـا؟ فەرمووی: (بارەفتاری جوان بێو کاری باش بێو ڕێگەی باش بەخەڵك بڵێو واز لەخراپــە بێنــێ، ئەمـــەیش دەبـــێ بـــە گـــەورەترین خێـــرو خێـــرات بۆی).(ریاض/١/١٣٣/ ژ/١٤١ ز/١٣).

٥٩٠- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ - رضى الله عنه - قَالَ قَالَ رَسُـولُ اللَّـهِ - صـلى الله عليه وسلم - « كُلُّ سُلاَمَى مِنَ النَّاسِ عَلَيْهِ صَدَقَةٌ كُلَّ يَوْمٍ تَطْلُعُ فِيهِ الشَّمْسُ ، يَعْـدِلُ بَيْنَ الاِثْنَيْنِ صَدَقَةٌ ، وَيُعِينُ الرَّجُلَ عَلَى دَابَّتِهِ ، فَيَحْمِلُ عَلَيْهَـا ، أَوْ يَرْفَـعُ عَلَيْهَـا مَتَاعَـهُ صَدَقَةٌ ، وَالْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ ، وَكُلُّ خَطْوَةٍ يَخْطُوهَا إِلَـى الـصَّلاَةِ صَـدَقَةٌ ، وَيُمِـيطُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ».[٥٩٠]

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبــەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (هـەموو ڕۆژێ کـەخۆری تیـا هەڵـدێت، گـشت جومگـەو ئێـسکێکی ئـادەمیزاد، خێرێکـی دەکەوێتـە سـەر، جـا دووکـەس ڕێـك دەخات ئەوە خێرێکە، یارمەتی برادەرەکـەی دەدا هـەتا سـواری وڵاخەکـەی ببـێ، ئـەوەیش خێرێکـە، یـا شمەکەکـەیی لـە وڵاخەکـەی بارئـەکا ئـەویش خێرێکـە، قسەیەکی خۆش خێرێکە، هەروا وشەیەکی باش خێرێکـە، هـەموو هـەنگاوێ کـە دەینێو دەچێ بۆ نوێژ خێرێکە، ئازارێ لەسەرەڕێ لائەبا خێرێکە).

---

[٥٩٠] بخاری: ٢٧٠٧، ٢٨٩١، ٢٩٨٩، مسلم: ٢٣٣٢.

## (١٧) بابُ: في المنفق وَالْمُمْسِكِ

## باسی سەخیو رەزیل

٥٩١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَا مِنْ يَوْمٍ يُصْبِحُ الْعِبَادُ فِيهِ إِلاَّ مَلَكَانِ يَنْزِلاَنِ فَيَقُولُ أَحَدُهُمَا اللَّهُمَّ أَعْطِ مُنْفِقًا خَلَفًا. وَيَقُولُ الآخَرُ اللَّهُمَّ أَعْطِ مُمْسِكًا تَلَفًا ». {الحديث: ٢٣٣٣ = ٢٣١١ فـم. تجريد/٢/١١٣، رقم: ٦٩١ = ١٤٤٢}:(٥٩١)

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویێ: (هەموو رۆژێ سەر لەبەیانی کە بەندەکان رۆژیان لێ دەبێتەوە، دوو فریشتە دێنە خوارەوە، یەکێکیان دەفەرموێ: خودایە! ئەوەی بەخشندەیە، تۆیش پێی ببەخشەو، تۆڵەی بەزیادەوە بۆ بکەرەوە، ئەوی تریشیان دەفەرموێ: خودایە! ئەوەی چرووكو گیرو خێرنەکەرە، تۆش لەوی بگرەوەو ئایەو مایەی بفەوتێنە). {ریاض/١/٢٤٧، زنجیرە: ٣٦، ژمارە: ٢٩٥} + {تاج/٢، زنجیرە: ١، ژمارە: ١١٧٧}.

### روونکردنەوە:

ئەوەوی (پڕگۆڕی پیرۆزی لەنووری خودابێ) دەفەرموێ: زاناکان دەفەرموون: مەبەست لەم بەخشینە هەموو شتێکە کە سەرف بکرێ بۆ پەرستشو خوا پەرستی، وەك زەکاتو خەرجی حەجو سەفەری سیلەی رەحمو پیاوەتیو مەسرەفی خێزانو دیوەخانو خێرو خێراتو شتی تری لەم بابەتە. مەبەست لە گیریو دەستنووقاویش، خۆگرییە لەم جۆرە کارە باشانە، با کابرا رۆژی هەزار لیرەی زێڕیش لەکاری خراپا داغان بکا، خوا پەنامان بدا.

## (١٨) باب: في الترغيب في الصدقة قبل أن لايوجد من يقبلها

---

(٥٩١) تجريد/٢، ژمارە: ٦٩١ - ١٤٤٢، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٤٩ - ٢٣٣٣.

## هاندان لەسەر خێرکردن بەرلەوەی کە خێرکەر کەسی دەست نەکەوێ، کە خێری لێ وەربگرێ

٥٩٢- عَنْ حَارِثَةَ بْنَ وَهْبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ:(تَصَدَّقُوا، فَإِنَّهُ يَأْتِي عَلَيْكُمْ زَمَانٌ يَمْشِي الرَّجُلُ بِصَدَقَتِهِ فَلَا يَجِدُ مَنْ يَقْبَلُهَا، يَقُولُ الرَّجُلُ لَوْجِئْتَ بِهَا بِالْأَمْسِ، لَقَبِلْتُهَا، فَأَمَّا الْيَوْمَ فَلَا حَاجَةَ لِي بِهَا). (الحديث: ١٤١١ طرفاه في: ١٤٢٤، ٧١٢٠): [٥٩٢]

حاریثە ی کوڕی وەهب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی خۆشەویستم بیست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: (تازوو خێربکەن درەنگە هاکا کەوتنە ڕۆژگارێکی واوە کەستان دەست ناکەوێ، کەخێرتان لێ وەربگرێ، هاکا وای لێهات پیاو بەماڵی خێرەوە بەسەر خەڵکا بسوڕێتەوە بەڵام کەسی وای دەست ناکەوێ کە لێی وەربگرێ، بەڵکوو ئەو کەسەی کەخێرەکەی دەداتێ پێی دەڵێ: ئەگەر دوێنێ بهاتیتایە لێتم وەردەگرتی، بەڵام ئێستا کارم پێی نییە، لەبەرئەوە وەری ناگرم ! لەئەنجامدا کەسی دەست ناکەوێ کەخێرەکەی لێ وەربگرێ). (تاج/١٠ ل/٧٣ ف/٤ — ش = تاج/٥، ژمارە: ٥٢٢٢).

٥٩٣- عن أبي مُوسى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَبِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: (لَيَأتِيَنَّ عَلَى الناس زَمانٌ، يَطُوفُ الرَّجُلُ فِيهِ بِالصَّدَقَةِ مِنَ الذَّهَبَ، ثُمَّ لايَجَدُ أَحَداً يَأْخُذُهَا مِنْهُ، وَيُرى الرَّجُلُ الَواحِدُ يَتْبَعُهُ أَرْبَعُونَ أمْرَأةً يَلُذْنَ بِهِ، مِنْ قِلَةِ الرِجالِ وَكَثْرَةِ النِساءِ) (الحديث ١٤١٤): [٥٩٣]

---

[٥٩٢] تجريد/٢، ژمارە: ٦٧٤ = ١٩١١ م.ص.م/٢، ژمارە: ٥٢٦ = ٢٣٣٤.

[٥٩٣] تجريد/٢، ژمارە: ٦٧٧ = بخاری/١٤١٤، مسلم/١٠١٢ = ٢٣٣٣ شيحا - مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٤٩.

ئـەبو موسـای ئەشـعەری (ڕەزای خـوای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست - دروودی خوای لەسەر بێ- فـەرمووی: (مـەردوم دەکەونـە ڕۆژگـارێکی واوە، پیـاو بەزێڕی خێرەوە ماڵەو مـاڵو شارەو شـار دەسـووڕێتەوە تابیکـا بـەخێر، یـا بیـدا بەزەکات، بەڵام هەژاری دەست ناکەوێ کـەلێی وەرگـرێ، لەبـەر زۆری مـاڵ کـەس نایەوێ، وەدەبینرێ چل ژن شوێنی تاقـە پیـاوێ دەکـەونو پـەنای بـۆ دەبـەن، تـا سەرەوکارییان بکـاو، کـەس دەسـدرێژییان لێنـەکا، ئەمـەیش لەبـەر کـەمی پیـاوو زۆری ژن، بەهۆی زۆری ئاژاوەو زۆری کوشتنەوە). (ریـاض/٤ ل/١٣٢٢ = ریـاض/٤، ژمارە: ١٨٢٥+ تاج/٢/٥٩ ز/٢٣ ف/٢ = ژمارە: ١٢٨٤).

٥٩٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ: (لَـا تَقُومُ السَّاعَةُ، حَتَّى يَكْثُرَ فِيكُمْ الْمَالُ فَيَفِيضَ، حَتَّى يُهِمَّ رَبَّ الْمَالِ مَنْ يَقْبَـلُ صَـدَقَتَهُ، وَحَتَّى يَعْرِضَهُ، فَيَقُولَ الَّذِي يَعْرِضُهُ عَلَيْهِ: لَا أَرَبَ لِي) (الحديث ١٤١٢):[٥٩٤]

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـوای لێ بـێ) لـە خۆشەویـستەوە -دروودی خـوای لەسەر بێ- دەفـەرموێ: (قیامـەت هەڵناسـێ، تـا مـاڵ لـەنێوانتانا وا زۆردەبـێ، دەبـێ بەلێشاو، تەنانـەت خـاوەن سامان دەکەوێتـە مـشووری ئـەوەوە دەبـێ کەسێکی وای دەسـت بکـەوێ، کـەخێرو زەکـاتی لێ وەربگـرێ! هـەتا ئەگاتـە ئـەوە خـاوەن سـامان خێرو زەکات دەبا بۆ مەردووم، بـەڵام ئـەوەی کـە بـۆی دەبـا لێـی وەرنـاگرێ و پێـی دەڵێ: کارم پێی نییە.

---

[٥٩٤] تجرید/٢/ ژمارە: ٦٧٤ = ١٤١١، مسلم: ٢٣٣٤ شیحا.

### (١٩) باب: في قبول الصدقة من الكسب الطيب وتربيتها

٥٩٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لاَ يَتَصَدَّقُ أَحَدٌ بِتَمْرَةٍ مِنْ كَسْبٍ طَيِّبٍ إِلاَّ أَخَذَهَا اللَّـهُ بِيَمِينِهِ، فَيُرَبِّيهَا كَمَا يُرَبِّي أَحَدُكُمْ فَلُوَّهُ، أَوْ قَلُوصَهُ، حَتَّى تَكُونَ مِثْلَ الْجَبَلِ أَوْ أَعْظَمَ »: [٥٩٥]

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـوداى لێ بـێ) فـەرمووى: پێغەمبـەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (ئەوەى خێرێ بکا، لـە ڕەنجەشانى حـەلاڵى خۆى، با دەنکە خورمایەکیش بێ، دڵنیا کە خودا بە دەستى ڕاستى خۆى وەرى دەگرێ، وەك چۆن یەکێ لەئێوە جوانووى ماینێ، یـا نیۆنـە وشـترێ، بـۆ خـۆى پـەروەردە بکا، خودایش ئەو خێرە بـۆ ئێـوە بـەو شێوەیە پـەروەردە دەکـاو نەشونماى پـێ دەکـا، تـا تـەواو گـەورە دەبـێ، وە بەقـەد کێـوێکى لێ دێ، بگـرە گـەورەتریش).
{تاج/٦/٢، زنجیرە: ١، ژمارە: ١١٧٨} + {ریاض/١١٥/٢، زنجیرە: ٦٠، ژمارە: ٥٦١}.

### (٢٠) باب: الحث على الصدقة ولو بشق تمرة أو كلمة طيبة وأنها حجاب من النار
### هاندان لەسەر خێرکردن، با بەلەتى دەنکە خورمایەکیش بێت، یان بە وشەیەکى باش بێت، بێگومان کە خێرکردن بۆ خاوەنى دەبێت بە ئاگر برِێ بۆى

٥٩٦- عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ (رضى الله عنه) قَالَ: ذَكَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) النَّارَ فَأَعْرَضَ وَأَشَاحَ، ثُمَّ قَالَ: « اتَّقُوا النَّارَ ». ثُمَّ أَعْرَضَ وَأَشَاحَ، حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ كَأَنَّمَا يَنْظُرُ إِلَيْهَا، ثُمَّ قَالَ: « اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ، فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ».

---

[٥٩٥] مختصر صحيح مسلم/٢، ژمـارە: ٥٣٩ = مـسلم/شـيحا/٢٣٤٠ - ٢٣١٨ فـم. تجريـد/٢، لاپەڕە:١٠٠، ژمارە: ٦٧٣ = ٧٤٣٠ بخارى.

{الحديث: ٢٣٤٦ = ٢٣٢٤ فـم. بخـاري. أدب: ٦٠٢٣، ٦٥٤٠، ٦٥٦٣. نـسائي. زكـاة: ٢٥٥٢. تحفة الأشراف: ٩٨٥٣} : [٥٩٦]

عەدی کوڕی حاتـەم (ڕەزای خـودای لێ بێ) فـەرمووی: جارێ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) باسـی ئـاگری کـرد، وەك ترسـاو ڕووی خـۆی وەرچەرخان، وەك ئاگرەکە بەڕاستی بەرابەری بێ وا، لەپاشا فـەرمووی: (خۆتـان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن) دیسان ڕووی خـۆی وەرچـەرخانو ڕووی وەرگێڕایـەوە. تەنانـەت ئـەمجارە وا موتەئـەثیر بـوو، وامـانزانی کـە ئاگرەکـە وا لەبەرچـاوی. ئـەوجا فـەرمووی: (خۆتـان لـە ئـاگری دۆزەخ بپـارێزن، بابەلـەتی دەنکـە خورمایەکیش بووە، ئەگـەر هـەر هـیچ نـەبوو، بـە قسەیەکی بـاش، بـە گفتێکـی شیرین خۆتان ڕزگار بکەن). {ریاض/١، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ١٣٩}.

## ڕوونکردنەوە:

١- عەدی کوڕی حاتەمی تائی، کەناسراوە بەجوامێری‌و بەخشندەیی، وەك دەڵێن: فیسار ئەوەندە بەخشەرو چاکەکارە دەڵێی حاتەمی تائییـە. لەساڵی نـۆی کۆچیدا عەدی ئیسلام بووە، لەپێشا مەسیحی بووە، لەسەر ئایینی عیـسای کـوڕی مەریەم بوو، ئامادەی ئازادکردنی وڵاتی عێراق بـوو، لەپاشـا لەکووفـە نیـشتەجێ بوو، لەجەنگی صەفیندا لەگەڵ ئیمـامی عـەلی بـوو، خـۆی دەیفـەرموو: (ئـەوەتی موسوڵمان بووم، هەموو کاتێ کەبانگی داوە دەستنوێژم بووە!)

لەدوا ساڵی شەستی کۆچی مردووە، دەڵێن: تەمەنی دەیدا لەسەدو بیـست سـاڵ، هەنـدێ تـر دەڵـێن: سـەدو هەشـتا سـاڵ ژیـاوە، پیـاوێکی زۆر سـەخی بـوو.

---

[٥٩٦] بخاری. أدب: ٦٠٢٣، ٦٥٤٠، ٦٥٦٣، مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٣٥ - ٢٣٤٦، ترقیم شیحا لمسلم.

هەمیشە بەشەوقەوە چاوەڕوانی هاتنی نوێژەکانی دەکرد، لەبوخاریو موسلیمدا فەرموودەی هەیە. (بڕوانە: تەجرید/٥، لاپەڕە: ١١٧، ژمارە: ١٨٢٦ = ٥٤٧٥ بخاری + مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٤١٢، لاپەڕە: ٤٨٤ چاپی یەکەم).

٢- ئەمەیش وەرگەڕاوی گێڕانەوەی کتێبەکەیە.

عەدی کوڕی حاتەم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (کاتێ سەگەکەت دەکەیتە نەچیر، ناوی خودای لێ بهێنەو لەو کاتەدا کە بەرەڵڵای دەکەیت بڵێ: (بسم الله: بەناوی خودا) جا ئەگەر سەگەکە نەچیرەکەی گرتو بەزیندوویی فریای کەوتیت ئەوا سەری ببڕە، وە ئەگەر چوویتە سەر نەچیرەکەو روانیت کوژراوە، وەلێی نەخوراوە، ئەوا بیخۆ، بەڵام ئەگەر کاتێ دەچیتە سەر نەچیرەکەو بینیت سەگی تر لەگەڵ سەگەکەی تۆدا لەسەریەتی، لەهەمان کاتدا کوژراویشەو گیانی تیادا نەماوە، ئەوە لێی مەخۆ، چونکە تۆ نازانیت سەگەکەی تۆ کوشتوویەتی، یان سەگەکەی تر کەهی تۆ نییە. وەکاتێ تیر دەهاوێژیت بۆ نەچیر، ناوی خودا بهێنەو لەکاتی تێگرتنەکەدا بڵێ: (باسم الله: بەناوی خودا) تەنانەت ئەگەر لەپاش شەوو ڕۆژێکیش نێچیرەکەت دۆزیەوەو تەنیا شوێنی تیرەکەی تۆی پێوە بوو وە مردبوو ئەوا بیخۆ، ئەگەر گیانی تیا مابوو، ئەوا سەری ببڕەو بیخۆ، بەڵام ئەگەر دینیت لەناو ئاوا بوو ئەوا مەیخۆ، مەبادا بەئاوەکە خنکابێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٢٥٨٩}.

٥٩٧- حَدَّثُ عَدِيٌّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ - صلى الله عليه وسلم - « مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ وَسَيُكَلِّمُهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ، لَيْسَ بَيْنَ اللَّهِ وَبَيْنَهُ تُرْجُمَانٌ ، ثُمَّ يَنْظُرُ فَلاَ يَرَى شَيْئًا قُدَّامَهُ ، ثُمَّ يَنْظُرُ بَيْنَ يَدَيْهِ فَتَسْتَقْبِلُهُ النَّارُ ، فَمَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يَتَّقِيَ النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ».

وعنه أيضاً قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسلم – « اتَّقُوا النَّارَ» . ثُمَّ أَعْرَضَ وَأَشَاحَ ، ثُمَّ قَالَ « اتَّقُوا النَّارَ » . ثُمَّ أَعْرَضَ وَأَشَاحَ ثَلاَثًا ، حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا . ثُمَّ قَالَ « اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ».(٥٩٧)

عەدی کوڕی حاتەم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەموو یەکێ لەئێوە لەرۆژی ژینەوەدا، بۆ دادگایی دەچێتەوە بەردەستی خودای گەورە، خودا بۆ خۆی بەبێ تەرجەمانو زمانزان قسەی لەگەڵدا دەکا، کە دادگایی تەواو دەبێ، تەماشای هەر چوار لای خۆی دەکا، تا بزانێ، گوزەرگایێ، بوارێ هەیە کە لەئاگر رزگاری بکا. بەڵام دەروانێ وا ئاگری دۆزەخ بەری لێ بڕیوەتەوەو چاری نییە دەبێ بەرەو ئەوێ مل بنێ، هەتا بەسەر پردی سیراتا بڕوا، جا ئەگەر دەتانەوێ نەکەونە ناوی‌و بەسەر پردی سیراتا بپەڕنەوە بۆ بەهەشت، ئەوا ئەگەر بە لەتی دەنکە خورمایەکی خێریش بووە خۆتان لەم ئاگرە رزگاربکەن).

باقی ماندەی فەرموودەکە بەتەواوی لەژمارە (٥٩٦)دا، رابورد.

**(٢١) باب: الحمل أجرة يتصدق بها والنهي الشديد عن تنقيص المتصدق بقليل**

٥٩٨- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (رضى الله عنه) قَالَ أُمِرْنَا بِالصَّدَقَةِ. قَالَ كُنَّا نُحَامِلُ قَالَ: فَتَصَدَّقَ أَبُو عَقِيلٍ بِنِصْفِ صَاعٍ، قَالَ: وَجَاءَ إِنْسَانٌ بِشَيْءٍ أَكْثَرَ مِنْهُ فَقَالَ الْمُنَافِقُونَ: إِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنْ صَدَقَةِ هَذَا وَمَا فَعَلَ هَذَا الآخَرُ إِلاَّ رِيَاءً فَنَزَلَتْ ( الَّذِينَ يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِّعِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فِى الصَّدَقَاتِ وَالَّذِينَ لاَ يَجِدُونَ إِلاَّ جُهْدَهُمْ).

---

(٥٩٧) بخاری. رقاق: ٦٥٣٩، مسلم: ٢٣٤٥، ترقیم شیحا.

{الحـديث: ٢٣٥٢ = ٢٣٣٠ فـم. تجريـد/٢/١٠٤، رقـم: ٦٧٨ = ١٤١٥، ١٤١٦، ٢٢٧٣، ٤٦٦٨، ٤٦٦٩. نسائي. زكاة: ٢٥٢٨} : [٥٩٨]

ئـەبو مەسـعوودی بـەدری (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درووودی خودای لەسـەر بێ) فـەرمانی پـێ كـردین بـە كردنـی خێـرو صـەدەقە، هەمان بوو دەچوو بۆ بازاڕو كۆڵ كێشی دەكردو مشتێ دانەوێڵەی پەیدا دەكـردو دەیكرد بـەخێر، فـەرمووی: جا ئـەبو عـەقیل لـەنیو مـەن خـۆراك خێـری كـرد، عەبدوڕەحمانی كوڕی عـەوفیش هەشـت هـەزار درەمـی هێنـا، كـە دەكاتـە هـەزار دیناری زێڕ كردی بەخێر. جا ناپاكەكان بە تەوسەوە گوتیان: ئەمە چییە ئـەبو عـەقیل كردوویـەتی بـەخێر، خـوا پێویـستی بەشـتی وا بـێ نمـوود نییـە، عەبـدوڕەحمانیش ئەمـەی بـۆ خـودا نییـە، بـەڵكوو بـۆ ریـا بازییـە. جـا بـەم بۆنەیەوە، بۆ پەرچدانەوەی ئەم دوو رووانە خـودای گـەورە ئـەم ئایەتـەی نـاردە خوارەوە: {الَّذِينَ يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِّعِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فِي الصَّدَقَاتِ وَالَّذِينَ لاَ يَجِدُونَ إِلاَّ جُهْدَهُمْ – ٩/٧٩} واتە: ئەو كەسانەی كە رەخنەو لەقەم دەگرن لەو موسوڵمانە خێركەرە ساخو راستانەی، كە ساغ لەبە رەزای خـودا، خێـرو خێـرات دەكـەن، یـا لـەو موسـوڵمانە كـەم دەسـتانەی كـە بـەپێی تـەوانای خۆیـان، لـەو ماڵـە كەمـەی هەیانـە، بـەزیادەوە خێـری لێ دەكـەن، تەنانـەت لـەو ماڵـەیش كـە بـە ئـارەقی ناوچـەوانو بـە رەنجـی شـان، پەیـدای دەكـەن، بەشـی خـودای لێ دەدەن، ئـەو كەسانەی كەبەم دوو دەسـتەیە لاقرتـیو قەشمـەری دەكەنو، تـیرو توانجیـان تـێ دەگرنو دەیانەوێ دڵیان سارد بكەنەوە، ئەوانـە بـە پێـچەوانەوە خـودا لـەخۆیان دەڕەنجێـننو خـودا خۆیـان دەكـا بـە گاڵتـەجاڕو دەیانكـا بـە پەنـد، لـە رۆژی دوا

---

[٥٩٨] تجريد/٢، ژمارە: ٦٧٨ = ١٤١٥، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٤٢ = ٢٣٥٢ شیحا.

ڕۆژدا، کـه هـەموو شـت بەدەسـتی خـودا خۆیـەتی سـزایەکی سـەختیان بـۆ دەبڕێتەوە). {تاج/٤/٢٦٢، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٣٩٠٥} .

### (٢٢) باب: فضل المنيحة
### خێری بەخشینی ئاژەڵی دۆخە

٥٩٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَـالَ: نِعْـمَ الـصَّدَقَةُ اللِّقْحَـةُ الـصَّفِيُّ مِنْحَـةً وَالـشَّاةُ الـصَّفِيُّ مِنْحَـةً تَغْـدُو بِإِنَـاءٍ وَتَـرُوحُ بِآخَرَ.(الحديث ٥٦٠٨ طرفه في: ٢٦٢٩)؛ [٥٩٩]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە دەفەرموێ: (وشتری شیرداری بەشیرو مەڕو بزنـی شیرداری بەشـیر، خێرێکـی گـەلێ چاکن، بـۆ کەسێ بەدۆخـە بیانـدا بـەخێزانێ، کـە بۆخۆیـان شـیرەکەی بخـۆن، بـەیانی قاپێ شـیرو ئێوارە قاپێ شیر، دەسەنەیەکی گەلێ چاکە).

دۆخـە ئاژەڵێکـە مـەڕ بـێ، یـا بـزن بـێ، یـا مانگابـێ، یـا وشـتربێ، کـە خاوەنەکـەی بـەپیاوەتی، بـەخۆڕایی، بـۆ ماوەیـەکی دیـاریکراو، دەیـدا بـەماڵێکی ڕەشایی کە ئاژەڵی دۆشەنی یان نەبێ، کەهەتا وشك دەکا بۆ خۆیان شیروماست و دۆکەی بخۆن‌و دوایی بیگێڕنـەوە بـۆ خاوەنەکـەی. فەرموودەکە بـۆنی ئـەوەی لێ دێ، کە واپەسـەندە ئـەو ئاژەڵـەی دەدرێ بەدۆخـە لەسـەرگوان بـێ و بەرلـەزایین بـدرێ بەماڵـە ڕەشـاییەکەو لەهـەمان کاتـدا شـیردەرێکی بـاش بـێ، نـەوەك خاوەنەکەی ئاژەڵێکی ئایەخ هەڵبژێرێ.

---

[٥٩٩] تجرید/٥، ژمارە: ١٨٤٧ = ٥٦٠٨، مسلم: ١٠١٩ = ٢٣٥٤ = مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٣٦.

## (٢٣) باب: مثل المنفق والبخيل
## نموونەی خێرکەرو رژدو چرووك

٦٠٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ نَافِعٍ عَنِ الْحَسَنِ عَنْ طَاوُسٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ ضَرَبَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - مَثَلَ الْبَخِيلِ وَالْمُتَصَدِّقِ ، كَمَثَلِ رَجُلَيْنِ عَلَيْهِمَا جُبَّتَانِ مِنْ حَدِيدٍ ، قَدِ اضْطُرَّتْ أَيْدِيهِمَا إِلَى ثُدِيِّهِمَا وَتَرَاقِيهِمَا ، فَجَعَلَ الْمُتَصَدِّقُ كُلَّمَا تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ انْبَسَطَتْ عَنْهُ حَتَّى تَغْشَى أَنَامِلَهُ وَتَعْفُوَ أَثَرَهُ ، وَجَعَلَ الْبَخِيلُ كُلَّمَا هَمَّ بِصَدَقَةٍ قَلَصَتْ ، وَأَخَذَتْ كُلُّ حَلْقَةٍ بِمَكَانِهَا . قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ فَأَنَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - يَقُولُ بِإِصْبَعِهِ هَكَذَا فِي جَيْبِهِ ، فَلَوْ رَأَيْتَهُ يُوَسِّعُهَا وَلاَ تَتَوَسَّعُ .[٦٠٠]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پیاوی رەزیلو پیاوی بەخشندە (سەخی) مانەندی دوو پیاو وان، کە یەکی سەرو زریەی ئاسنینی تەسکیان لەبەردابێ، لە ئاستی مەمکیانەوە بێ، هەتا ددانەی سینگیان کە پێی دەگوترێ چۆڵەمە (قووڵایی خوار قورگ). جا جار لەگەڵ جارا، بەخشندەکە کەشتێ دەبەخشێ، زریەکەی بەرە بەرە کشی دێو گەورەو فەرەح دەبێ، تاوای لێ دێ لەبەر پێی دەخشێ، وەك چۆن جلی شۆڕ شوێن پێ کوێردەکاتەوە، بەخشندەییش ئاوا گوناهو تاوانی خاوەنەکەی دەسڕێتەوە. بەڵام پیاوی رەزیلو چرووك هەرکاتێ ویستی خێرێ بکا، یا شتێ ببەخشێ، ئەڵقەی زریەکەی دێتەوە یەكو زیاتر قوڵفەکانی تەسك دەبنەوە، هەتا بەرە بەرە هەردوو دەستی توند شەتەك دەدرێن بە بەربینیەوە!).

---

[٦٠٠] تجرید/٢، ژمارە: ٦٩٢ = ١٤٤٣، مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٤٨ = ٢٣٥٨.

فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (جا ڕەزیلەکە هەر هەوڵو تەقەلا دەدات کە کشی بێنێو فەرەحی بکا بەڵام ناتوانێ). {تاج/٤٠١/٥، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٥٢٢٥ ج/٤ + ریاض/١١٥/٢، زنجیرە: ٦٠، ژمارە: ٥٦٠/١٧} .

ئەمە دەقی وەرگەڕاوی (مختصر صحیح مسلم)ە، بۆ ڕوونکردنەوەی تەواو، دەقی وەرگەڕاوی تەجریدی بوخاریش لەدواوە دەنووسین:

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ژنەوتم لە خۆشەویست - دروودی خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: (پیاوی ڕەزیلو پیاوی بەخشندە (سەخی) مانەندی دوو پیاو وان، کەیەکی سەرو زریەی ئاسنینی تەسکیان لەبەردا بێ، لە مەمکیانەوە بێ تاددانەی سنگیان، جاجار لەگەڵ جارا، کەبەخشندەکە شتێ دەبەخشێ، زریەکەی کشی دێو گوشادو گەورە دەبێ، تاوای لێ دێ لەبەرپێی دەخشێ (و وەك چۆن جلی شۆڕ شوێن پێی خاوەنەکەی لەکاتی ڕۆیشتن دا، کوێر دەکاتەوە، خێرو خێراتو بەخشندەییش ئاوا گوناە و تاوانی خاوەنەکەی دادەپۆشێ)!

بەڵام پیاوی ڕەزیلو چرووك هەرکاتێ ویستی خێرێ بکا، یا شتێ ببەخشێ، ئەڵقەی زریەکەی دێتەوە یەكو زیاتر قوڵفەکانی تەسك دەبنەوە، هەتا بەرەبەرە، هەردوو دەستی شەتەك دەدرێن بەبەر بینیەوە). فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (جا ڕەزیلەکە هەر هەوڵو تەقەڵا دەدات، کە کشی بێنێ بەڵام ناتوانێ!).. (تاج/٥، ژمارە: ٥٢٢٥ + ریاض/١١٥/٢ ژ/١٧/٥٦٠ ز/٦٠).

## (٢٤) باب: ثبوت أجر المتصدق وإن وقعت الصدقة في يد غير أهلها
## پاداشی خێرکار دەچەسپێ، با خێرەکەیشی بچێتە دەستی ناشایستەوە

٦٠١- عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (قَالَ رَجُلٌ: لأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ، فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ، فَوَضَعَهَا فِي يدِ سَارِقٍ، فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ: تُصدِقَ عَلى سَارِقٍ، فَقَالَ: اللهُمَّ لَكَ الحَمْدُ، لأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ، فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِي يَدَي زَانِيَةٍ، فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ: تُصدِقَ اللَّيْلَةَ عَلى زَانِيَةٍ، فَقَالَ: اللهُمَّ لَكَ الحمدُ عَلى زانِيَةٍ؟ لأَتَصدَّقَنَّ بَصَدَقَةٍ، فَخَرَجَ بَصَدَقَتِهِ، فَوَضَعَهَا فِي يَدَيْ غَنِيٍ، فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ: تُصدِقَ عَلى غَنِي، فقالَ: اللهُمَّ لَكَ الحَمْدُ، عَلى سارِقٍ، وَعَلى زانيةٍ، وَعلى غَنِي، فَأُتِيَ: فَقِيلَ لَهَ: أَمَّا صَدَقَتُكَ عَلى سارق فَلَعَلَّهُ أنْ يَسْتَعِف عَنْ سَرِقَتِهِ، وَأَمَّا الزانِيَة فَلَعَلَها أن تَسْتَعِفَّ عَنْ زِنَاهَا، وَأَمَّا الغَنِيُّ فَلَعَلَّهُ يَعْتَبِر، فَيُنْفِقُ مِمَّا أَعْطَاهُ الله). (الحديث ١٤٢١)؛[٦٠١]

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست -درودی خوای لەسەر بێ- سەرو ماڵو منداڵو هەست ونەست گشتی بەقوربانی ئەو گەردەبێ، کە لەپێی دێنیکەرانی گۆڕی پیرۆزی دەنیشێ فەرمووی: پیاوێ دەبێ لەنەوەی ئیسرائیل، دەڵێ: بە خودا دەبێ ئەمشەو خێرێ بکەم، شەو خێرەکەی دەباو دەینێتە ناودەستی دزێکەوە، بۆ بەیانی خەڵك دەڵێن: زۆر سەیرەئیمشەو خێر بەدزێ کراوە ! خێرکەرەکە دەڵێ: خودایە! سوپاس بۆ تۆ لەسەر ئەم خێرە بەم دزە (چونکە ئەمە ویستو خواستی تۆی لەسەربووە، خواستی تۆیش پڕە لەزانستی بەرزو، بێدانایی نییە) دەبێ خێرێ تر بکەم، خێرەکەی دەباو، دەینێتە ناودەستی ژنێکی داوێن پیسەوە، بۆ بەیانی دیسان خەڵك دەڵێن: سەیرە! ئیمشەو خێر بە ژنێکی داوێن پیس کراوە، پیاوەکە دەڵێ: خودایە!

---

[٦٠١] تجريد/٢، ژمارە: ٦٨٢ = ١٤٢١، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٤٧ = ٢٣٥٩ شيحا.

سوپاس بۆ تۆ لەسەر ئەم خێرەیش بەم ژنە داوێنپیسە، دەبێ خێرێ تر بکەم، خێرەکەی دەباو دەینێتە ناو دەستی دەوڵەمەندێکەوە، دیسان بۆ بەیانی خەڵکەکە دەڵێن: ئای چەند سەیرە خێر بەپیاوێکی دەوڵەمەند کراوە !

پیاوەکەش دەڵێ: خودایە! سوپاس بۆ تۆ لەسەر خێردان بەپیاوی دزو بە ژنی خراپەکارو بە پیاوی دەوڵەمەند، خێرکەرەکە شەو لەخەودا خەوی دی، لەخەوا پێیان گوت: هەرسێ خێرەکانت گیرابوون، سا بەڵکو ئەو دزە بەهۆی خێرەکەی تۆوە واز لەدزی کردن بهێنێ، بەشکو ئەو ژنە سەلیتەیە (واتە: سۆزانییە) بەهۆی ئەو خێرەی تۆوە دەست لەو ئیشە خراپە هەڵبگرێ، بەشکو دەوڵەمەندەکەیش پەندوعیبرەت وەربگرێو شەرم لەخۆی بکاو، لەو ماڵو سامانەی کە خودا پێی داوە دەست بکا بە بەخششو خێرکردن). (تاج/١٠/٧٥-٧ - ش).

**ڕوونکردنەوە:**

**ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:**

١- نیازی پاك كاریگەری خۆی دەبینێ، خێرکەر ئەگەر نیازی پاك بێ خێرەکەی دەگاتە جێگەی خۆیو قەبووڵە.

٢- ئەمە بۆ خێری سوننەت وایە، لە زەکاتا، ئەگەر دەرکەوت زەکات وەرگرەکە شایستە نییە، دەبێ زەکاتەکە دووبارە بداتەوە.

٣- گێڕانەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئەم داستانە، بەڵگەی ڕاستیو دروستیەتیو بەڵگەی ئەوەیە کە ئەوانەی لە خەونەکەدا موژدەیان داوە بەخێرکەرەکە فریشتەی خودا بوون کە ئەم جۆرە بەڵگەیە لە زانستی فەرموودەو ئوصولا پێی دەگوترێ تەقریری قەولی.

بەشێوەی گشتی خێری سوننەت، نەوەك صەدەقەی فەرز، وەك زەكاتو نەزر، بەهەموو كەسێ دەشێ، بەخزم بە بێگانە، بە موسوڵمان، بە ناموسوڵمان، بە مرۆڤ، بە ئاژەڵی تر، بەباشو بەخراپ، بەمەرجێ نەبێ بەهۆی یاریدان لەسەر گوناهو تاوان. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم بارەیەوە دەفەرموێ: (ئەوەی تەڕایی ژیانی تیادا بێ، خێری پێ دەشێ).

## (٢٥) باب: أجر الخازن الأمين والمرأة إذا تصدقت من بيت زوجها
## كلیل بەدەستی دەستپاك، كاتێ خێر دەكا لەو ماڵەی كە وا لەژێردەستیدا، ئەویش وەك خاوەنەكەی خێری دەكات، هەروەها ژنیش ئەگەر لە ماڵی مێردەكەی خێر بكات ئەویش وەك ئەو خێری دەكات

٦٠٢- عَنْ أَبِي مُوسى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الخازنُ المُسْلِمُ الأمينُ، الَّذي يُنْفِذُ -وَرَبَّمَا قَالَ: يُعْطِي- مَا أُمِرَ بِهِ،كَامِلاً مُوَفَّراً، طَيِّبٌ بِهِ نَفْسُهُ، فَيَدْفَعُهُ إِلَى الذِي أُمِرَ لَهَ بِهِ، أَحَدُ المُتَصَدِّقَيْنِ). (الحديث ١٤٣٨ – طَرَفَاهُ في: ٢٢٦٠، ٣٣١٩)[٦٠٢]:

لە ئەبو مووساوە (ڕەزای خوای لێ بێ) خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (كلیل بەدەستی مسوڵمانی دەستپاك، كاتێ ئەو فەرمانەی كە خاوەن ماڵ پێی كردووە، سەبارەت بەكردنو جێبەجێكردنی خێرێ، ئەگەر بەتەواوی و بەتێروتەسەلی، وەك پێی گوتراوە، ئەو فەرمانە ئەنجام بداو بیدا بەوكەسەی كەپێی گوتراوە، وە پێخۆشحاڵ بێ بەئەنجامدانی، ئەوە خێركەرەكان دەبن بەدوو، كە ئەو یەكێكیانە). (بڕوانە: ژمارە:٦٨٤ تجرید/٢).

---

[٦٠٢] تجريد/٢، ژمارە: ٦٩٠ = ١٤٣٨ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٥٠ - ٢٣٦٠.

٦٠٣- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِذَا أَنْفَقَتِ الْمَرْأَةُ مِنْ طَعَامِ بَيْتِهَا غَيْرَ مُفْسِدَةٍ كَانَ لَهَا أَجْرُهَا بِمَا أَنْفَقَتْ وَلِزَوْجِهَا أَجْرُهُ بِمَا كَسَبَ وَلِلْخَازِنِ مِثْلُ ذَلِكَ لاَ يَنْقُصُ بَعْضُهُمْ أَجْرَ بَعْضٍ شَيْئًا ». {الحديث: ٢٣٦١ = ٢٣٣٩ فم. تجريد/٢/١٠٨ رقم: ٦٨٤ = ١٤٢٥، ١٤٣٧، ١٤٣٩، ١٤٤٠، ١٤٤١، ٢٠٦٥ فتح. أبو داود. زكاة: ١٦٨٥. ترمذى. زكاة: ٦٧٢. ابن ماجة. تجارات: ٢٢٩٤. تحفة الأشراف: ١٧٦٠٨} : [٦٠٣]

عائيشه (رەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ ژن (بەبێ دەستبلاوی) لە خۆراکی ماڵەوەی ببەخشێ، ئەوە پاداشتی باشی بۆ هەیە لەسەر ئەو بەخشینە، چونکە ئەو هۆی ئەومیە، هەروەها مێردەکەشی پاداشتی باشی بۆ هەیە، چونکە ئەو پەیدای کردووە، کلیلدارو کلیل بەدەستیش هەروەها، کەسیشیان لە پاداشتی کەسیان کەم ناکەنەوە، واتە: نابن بە موزاحیمی یەکتری). {تاج/٢/٦٤، زنجیرە: ٢٣، ژمارە: ١٢٨٦}.

٦٠٤- عَنْ أَبُو هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ تَصُمِ الْمَرْأَةُ وَبَعْلُهَا شَاهِدٌ إِلاَّ بِإِذْنِهِ، وَلاَ تَأْذَنْ فِى بَيْتِهِ وَهُوَ شَاهِدٌ إِلاَّ بِإِذْنِهِ، وَمَا أَنْفَقَتْ مِنْ كَسْبِهِ مِنْ غَيْرِ أَمْرِهِ فَإِنَّ نِصْفَ أَجْرِهِ لَهُ ». {الحديث: ٢٣٦٧ = ٢٣٤٥ فم. بخارى. نفقات: ٥٣٦٠، ٢٠٦٦، ٥١٩٢، ٥١٩٥} : [٦٠٤]

ئەبو هورەیرە لە خۆشەویستەوە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەر بێ): (نابێ ژن رۆژووی سوننەت بگرێ ئەگەر مێردەکەی لە ماڵەوە بوو، مەگەر

---

[٦٠٣] تجريد/٢، ژمارە: ٦٨٤ = ١٤٢٥ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٥٢ = ٢٣٩١.

[٦٠٤] بخارى. نفقات: ٥٣٦٠، ٢٠٦٦ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٥٤ = ٢٣٦٧ ترقيم شيحا لمسلم.

بەرەزای مێردەکەی، هەروەها نابێ کە ژن رێگەی کەس بدا کە هاموشۆی بکاو بچێ بۆ ماڵی مەگەر بەرەزای مێردەکەی، هەرکاتێکیش ژن بەبێ وەرگرتنی فەرمانی روون‌و ئاشکرا لە مێردەکەی، لە ماڵی مێردەکەی شتێ ببەخشێ، یا خەرج بکا بۆ کاری خێر، خێری ئەو بەخشینە نیوەییانە). {تاج/٢/٥٢١، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ٢١٥١ + ریاض/١، زنجیرە: ٣٥، ژمارە: ٢٨٢ + تجرید/٥/٤٣، ژمارە: ١٧٧٤} .

٦٠٥- حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ - رضي الله عنه - عَنِ النَّبِيِّ - صلى الله عليه وسلم - قَالَ « إِذَا أَنْفَقَتِ الْمَرْأَةُ مِنْ كَسْبِ زَوْجِهَا عَنْ غَيْرِ أَمْرِهِ ، فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِهِ». [٦٠٥]

ئەم فەرموودەیە بەشێکە لە فەرموودەی ژمارە (٦٠٤) لەوێ واتاکەی‌و مەبەست لێی رابورد.

## (٢٧) باب: من جمع الصدقة وأعمال البر
## کۆکردنەوەی چەند جۆرە خێرو کۆمەڵێ کاری چاکەی تر

٦٠٦- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « مَنْ أَنْفَقَ زَوْجَيْنِ فِى سَبِيلِ اللَّهِ نُودِىَ فِى الْجَنَّةِ يَا عَبْدَ اللَّهِ هَذَا خَيْرٌ. فَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّلاَةِ دُعِىَ مِنْ بَابِ الصَّلاَةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجِهَادِ دُعِىَ مِنْ بَابِ الْجِهَادِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّدَقَةِ دُعِىَ مِنْ بَابِ الصَّدَقَةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصِّيَامِ دُعِىَ مِنْ بَابِ الرَّيَّانِ ». قَالَ أَبو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! مَا عَلَى أَحَدٍ يُدْعَى مِنْ تِلْكَ الأَبْوَابِ مِنْ ضَرُورَةٍ فَهَلْ يُدْعَى أَحَدٌ مِنْ تِلْكَ الأَبْوَابِ كُلِّهَا؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « نَعَمْ، وَأَرْجُو أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ ». {الحديث: ٢٣٦٨ = ٢٣٤٦ فـم.

---

[٦٠٥] بڕوانە ژمارە: (٦٠٤).

تجريـد/٢/٢٦٨، رقـم: ٨٧٣ = ١٨٩٧، ٢٨٤١، ٣٢١٦، ٣٦٦٦. ترمـذى. مناقـب: ٣٦٧٩. نسائى. صيام: ٢٢٣٧، ٢٤٣٨، ٣١٣٥. تحفة الأشراف: ١٢٢٧٩} : [٦٠٦]

ئـەبو هـورەیره (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (هەرکەسـێ جووتـێ شـت لـە ڕێگـەی خـودادا ببەخشێ، وەك ئەوە دوو درەم، یا دوو دینار، یا وەك ئەوە مەڕو بزنێ، یـا کـەواو کراسێ، یا هەنێ شەکرو چای، بۆ ڕەزای خودا ببەخشێ، کاتێ دەچیتە بەهەشـت دەرگاوانەکان بانگی دەکەن: ئەی بەندەی خودا! ئەی فیسارە کەس! ئەم دەرگایـە باشە لەباوەڕی مندا، فەرموو وەرە لێرەوە بچۆرە ژوورەوە!.

جا ئـەوەی خـاوەنی نوێـژە لـە دەرگـای نوێـژەوە بـانگ دەکرێ، وە ئـەوەی خاوەنی خـەبات‌و غـەزابێ‌و لەجیهانـدا بـە غـەزاوە نـاوی جـوانی دەرکردبـێ، لـە دەرگای خەبات‌و غەزاوە بانگ دەکرێ، وە ئەوەی خـاوەنی ڕۆژوو بـێ لـە دەرگـای تێـراوو پـاراوەوە بـانگ دەکـرێ، وە ئـەوەی خێرومەنـد بـێ لـە دەرگـای خێرومەندانەوە بانگ دەکرێ، ئـیتر هـەروا هـەموو کردەوەیـەکی بـاش دەرگـای تایبەتی خۆی هەیە).

ئەبوبـەکری صـەدیقیش (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: قوربـان! ئـەی پێغەمەری خودا! بە باوك‌و دایکمەوە بەقوربانت بم، خۆ قەیدی نییە کە کەسـێ لەهەموو دەرگاکانەوە بانگ بکرێ؟

خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەڵێ کەسی وا هەیە لەهـەموو دەرگاکانـەوە بـانگ دەکـرێ، وە ئومێـد دەکـەم کـە تـۆ ئـەی ئەبوبـەکر! یەکێك بیت لەوکەسانە!). {ریاض/٣/٩٠٨، زنجیرە: ٢١٧، ژمارە: ٢/١٢١٦ - ٢٧١}.

---

[٦٠٦] تجریـد/٢، ژمـارە: ٨٧٣ - ١٨٩٧، ٢٨٤١، ٣٢١٦، ٣٦٦٦ مختـصر صـحیح مـسلم/٢، ژمـارە: ٥٤٣ = شیحا/٢٣٦٨.

٦٠٧- حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ - رضـي الله عنـه - عَـنِ النَّبِـيِّ - صـلى الله عليـه وسلم - قَالَ « مَنْ أَنْفَقَ زَوْجَيْنِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ دَعَاهُ خَزَنَةُ الْجَنَّةِ ، كُلُّ خَزَنَةِ بَـابٍ أَىْ فُلُ هَلُمَّ » . قَالَ أَبُو بَكْرٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ ، ذَاكَ الَّـذِى لاَ تَـوَى عَلَيْـهِ . فَقَـالَ النَّبِـيُّ - صلى الله عليه وسلم - « إِنِّى لأَرْجُو أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ».[٦٠٧]

واتـاو مەبەسـت لێـی لـه ژمـاره (٦٠٦)دا رابـورد، لێـرەدا پرسـیارەكەی ئەبوبەكر ئاوایه: (ذاك الَّذِى لا تَوى عليـه). واتـه: ئـەوە ئـەو كەسـەیە، كـه خـۆی سەرپشكە لە هەڵبژاردنی دەرگایێ لە دەرگاكانو هەر دەرگایێ هەڵبژێرێ قەیدی نییه.

پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (ئومێـد دەكـەم كـەتۆ یەكێ بی لەو خودا پێداوانه!).

**(٢٨) باب: الحث على الإنفاق وكراهة الإحصاء**

**دەستت لە بەخشین نەترسێ**

٦٠٨- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ اَبِي بَكْرٍ رَضِيِ اللَّهُ عَنْهُ قَالَتْ: قَالَ لِـيَ النَبِيُّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:(لاتُوكى فَيُوكى عَلَيْكِ). وَفِي رِوايَةٍ: (لاتُحْصى فَيُحْـصيَ اللهُ عَلَيْـك). وَفِي رِوَايَةٍ: (لاتُوعي فَيُوعِيَ الله عَلَيْكِ، إرضَخي مَاأستطَعْتِ) (الحديث: ١٤٣٤)؛ [٦٠٨]

ئـەسمای كـچی ئەبوبـەكری صـەدیق (رەزای خـوای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- پێی فەرمووم: (ئـەی ئـەسماء! خێـر بكـەو ببەخـشەرەوەو، دەسـت مـەگرەرەوە، تـا دەتـوانی مـاڵ لەرێگـەی خـودادا، بـەخت

---

[٦٠٧] بڕوانه ژماره: (٦٠٦).

[٦٠٨] تجریـد/٢، ژمـاره: ٦٨٨ = ١٤٣٤ مختـصر صـحیح مـسلم/٢، ژمـاره: ٥٥١ = ٢٣٧٥ تـرقیم مامۆستای شیحا.

بکەو، مەیکەرە کیسەو توورەکەو پریاسکەوەو، دەرگاکەی بەدەمبێن مەبەستەو. پارەو پوولی زۆر، بەبێ سوودێکی ڕەوا کەڵەکە مەکە، ئەگینا خودایش لەتۆی دەگرێتەوە!). (ریاض/٢/١١٤ فەرموودەی ژمارە/٥٥٩/١٦ + تاج/١٠/٧٧ ف/١٠ ص/٢٢٠ ج/٥).

ئەسماء (ڕەزای خودای لێ بێ) چووە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمەری خودا! هەرچی زوبەیری مێردم بۆم نەهێنێ نیمەو ماڵ ماڵی ئەوە، جا ئایا گوناهم ناگات ئەگەر لەو ماڵەی کە زوبەیر دەیهێنێ بۆم خێرو شتی وای لێ بکەم؟ فەرمووی: (بەپێی توانای خۆت خێری لێ بکەو لێی ببەخشە، بەشێوەی گشتی بیکە بە دەستوور: بەبێ هۆیەکی ڕەوا، پارەو پوولو ماڵ کەڵەکە مەکەو دەستت نەترسێ لەخێردان بە شایستەگانو دەست مەگرەرەوە، با خودایش لەتۆی نەگرێتەوە). {ریاض/٢/١١٤. زنجیرە: ٦٠، ژمارە: ٥٥٩ + تاج/٥/٤٠٢، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٥٢٢٧}.

## (٢٩) باب: الحث على الصدقة ولو بالقليل ولا تمتنع من القليل لاحتقاره
## هاندان لەسەر بەخشین، خێر با کەمیش بێ هەر زۆرە، نابێ بە سووك تەماشا بکرێ

٦٠٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ يَقُولُ: « يَا نِسَاءَ الْمُسْلِمَاتِ! لاَ تَحْقِرَنَّ جَارَةٌ لِجَارَتِهَا، وَلَوْ فِرْسِنَ شَاةٍ ». {الحديث: ٢٣٧٦ = ٢٣٥٤ فم. تجريد/٣/١٨٦، رقم: ١٠٩٥ = ٢٥٦٦، ٦٠١٧. ترمذى. هبة: ٢١٣٠. تحفة الأشراف: ١٤٣١٥} : [(٦٠٩)]

[(٦٠٩)] تجريد/٣، ژمارە: ١٠٩٥ = ٢٥٦٦، ٦٠١٧ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٤١ = ٢٣٧٦.

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دیاریی پێـشکەشی یـەکتری بکـەن، چـونکە دیـاری دڵ ساف دەکاو دەغەزی سینگ دەکێـشێ، بـا ئـافرەتی موسـوڵمانیش بـۆ ئـافرەتی دراوسێی خۆی هیـچ دیاریو دەسەنەو کاسە ئاو سێ یەك بەکەم نەزانێو با بـۆی بـەرێ، بـا لاسمـی مـەڕێ، یـا بـزنێکیش بـێ!!). {تـاج/٢/٤٠١، زنجـیرە: ١٧٦، ژمـارە: ١٩٣٦} + {ریاض/١/١٢٥، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ١٢٤}.

## (٣٠) باب: فضل إخفاء الصدقة
## خێری بەخشینی نهێنیو شاردنەوەی خێرکردن

٦١٠- عَنْ أَبِی هُرَیْرَةَ (رضی الله عنه) عَنِ النَّبِیِّ (صلی الله علیه وسلم) قَالَ: « سَبْعَةٌ یُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِی ظِلِّهِ، یَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ: الإِمَامُ الْعَادِلُ، وَشَابٌّ نَشَأَ بِعِبَادَةِ اللَّـهِ، وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِی الْمَسَاجِدِ، وَرَجُلاَنِ تَحَابَّا فِـی اللَّـهِ، اجْتَمَعَـا عَلَیْـهِ وَتَفَرَّقَـا عَلَیْـهِ، وَرَجُلٌ دَعَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَالٍ، فَقَالَ: إِنِّی أَخَـافُ اللَّـهَ، وَرَجُـلٌ تَـصَدَّقَ بِـصَدَقَةٍ فَأَخْفَاهَا، حَتَّى لاَ تَعْلَمَ یَمِینُهُ مَا تُنْفِقُ شِمَالُهُ، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ خَالِیًا فَفَاضَتْ عَیْنَـاهُ ». {الحدیث: ٢٣٧٧ = ٢٣٥٥ فم. تجرید/١/٣٦٦، رقـم: ٣٧٤ = ٦٦٠، ١٤٢٣، ٦٤٧٩، ٦٨٠٦. ترمذی. زهد: ٢٣٩١}: [(٦١٠)]

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) لـە حەزرەتـەوە (دروودی خـودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (حەوت تاقم هەن، خودا لە ڕۆژی قیامەتدا، دایـان دەنـێ لەژێر سێبەری تـەختو بارەگـا (عـەرش)ی خۆیـدا، لـەو ڕۆژەدا کـە هـیـچ سـایەو سێبەرێکی تـر نییـە، بێجگـە لـە سـایەو سـێبەری خـودا خـۆی: یەکـەم: پادشـای عادڵو پێشەوای دادپەروەرو کاربەدەستی بـەداد، دووەم: لاوێ کـە لـە عیبـادەتو

---

(٦١٠) تجرید/٢، ژمارە: ٣٧٤ = ٦٦٠ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٣٧ = ٢٣٧٧ شیحا.





خودا پەرستیدا قاڵ بووبێ‌و پێ گەیشتبێ‌و بەرە بەرە گەورە بووبێ، سێیەم: پیاوێ کە دڵی ئالوودەی مزگەوت بێ، چوارەم: دوو کەس کە ساخ لەبەر ڕەزای خودا یەکتریان خۆش بوێ، لەبەر ڕەزای خودا کۆببنەوەو هەر لەبەر ڕەزای خودایش لە یەکتر جیاببنەوە، لەپاش تەواو بوونی کۆبوونەوەکەیان، پێنجەم: پیاوێ کە ئافرەتێکی خانەدانی خانوومانی، شۆخ‌و شەنگی جوان، داوای ئیشی خراپی لێ بکاو خۆیی تەسلیم بکا، ئەویش لەبەر ترسی خودا نەیکاو پێی بڵێ: من ئیشی بێ شەرعی ناکەم، چونکە لەخودا دەترسم، شەشەم: پیاوێ خێرێ بە پەنامەکی بکا، کە ئەم دەستی بەو دەستی نەزانێ، حەوتەم: کەسێ کە بەتەنیا خۆی بێ‌و یادی خودا بکاو دڵی گەرم ببێ‌و فرمێسك بەچاوەکانیدا، لەترسی خودا سەر ڕێژبکاو هۆن هۆن بێتە خوارەوە). {ریاض/١، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ٣٧٦} + {تاج/١، زنجیرە: ١١٤، ژمارە: ٦٨١ ج/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- وشەی (پیاو) لەم جۆرە فەرموودەیەدا، بۆ نموونەیە، یان بڵێین بۆ نموونەی لەبەرچاو ترە، لەبەرئەوە چەمك‌و مەفهوممی نییە، کەواتە ئەم حەوت تاقمە ژنیش وەك پیاو دەگرێتەوە. بڕوانە (ڕاڤەو شیکردنەوەی) فەرموودەی ژمارە/١٣ لە تەجریدی بوخاریدا کورت‌و پوخت ئەم حەوت تاقمە پیاوبن، یا ژن- کوڕبن، یا کچ، لەرۆژی قیامەتدا لەبن سێبەری ڕەحمەتی خودادا دەبن. گەر کەسێ بڵێ: یەکەم‌و سێیەم‌و پێنجەم بۆ ڕەگەزی مێ ناگونجێن، لە وەڵامدا دەڵێین: مەبەست لە (ئیمامی عادڵ) هەموو دەسەڵاتدارو کاربەدەستێکی دادپەروەرە، بەڕێوەبەری قوتابخانەبێ، ژن بێ یا پیاو، بەمەرجێ دادپەروەری بەر ئەم بڕگەیە دەکەوێ، وەك زاناکان دەفەرموون: (مەبەست لە پێشەوای

دادپــەروەر، پاشــای عادڵــە، هــەروا هــەموو کەســێ دەگرێتــەوە، کــە کاروبــاری موسوڵمانانی لە ئەستۆ بێو تیا دادپەروەربێ).

هەروا دەڵێین هاموشۆی مزگـەوتو ئـالوودە بوونی، بـۆ ژنـیش بەمـەرجی خـۆی سـوننەتە، زۆر لـە بـەرێزان مامۆسـتا ئاینییـەکان ماڵـەکانیان وا لەپـەنا مزگـەوتا، کـچو ژنیـان زۆر بـەجوانی خزمـەتی مزگـەوت دەکـەنو، لـە شـوێنی تایبەتیدا ئامادەی جومعەو جەماعەت دەبنو دڵیان وا ئالوودەی مزگەوت بووە، دەڵێی ماسیو ئاون. زۆرجار بووە بڕگەی پێنجەم بە پێچەوانەوە بووە، بڕوانە: {ریاض/١، زنجیرە: ١، ژمارە: ١٢ + تاج/١، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٨٥ + بخاری/٣٤٦٥ + تاج/٥، زنجیرە: ٩٢، لاپەڕە: ٢٦٨، ژمارە: ٥١٤٧م داستانی کیفلو ژنەکە}.

## (٣١) باب: بيان أن أفضل الصدقة صدقة الصحيح الشحيح
## خێری کاتی لەشساخیو کاتێ دڵت بە ماڵداری خۆش بێ زۆر باشە

٦١١- عَنْ أَبِی هُرَيْرَةَ (رضی الله عنه) قَالَ: أَتَی رَسُولَ اللَّهِ (صلی الله عليه وسلم) رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَیُّ الصَّدَقَةِ أَعْظَمُ؟ فَقَالَ: « أَنْ تَصَدَّقَ وَأَنْتَ صَحِيحٌ شَحِيحٌ، تَخْشَى الْفَقْرَ وَتَأْمُلُ الْغِنَى، وَلاَ تُمْهِلْ حَتَّى إِذَا بَلَغَتِ الْحُلْقُومَ قُلْتَ: لِفُلاَنٍ كَذَا، وَلِفُلاَنٍ كَذَا، أَلاَ وَقَدْ كَانَ لِفُلاَنٍ ». {الحديث: ٢٣٧٩ = ٢٣٥٧ فم. تجريد/٢/١٠٥ رقم: ٦٨٠ = ١٤١٩، ٢٧٤٨. نسائی. زكاة: ٢٥٤١. أبو داود. وصايا: ٢٨٦٥. تحفة الأشراف: ١٤٩٠٠}:

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پیـاوێ هاتـە خزمـەتی خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) عـەرزی کـرد: ئـەی پێغەمـەری خـودا! کام خێرو بەخشین پاداشـی گـەورەترە؟ فـەرمووی: (ئـەو خێـرەی کـە دەیکـەیت، لەشت ساخ بێو دڵت بەماڵداری خـۆش بـێو مەترسـی هـەژاریت هـەبێو هیـوای دەوڵەمەند بوونت هـەبێ، نـەوەك کەمتەرخـەمی بکـەی تـا ئەودەمـەی کـە گیـان

دەگاتە سەر لێوو مردن یەخەت پێ دەگرێ، جا ئەو حەلە بەپەلە پرووزە بڵێی: ئەوە بۆ ئەم‌و ئەمە بۆ ئەو، تازە چ سوود! گریمان ئەگەر سوودیشی هەبێ کەمە. لەچاو خێرکردنی حاڵی لەش ساخیدا، چونکە ئەو شتە لەدەستی تۆ دەرچووەو دەبێ بە ماڵی یەکێکی تر کە میراتبەرە). {تاج/٢/٦، ژمارە: ١٢٨٠، زنجیرە: ٢٢ — ج/٤}.

## (٣٢) باب: بيان أن اليد العليا خير من اليد السفلى
## دەستی سەروو باشترە لە دەستی ژێروو

٦١٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ وَهُوَ يَذْكُرُ الصَّدَقَةَ وَالتَّعَفُّفَ عَنِ الْمَسْأَلَةِ: « الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَالْيَدُ الْعُلْيَا الْمُنْفِقَةُ وَالسُّفْلَى السَّائِلَةُ ». {الحديث: ٢٣٨٢ = ٢٣٦٠ فم. تجريد/٢/١١، رقم: ٦٨٦ = ١٤٢٩ فتح. أبو داود. زكاة: ١٦٤٨. نسائي. زكاة: ٢٥٣٢. تحفة الأشراف: ٨٣٣٧} : [٦١٢]

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوتاردا لەسەر دوانگە، باسی خێرکردن‌و خۆپاراستن لە دەرووزەو گەدایی فەرموو، لەم لایەنەوە فەرمووی: (دەستی سەرەوە لە دەستی ژێرەوە باشترە، دەستی سەرەوە ئەو دەستەیە کەشت دەبەخشێ، دەستی ژێرەوەیش ئەو دەستەیە کە گەدایی دەکا).

---

[٦١٢] تجرید/٢، ژمارە: ٦٨٦ = ١٤٢٩ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٦٠ = ٢٣٨٢.

٦١٣- عَنْ حَكِيم بْنِ حِزَامٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ عن النَّبِي صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (اليَدُ العُلْيَا خَيْرٌ مِنَ اليَدِ السُّفْلَى، وابْدأْ بِمَنْ تَعُولُ، وَخَيْرُ الصَّدَقَةِ عَنْ ظَهْرِ غِنىً، وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهُ الله). (الحديث – ١٤٢٧): [٦١٣]

حەكیمی كوڕی حیزام (ڕەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (دەستی سەرەوە، كە دەستی خێركەرە، لەدەستی ژێرەوە باشترە، كەدەستی خێر وەرگرە، لە خێزانو خزمی خۆشتەوە دەست بكە بەخێركردن، باشترین خێریش ئەو جۆرە خێرەیە كە لەسەر تێریی بێ، وەهەر كەسێكیش خۆی بە دوور بگرێ لە ڕووزەردیی سوالۆ سوالكردن، خودا لەهەردوو جیهاندا ڕوو سوورو سەربەرزی دەكا، وە هەر كەسێكیش چاوی تێربێو خۆی بێنیاز بگرێو چاوی لەدەستی ئەمو ئەو نەبێ، خودا دەوڵەمەندو بێنیازی دەكا). (تاج/٢/٤٨ ف/١ + ل/٥١ ف/٥ + ل/٥٤ ف/١).

## ڕاڤەو شیكردنەوە:

بۆ ئەوەی سا بەڵكو خودای گەورە، بەدەستەڵاتی بێسنووری خۆی، بەڕەحمەتی بێ پایانی خۆی، ڕەفتارە شیرینو جوانەكانی جاران لەناو مسوڵمانانا زیندوو بكاتەوە، بەرەبەرە شەوكەتو سامو شكۆی مسوڵمانان لە سەرجەمی جیهانا، وەك سەردەمی زێڕینیان، دەست پێبكاتەوە، وابۆ ئەم مەبەستە، بەپشتی خودا، ژیاننامەی پڕ لە شانازیو سەربەرزیو جوامێریی حەكیمی كوڕی حیزام دەنووسین، بەڕاستی هیچ شتێ وەك داستانو باسی ژیاننامەی پیاوچاكان بڕوادار نابەستێتەوە بە ئایینو بەپەیڕەوی كردنی ئایینەوە. حەكیمی كوڕی حیزام (ڕەزای خوای لێ بێ) برازای حەزرەتی دایكە

---

[٦١٣] تجريد/٢، ژمارە: ٦٨٥ = ١٤٧٢ مسلم: ١٠٢٤ = ٢٣٨٤.

خەدیجەی هاوسەری پێغەمبەر بووە -دروودی خوای لەسەر بێ- ، ڕەزای خودا لەخەدیجەو برازاکەی بێ، یەکێ بووە لە بەگزادەکانی قورەیش، ڕیفادە لەدەستی ئەودابوو، ابن الأثیر (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (ڕیفادە جۆرە پیتاك کۆکردنەوەیەك بووە، قورەیش لەناو خۆیاندا، هەرکەسێ بەپێی توانای خۆی. بڕێ بەخششی دەدا، هەتا سامانێکی زۆریان کۆ دەکردەوە، جا لەو ماڵە خواردەمەنیو مێوژو خۆشاویان دەکڕی، وە لە ڕۆژانی حەجدا دەرخواردی خەڵكو حاجیانیان دەدا...).

حەکیم خۆی دەیفەرموو: (سیازدە ساڵ لەپێش ساڵی فیلدا، لەدایك بووم، لەبیرم دێ، کە عەبدولموتتەلیبی باپیرەی پێغەمبەر، دەیویست، بۆ جێبەجێ کردنی نەزرەکەی، عەبدوڵڵای کوڕی، واتە: باوکی پێغەمبەر، سەرببڕێو بیکا بە قوربانی، حەکیم لەناو ژووری کەعبەدا لەدایك بووە، لە جاهیللیەتا شەست ساڵ ژیاوە، لەئیسلامیشا شەست ساڵ ژیاوە، شەست کۆیلەی لەسەردەمی نادانی پێش ئیسلامدا ئازادکردووە، لەسەردەمی ئیسلام دا حەجی کرد، سەد وشتری دیاری بەیتی پێبوو، کاتێ لەچیای عەرەفە، لە ڕۆژی عەرەفەدا ڕاوەستا، سەدکۆیلەی هێنابوو، لەوێ لەگەڵیا ڕاوەستابوون، لەگەڵیا حەجیان دەکرد، هەرسەدیان یەکی سەروتەوقی زیویان لە گەردندا بوو، بەنەخش لێیان نووسرابوو: ئەمانە ئازادکراوی خودان، لەبەر ڕەزای خودا حەکیمی کوڕی حیزام ئازادی کردوون، هەزار سەر پەزیشی کرد بەهەدیی بەیت.

حیزامی باوکی لەهەرای (فجار)دا کوژرا، خۆشی ئامادەی ئەم هەرایە بووە، لەپێش بیعثەتدا دۆستی پێغەمبەر بوو، لەدوای بیعثەتیش هەر پێغەمبەری خۆش دەویست، بەڵام درەنگ ئیسلام بوو، یەکێ بوو لە (مسلمە)ی فەتح، لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا، بۆ ڕێزنان لەحەکیم، پێغەمبەر -دروودی خوای

لەسەر بێ- فەرمووی: (هەرکەسێ بڕواتە ماڵی حەکیمی کوڕی حیزامەوە، لەسەرو ماڵی خۆی دڵنیابێ). حەکیم پیاوێکی ژیری ڕێزداری لەخوا ترسی دەوڵەمەند بوو، زۆر بەخشندەو خێرکەر بوو، سەدو بیست ساڵ ژیاوە، ساڵی پەنجاو چوار، لە سەردەمی جێنشینی موعاوییەدا، لەمەدینە، لەماڵی خۆی دا زایە بوو (ڕەزای خوای لێ بێ).

٦١٤- عَنْ حَكِيم بنِ حِزامٍ رَضِي اللّهُ عَنْهُ قَالَ: سألْتُ رَسولَ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ فأعْطاني ثُمَّ سَأَلْتُهُ فأعْطَاني، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فأعْطاني، ثُمَّ قَالَ: (يا حَكِيمُ إنَّ هذا المالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، فَمَن، أَخَذَهُ بِسَخاوةِ نَفْسٍ بُورِكَ لَهُ فِيه، وَمَنْ أَخَذَهُ بإشْرافِ نَفْسٍ لَمْ يُبارَكْ لَهُ فِيه، وَكانَ كالّذي يأكُلُ وَلايَشْبَعُ، اَلْيَدُ العُلياَ خَيْرٌ مِنَ اليَدِ السُّفلَى). قَالَ حَكيمٌ: فَقُلْتُ: يارَسُولَ الله وَالذي بَعَثَكَ بِالحَقّ، لاأرْزَأُ أَحَداً بَعْدَكَ شَيئاً حَتّى أُفارِقَ الدُّنْيا، فكَانَ أَبُوبَكْرٍ رَضِي اللّهُ عَنْهُ يَدْعُو حَكِيماً إلَى العَطاءِ فَيَأبَى أنْ يَقْبَلَهُ مِنْهُ، ثُمَّ إنَّ عُمَرَ رَضِي اللّهُ عَنْهُ دَعَاهُ لِيُعْطِيَهُ فَأبىَ أنْ يَقْبَلَ مِنْهُ شَيْئاً، فَقالَ إنِّي أُشْهِدُكُمْ يا مَعْشَرَ المُسْلمينَ عَلى حَكيمٍ أنّي أعْرِضُ عَلَيْهِ حَقَّهُ مِنْ هَذَا الفَيْءِ فَيأبىَ أنْ يَأخُذَهُ، فَلَمْ يَرْزَأْ حَكِيمٌ أَحَدَاً مِنَ النّاسِ بَعْدَ رَسُولِ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ حَتى تُوُفّيَ). (الحديث ١٤٧٢- أطرافه في: ٢٧٥٠، ٣١٤٣، ٦٤٤١):[٦١٤]

حەکیمی کوڕی حیزام (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ داوای بەشم لە پێغەمبەر کرد (درودی خودای لەسەر بێ) ئەویش بەشی پێمدا، دیسان داوام لێ کردەوە، دیسانەوە بەشی دامەوە، هەم دیسان داوام لێ کردەوە هەمدیس بەشی دامەوە، ئەمە بوو بەسێ جار، لەپاشا فەرمووی: (ئەی حەکیم! ڕاستە کە ماڵ میوەیەکی سەوزو شیرینو خۆشە بەڵام بزانە ئەوەی بە بەرچاو تێریو

---

[٦١٤] تجرید/٢، ژمارە: ٧٠٩ = ١٤٧٢ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٦١ = مسلم: ١٠٢٥ = ٢٣٨٤ شیحا.

بەدلێتیری وەری بگرێ، خودا پیتو فەڕی بۆ تێدەخاو، ئەو ماڵە خێر دەداتەوە بۆی، وەلێ ئەوەی کە بەخوازەلۆکیو چاو چنۆکی هەڵپە هەڵپی بۆ دەکاو قرمو مرخی لێ خۆش دەکاو چاوی تێ دەبڕێ هەتا دەیسێنێ، بە شێوەیەکی وا، لەوەدوایش خاوەنەکەی چاوی لەدوایەتی، ئەوە ئەو ماڵە پیتو فەڕی بەحەوادا دەچێ! ئیتر ئەو کەسە کە ئەوە حاڵیەتی وەك زەمەنبوردەی لێ دێ، هەردەخواو هەرتێر نابێ!

دیارە دەستی سەروو کە دەستی خێرکەرە، یا ئەو دەستەیە کە بێز لە دەرووزەو گەدایی دەکاتەوە، دیارە کە دەستی سەروو لە دەستی ژێروو کە دەستی دەرووزەکەرە، گەلێ باشترە).

گێڕانەوەی بوخاری ئەمەی پترە: حەکیم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کە ئەمەم لە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنەوت گوتم: ئەی ڕابەری خودا! بەو کەسە کەتۆی کردووە بە پێغەمبەری ڕاستو دروستو ڕەوانەی کردووی لەگەڵ ئەو ئایینە ڕاستو دروستەدا، ئیتر لەپاش تۆ تا لەجیهان دەردەچم شت لەکەس وەرناگرم.

لەپاش مەرگی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەبوبەکرو عومەر (ڕەزای خودا لە هەرسێکیان بێ) لەکاتی جێنشینی (خەلافەت)ی خۆیاندا، بەشی حەکیمیان لە دەسکەوتی جەنگی (فەیء) دەدا، بەڵام حەکیم هەتا مرد بزگوڕێکی لەکەس وەرنەگرتو بەڵێنەکەی خۆی کەدای بە پێغەمبەر، بردە سەر، عومەریش لەکاتی خۆیدا شایەتی لێ گرتو فەرمووی: ئەی گەلی موسوڵمانینە! ئێوە بەشایەت بن، ئەوەتا من بە بەرچاوی ئێوەوە، لەم دەسکەوتە بەشی خۆیی دەدەمێ، وەك ئەو پشکەی کە خودا بۆی داناوە، بەڵام حەکیم خۆی

وەری نـاگرێ}). {ریـاض/٩٥/٢، زنجـیرە: ٥٧، ژمـارە: ٥٢٤ + تـاج/٢، لاپـەڕە: ٥٣، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ١٢٦٣}.

## (٣٣) باب: النهی عن المسألة
## جڵەوگیری لە سواڵکردن

٦١٥- عَنْ مُعَاوِيَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَنْ يُرِدْ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ وَإِنَّمَا أَنَا قَاسِمٌ وَاللَّهُ عَزَوَجَلْ يُعْطِي وَلَنْ تَزَالَ هَذِهِ الْأُمَّةُ قَائِمَةً عَلَى أَمْرِ اللَّهِ لَا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَالَفَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ). (الحديث ٧١ ـ أطرفاه في: ٣١١٦، ٣٦٤١، ٧٣١٢، ٧٤٦٠):[٦١٥]

مەعاوییە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ کەخودا بیەوێ تووشی خێرو خۆشی بکا شارەزای ئایینی دەکا، من تەنیا ئەوەندەم بەدەستە کەئەم فەرمایشتو شەریعەتە دابەش بکەمو بەس، بەڵام بەشی گەورە یابچووك ئەوە بەدەست خودا خۆیەتیو خودا خۆی ئەو بڕیارە دەدا، وەئەم ئۆمەتی ئیسلامەیش هەر بەردەوام دەبن لەسەر ئەم ئایینی خودایە هەتا نزیکی ڕۆژی قیامەت، ئەوەی لەدژیان بێ زیانیان پێ ناگەیەنێ.

### ڕاڤەو شیکردنەوە:

موعاوییەی کوڕی ئەبوسوفیان ئەمەوی یە، ساڵی فەتحی مەککە موسوڵمان بووە؛ ژنبرای پێغەمبەر بووە، نووسەری سرووش بووە، تەمەنی (٧٨) ساڵ بووە، لەکۆتایی تەمەنیدا تووشی دەمخواریی بووە، سەدو شەستو سێ فەرموودەی

---

[٦١٥] تجرید/١، ژمارە: ٦٢ = ٧١ مسلم: ١٠٣٧ - ٢٣٨٩.

لەپێغەمبـەرەوە گێڕاوەتـەوە، هەشت فـەرموودەی لەبوخاریـدا هەیـە، پێنجیـشی لەموسلیم دا هەیە، چواریان پەسندی هـەردوو پـیرە: (تـ١ ل-٧٧ ز-١٤ فـ١ ژ-٩٨) + (تـ٥ ل-١٤٥ = تاج-٣ ل-٦٦٦ ز-٢٣ چ-٤).

## (٣٤) باب: المسكين الذى لايجد غنى ولا يفطن له فيتصدق عليه
## هەژاری دڵتێری داوانەکەر

٦١٦- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللّـهِ (صـلى الله عليـه وسـلم) قَالَ: « لَيْسَ الْمِسْكِينُ بِهَذَا الطَّوَّافِ الَّذِى يَطُوفُ عَلَى النَّاسِ، فَتَرُدُّهُ اللُّقْمَةُ وَاللُّقْمَتَـانِ، وَالتَّمْرَةُ وَالتَّمْرَتَانِ »، قَالُوا: فَمَا الْمِسْكِينُ يَا رَسُولَ اللّـهِ؟ قَـالَ: « الَّـذِى لاَ يَجِـدُ غِنًـى يُغْنِيهِ، وَلاَ يُفْطَنُ لَهُ فَيُتَـصَدَّقَ عَلَيْـهِ، وَلاَ يَـسْأَلُ النَّـاسَ شَـيْئًا ». {الحـديث: ٢٣٩٠ = ٢٣٦٨ فـم. تجريـد/٢/١٣٤، رقـم: ٧١٢ = ١٤٧٩، ١٤٧٦، ٤٥٣٩. نـسائى. زكـاة: ٢٥٧٢. أبو داود. زكاة: ١٦٣١} : [٦١٦]

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەژاری بەڕاستی ئـەوە نییـە کە دەرگـاو دەرگـاو ماڵەو ماڵ دەسووڕێتەوەو خەڵك خێری پـێ دەکـەن‌و، لێـرەو لـەوێ بـە پارووێـ دوو پاروو، یا بەدەنکێ دوو دەنك خورما دەستی پێوە دەنێن‌و لـە کـۆڵی خۆیـانی دەکەنەوە، بەڵام هەژاری تـەواو، کـە شایـستەی ئەوەیـە کـە دەسـتگیرۆیی بکـرێ‌و زەکاتی پـێ بـدرێ، ئـەو کەسـەیە کـە خـۆی ئەوەنـدەی دارایـی نییـە کـە بەباشـی بەشی بکاو، کەسیش پێی نازانێ تا زەکاتی پـێ بـداو دەسگیرۆیی‌و یارمـەتی پـێ بدا، وە خۆشی لەبەر قەدر گرتنی خۆی ناچێ سواڵ لـەم‌و لـەو بکـا). {ریـاض/٢. زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٥٣٧ + تاج/٢/٤٥، زنجیرە: ١٨، ژمارە: ١٢٤٦} .

---

[٦١٦] تجرید/٢، ژمارە: ٧١٢ = ١٤٧٩ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٦٢ = ٢٣٩٠ شیحا.

## (٣٥) باب: كراهة المسألة للناس
## ناباشیو ناپەسەندیی سوالّو سوالّکاری بۆ خەڵك

٦١٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عمر (رضى الله عنهما) أَنَّ النَّبِىَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لاَ تَزَالُ الْمَسْأَلَةُ بِأَحَدِكُمْ، حَتَّى يَلْقَى اللَّهَ وَلَيْسَ فِى وَجْهِهِ مُزْعَةُ لَحْمٍ ». {الحديث: ٢٣٩٣ = ٢٣٧١ فم. تجريد/٢، رقم: ٧١١ = ١٤٧٤، ١٤٧٥، ٤٧١٨}: [٦١٧]

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (پیاوی واتان هەیە، ئەی موسوڵمانینە! هەر خەریکی دەرووزەو سواڵکردنە، هەتا لە ڕۆژی ژینەوەدا، کەدێ بۆ دیوانی خوای گەورە بۆ لێپرسینەوە یەك پرزۆڵە گۆشت بەڕوویەوە نامێنێ، لەو دەشتی مەحشەرەدا خودا مۆری سواڵکەریی دەنێ بە ڕوویەوە، دەموچاوی یەك پارچە ئێسقانی ڕووتی بێ گۆشتە). {ریاض/٢/١٠٠، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٥٣٠}.

٦١٨- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « لأَنْ يَغْدُوَ أَحَدُكُمْ فَيَحْطِبَ عَلَى ظَهْرِهِ فَيَتَصَدَّقَ بِهِ، وَيَسْتَغْنِىَ بِهِ مِنَ النَّاسِ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَسْأَلَ رَجُلاً أَعْطَاهُ أَوْ مَنَعَهُ ذَلِكَ، فَإِنَّ الْيَدَ الْعُلْيَا أَفْضَلُ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ ». {الحديث: ٢٣٩٧ = ٢٣٧٥ فم. تجريد/٢/١٣٢، رقم: ٧٠٨ = ١٤٧٠، ١٤٨٠، ٢٠٧٤، ٢٣٧٤، ترمذى. زكاة: ٦٨٠ تحفة الأشراف: ١٤٢٩٣}: [٦١٨]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (سوێندم بەو کەسە کە گیانی منی

---

[٦١٧] تجرید/٢، ژمارە: ٧١١ = ١٤٧٤ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٥٨ = ٢٣٩٣.

[٦١٨] تجرید/٢، ژمارە: ٧٠٨ = ١٤٧٠ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٥٨ = ٢٣٩٢ شیحا.

بەدەسە، کەسێ لە ئێوە گوریسێ هەڵبگرێو بە کۆڵ کۆڵەدار بهێنێو بیفرۆشێو خێرو خێراتی لێ بکاو خۆی پێ رزگار بکا لەچاو بەرەوژێری ئەمو ئەو، ئەوەی گەلێ باشترە لەوە کەبچێ دەست لە مەردوم پان بکاتەوە، ئیتر ئەو خەڵکە بەشی بدەن یا بەشی نەدەن، هەرئیشکردنەکە باشترە لە سواڵکردنەکە. دیارە کە دەستی سەروو کە دەستی خێرکەرە لەدەستی ژێروو کەدەستی دەرووزەکەرە گەلێ باشترە، لە خێزانی خۆشتەوە، کە بژێوییان لەسەر تۆیە، دەست بکە بەخێرکردن!). {تاج/٢/٥٣، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ١٣٦٢}.

## (٣٧) باب: إباحة الأخذ لمن أعطى من غير مسألة ولا إشراف
## ئەگەر کەسێ بەبێ داواکردنو چاوچنۆکی شت وەربگرێ دروستە

٦١٩- عَنْ عمر بْنِ الخطاب رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: كَانَ رَسُولَ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعْطِينِي العَطَاءَ فَأَقُولُ: أعْطِهِ مَنْ هُوَ أفقَرُ إلَيْهِ مِني، فَقَالَ: (خُذْهُ إذا جَاءَكَ مِنْ هذا المَالِ شَيءٌ، وَأَنْتَ غَيْرُ مُشْرِفٍ وَلاسائلٍ، فَخُذْهُ وَمالا فَلا تُتْبِعْهُ نَفْسَكَ). (الحديث ١٤٧٣ – طرفاه في: ٧١٦٣، ٧١٦٤)[٦١٩]:

عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر بێ- کەبەشی دەدام لە ماڵ، عەرزیم دەکرد: قوربان! بیدە بەکەسێ کە ئەو لە من زیاتر پێویستی پێی هەبێ، ئەویش -دروودی خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: (ئەی عومەر! کاتێ لەم ماڵە شتێکت پێدرا وەری بگرە. بەمەرجێ چاوی تێنەبڕیو خۆت داوای نەکەی، ئەگینا خۆتی تێمەگەینە). (تاج/٢/٥١/٦ - ش/ن). ئەمە بوخاری بوو ئەمەیش موسلیمە.

---

[٦١٩] تجريد/٢، ژمارە: ٧١٠ = ١٤٧٣ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٦٧ = ٢٤٠٣ شيحا = ترقيم محمد فؤاد/١٠٤٥.

عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەر (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: جاران کـە پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) بەشــی دەدا بــە عومــەر، عومــەر دەیفەرموو: (ئەم ماڵە بدە بەکەسێ کە ئەو لەمن زیاتر پێویستیی پێـی هـەبێ). ئەویش (درووودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (ئـەی عومـەر! کاتـێ لـەم ماڵـە شتێکت پێ درا، وەری بگرەو بیکە بە ماڵ بۆ خۆت، یا بیکە بەخێرو بیبەخشە، بەمـەرجێ چـاوی تـێ نـەبڕیو خـۆت داوای نەکـەی، ئەگـەر وانـەبوو خـۆتی تـێ مەگەیەنەو مەچۆ لەشوێنی).

سالم (کە کوڕی ئیبنو عومەر بوو) دەیفەرموو: لەبـەر ئـەم فەرموودەیـەی پێغەمبەر بوو، کە عەبدوڵڵای باوکم داوای شتی لەکەس نـەدەکرد، بـەڵام ئەگـەر بەشێ، یا ماڵێ، یا شتێکی پێ بدرایە وەری دەگرتو ڕەتی نـەدەکردەوە! {تـاج/٢، لاپەڕە: ٥٥، ژمارە: ١٢٦٥}.

## ڕوونکردنەوە:

ســالمی کـوڕی عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەری کـوڕی خـەتاب، تابیعییـە، لـە پەیڕەوانـە، لەچـینی دووەمـی موسـوڵمانانە، دایکـی کـچی یـەزدەجورد بـوو، کـە پاشـای ئێـران بـووە، ناسـراوە بـە (أبـو عبـدالله المـدني الفقیـە) گێڕانـەوەی زۆری ئەنجام داوە: لە عەبدوڵڵای باوکیـەوە، لـە ئـەبو هـورەیرەوە، لـە کەسـانی تـرەوە، قورئــان خــوێنێکی جــوان بــوو، ئیمــامی مالیــك (ڕەحمــەتی خــودای لێ بــێ) دەفەرموێ: (لەسەردەمی سالمدا، مانەندی سالم، لەپیاو چاکیو خواناسیو زوهدو بەرێزیـدا کـەم بـوو). ئیبنـو موبـارەك دەفـەرموێ: سـالم یەکێکـە لـە حـەوت شــەرعزانەکانی مەدینــە. کــە پرســیارێکیان بــۆ دەهــات، هــەر حــەوتیان لێــی دەکۆڵینـەوە، قـازی مەدینـە ئەگـەر پرسـیارێکی بـۆ حـەل نەکرایـە، دەینـارد بـۆ

ئەوان، هەتا وەڵامەكەی ئەوانی وەرنەگرتایەتەوە بڕیاری نەدەدا. سالم سەوداو مامەڵەی بازاڕی دەكرد، هەتا مرد، ئیمامی ئەحمەدو إسحاقی كوڕی راهویە دەفەرموون: (دروستترین رشتە (واتە: أَصَحُّ الأَسَانِيد): زوهری لە سالم، لە باوكیەوە. ئیمامی بوخاری دەفەرمویٚ: سالم بیستنی لە عائیشەوە نییە. واباوە كە لەمانگی قوربانی ساڵی سەدو شەشی كۆچیدا مردووە، دایكی سالم‌و دایكی قاسمی كوڕی موحەممەدی كوڕی ئەبوبەكرو دایكی عەلی كوڕی حوسەینی كوڕی ئیمامی عەلی، هەرسێكیان خوشك بوون‌و كچی یەزدجرد بوون، كە ئاخر پاشای ئێران بووە، لە (٦٥١)ی زاینیدا، لەكاتی ئازادكردنی خۆراساندا لە لایەنی سوپای ئیسلامەوە كوژراوە.

## (٣٨) باب: كراهة الحرص على الدنيا
## سووربوون لەسەر جیهان كاریٚ ناپەسەندە

٦٢٠- عن أبى هريرة رَضِي اللَّه عَنْه قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لَا يَزَالُ قَلْبُ الْكَبِيرِ شَابًّا فِي اثْنَتَيْنِ فِي حُبِّ الدُّنْيَا وَطُولِ الْأَمَلِ. (الحديث ٦٤٢٠): [٦٢٠]

ئەبو هورەیرە فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: ئادەمیزاد هەتا پیرتر ببیٚ ئەم دوو ڕەوشتەی تیادا گەنجتر دەبێتەوە: خۆشەویستیی جیهان‌و هیوای دووردرێژ. (تاج/٩ ز/٩٧ ل/٣٠٣ ژ/٢ = بەرگی/٥، ژمارە: ٥١٧٤).

٦٢١– عَنْ أَنَسٍ – رضى الله عنه – قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – « يَكْبَرُ ابْنُ آدَمَ وَيَكْبَرُ مَعَهُ اثْنَانِ حُبُّ الْمَالِ ، وَطُولُ الْعُمُرِ»: [٦٢١]

---

[٦٢٠] تجريد/٢، ژمارە: ٢٠٠٢ = ٦٤٢٠ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٦٥ = ٢٤١٦.





ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (مرۆڤ هەتا پیرتر ببێ، ئەم دوو ڕەوشتەی تیادا زیاتر دەبێ: خۆشەویستی سامانو تەمەن درێژیو زیاتر حەزی لەژیانە!).

عَنْ أَنَسٍ بن مالك (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم): « يَهْرَمُ ابْنُ آدَمَ، وَتَشِبُّ مِنْهُ اثْنَتَانِ: الْحِرْصُ عَلَى الْمَالِ، وَالْحِرْصُ عَلَى الْعُمُرِ ». {الحديث: ٢٤٠٩ = ٢٣٨٧ = مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٦٤. بخاري. رقاق: ٦٤٢١. ترمذي. زهد: ٢٣٣٩. تحفة الأشراف: ١٤٣٤}:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئادەمیزاد هەتا پیرتر ببێ ئەم دوو ڕەوشەی تیادا گەنجتر دەبێتەوە: سوور بوون لەسەر ماڵو سوور بوون لەسەر تەمەنی درێژ). {تاج/٢/٢٩٧، زنجیرە: ٩٧، ژمارە: ٥١٩٣م}.

## (٣٩) باب: لَوْ أَنَّ لِابْنِ آدم واديين لابتغى ثالثا

## گریمان ئادەمیزاد پڕ بە دوو شیو سامانی هەبێ، هەوڵ دەدا کە بیکا بە سێ شیو هەروەها

٦٢٢- حديث أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - قَالَ « لَوْ أَنَّ لِابْنِ آدَمَ وَادِيًا مِنْ ذَهَبٍ أَحَبَّ أَنْ يَكُونَ لَهُ وَادِيَانِ ، وَلَنْ يَمْلَأَ فَاهُ إِلاَّ التُّرَابُ ، وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَى مَنْ تَابَ »:[٦٢٢]

واتاکەی لەژمارە (٦٢٣)دا، لەپاش ئەم ژمارەوە دێت.

---

[٦٢١] بخاری. رقاق/٦٤٢١، مختصر صحیح مسلم/٢: ٥٦٤ = ٢٤٠٩.

[٦٢٢] بخاری. رقاق (١٠) باب ما يتعى من فتنه المال. مسلم: ٢٤١٤. ترقيم شيحا - م. ص. م/ ٥٦٤.

٦٢٣- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِي اللّٰه عَنْهمَا يَقُولُ سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلّٰى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لَوْ كَانَ لِابْنِ آدَمَ وَادِيَانِ مِنْ مَالٍ لَابْتَغَى ثَالِثًا وَلَا يَمْلَأُ جَوْفَ ابْنِ آدَمَ إِلَّا التُّرَابُ وَيَتُوبُ اللّٰهُ عَلَى مَنْ تَابَ. (الحديث ٦٤٣٨): [٦٢٣]

ئیبنـو عـەباس- رەزای خـودا لـەخۆیو بـابی- فـەرمووی بـەگوێی خـۆم لـەزاری پـیرۆزی خۆشەویـستم ژنـەوت دیفـەرموو: ئـەم ئـادەمیزادە ئەوەنـدە چاوچـنۆك و بەتەماعـە، بـەهیچ شـتێ تێرنـاخواو چـاوی تێرنابـێ، گریمـان پڕبەشیوێ زێڕی هـەبێ، حـەز دەكا بیكا بـە دووشـیو، پـڕ بـە دووشـیو سامانو زێڕی هەبێ حەز دەكا كە بیكا بەسێ شیو، وەهەروەها هەتا پتری هـەبێ هـەوڵو هەڵپە بۆ پتر دەكا!! ئیتر مەگەر گڵ چاوی ئـادەمیزاد پڕبكا. ئـادەمیزاد مەگـەر بـەگڵی گۆڕ تێربخـوا، مەگـەر بـەمردن تـەماعی نـەمێنێ، هەركەسـێكیش لەهـەر گوناهـێ تەوبـە بكـا -وەك ئـەوە تەوبـە لەچاوچـنۆكی بكـا- خـودا تەوبـەی گـیرا دەكـاو، پەشـیمانی لەهـەموو كەسـێ قەبووڵـە. (ریـاض/١ ل/٤٤ ز/٣ ژ/٢٣/١١/٢٣ + تاج/٩ ل/٢٩١ ز/٩٤ ژ/١٤).

## (٤٠) باب: لیس الغنی عن كثرة العرض
## دەوڵەمەندی بە دڵە بەماڵ نییە

٦٢٤- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللّـهِ (صـلى الله عليـه وسلم): « لَيْسَ الْغِنَى عَـنْ كَثْـرَةِ الْعَـرَضِ، وَلَكِـنَّ الْغِنَـى غِنَـى الـنَّفْسِ ». {الحـديث: ٢٤١٧ = ٢٣٩٥ فم. بخاري. رقـاف: ٦٤٤٦. ترمـذي. زهـد: ٢٣٧٣. ابـن ماجـة. زهـد: ٤١٣٧}: [٦٢٤]

---

[٦٢٣] تجرید/٥، ژمارە: ٢٠٠٦ = ٦٤٣٨ = مسلم: ١٠٤٩.

[٦٢٤] بخاری. رقاق: ٦٤٤٦ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٦٣ = ٢٤١٧.

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (دەوڵەمەندیی بەزۆری ماڵو دارایـی نییـە، بـەڵام دەوڵەمەندیی بە بەرچاو تێریی‌و دڵ تێرییە). {ریاض/٢/٩٥، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٥٢٢}.

شێخی سەعدی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ:

**دەوڵەمەندی بەدڵە، بەماڵ نییە**

**گەورەیی بەعەقڵە، بەساڵ نییە**

## (٤١) باب: تخوف ما یخرج من زهرة الدنیا
## مەترسی بەرهەمە ڕازاوەکانی زەوی کە دەبن بەمایەی ئارایش‌و ڕازانەوەو ڕەونەقی ژیانی جیهان

٦٢٥- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ (رضى الله عنه) قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّـهِ (صـلى الله عليه وسلم) فَخَطَبَ النَّاسَ فَقَالَ: « لاَ وَاللَّهِ مَا أَخْشَى عَلَيْكُمْ أَيُّهَا النَّاسُ إِلاَّ مَا يُخْرِجُ اللَّهُ لَكُمْ مِنْ زَهْرَةِ الدُّنْيَا ». فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُـولَ اللَّـهِ أَيَـأْتِى الْخَيْـرُ بِالـشَّرِّ؟ فَـصَمَتَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) سَاعَةً ثُمَّ قَالَ: « كَيْفَ قُلْتَ؟ ». قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيَأْتِى الْخَيْرُ بِالشَّرِّ؟ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صـلى الله عليـه وسـلم): « إِنَّ الْخَيْـرَ لاَ يَأْتِى إِلاَّ بِخَيْرٍ. أَوَ خَيْـرٌ هُـوَ؟ إِنَّ كُـلَّ مَـا يُنْبِـتُ الرَّبِيـعُ يَقْتُـلُ حَبَطًـا أَوْ يُلِـمُّ، إِلاَّ آكِلَـةَ الْخَضِرِ، أَكَلَتْ حَتَّى إِذَا امْتَلأَتْ خَاصِرَتَاهَا اسْتَقْبَلَتِ الشَّمْسَ ثَلَطَتْ أَوْ بَالَتْ ثُمَّ اجْتَرَّتْ فَعَادَتْ فَأَكَلَتْ، فَمَنْ يَأْخُذْ مَالاً بِحَقِّهِ يُبَارَكْ لَهُ فِيهِ، وَمَنْ يَأْخُذْ مَالاً بِغَيْـرِ حَقِّـهِ فَمَثَلُـهُ




كَمَثَلِ الَّذِي يَأْكُلُ وَلاَ يَشْبَعُ ». {الحديث: ٢٤١٨. تجريد/٢/١٢٥، رقم: ١٤٦٥، ٩٢١، ٢٨٤٢، ٦٤٢٧. نسائي. زكاة: ٢٥٨٢} : [٦٢٥]

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر دوانگەکەی دانیشتبوو، ئێمەیش لەدەوری دانیشتبووین، هەڵسایەوە وتارێکی بۆ مەردومەکە داو فەرمووی: (سوێند بەخودا، ئەی موسوڵمانینە! من زۆرتر لەوە مەترسیتان لێ دەکەم، کە خودا لە پیتو فەڕو بەرهەمی زەوی دەری دەهێنێ بۆتان). گوترا: ئەی پێغەمەری خودا! مەبەست لە پیتو فەڕو بەرهەمی زەوی چییە؟ فەرمووی: (ئەوەیە کەدەبێ بەمایەی ئارایشتو رەونەقی ژیانی جیهان، وەك زێڕو زیوو کانو سامانی نایابی تر، کە زەوی بەرهەمی دەهێنێ!).

پیاوێ عەرزی کرد: قوربان! بۆچی شتی وا دەبێ کە ئەم خێرو خۆشییە ببێ بەهۆی خراپەو شەڕ؟!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا ماوەیێ راماو ماتو خامۆش بوو، هەتا زەینمان بۆ ئەوە چوو کە لەم بارەیەوە سرووشی بۆبێ (سرووش - نیگا = وەحی) جا پاش ماوەیێ باراناوی ئارەقی ناوچەوانی خۆی سڕی (چونکە وەك حەزرەتی عائیشە دەفەرموێ: بەخودا بۆ خۆم پێغەمبەرم بینیوە، کاتێ سرووشی بۆ دەهات، وەها سەخڵەت دەبوو، لەرۆژی سەرماو سۆڵەدا، کە سرووش دەهاتە خوارەوە بۆی، لەوکاتەدا واشەکەت دەبوو، کاتێ کە بارودۆخی سرووشەکە بەری دەدا، چۆڕاوگەی ئارەق بە ناوچەوانیدا، خوڕ خوڕ دەهاتە خوارەوە!). {تەجرید/١، ژمارە: ٢} .

---

[٦٢٥] تجرید/٢، ژمارە: ٧٠٣ = ١٤٦٥ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٦٧ = ٢٣٠٤ = ١٠٥٢ محمد فؤاد.




جا ئارەقی ناوچەوانی خۆی سڕی‌و فەرمووی: (پرسیارکەرەکە کوانێ؟) فەرمووی: قوربان! ئەمەتام، فەرمووی: (چۆنت گوت؟) فەرمووی: عەرزم کردی: شتی وا دەبێ کە خێر سەر بکێشێ بۆ خراپە؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خێر هەر خێر دەهێنێ‌و چاکە هەردەبێ بەهۆی چاکە، بەڵام ماڵی دنیا میوەیەکی شیرین‌و خۆشە، وەك سەوزەگیای بەهار ناسك‌و نازدارە، هەموو کەسێ کەم تازۆر حەزی لێ دەکا، جا ئەوەی کە بەشێوەیەکی ڕەوا پەیدای دەکاو، لەسەر شێوەیەکی ڕەوا جێگەی دەکاتەوە، ئەوە کۆمەك‌و دەسمایەیەکی فرەخاسە بۆی، بەڵام ئەوەی کە بەشێوەیەکی ناڕەوا پەیدای بکاو لە ڕێگەیەکی خراپەوە خەرجی بکا، ئەوە وەك سکەڕۆو ژەمەنبووردە وایە، هەردەخواو هەرتێر ناخوا، دەق ماڵیش وەك سەوزەو گژوگیای بەهار وایە، ئێوە دەڵێن: گوایە گژوگیای بەهار شتی چاکەو ئاژەڵی پێ دەژی، بەڵام ئەم قسەیە گشت کاتێ وانییە چونکە گەلێ گژوگیای بەهار ئاژەڵ ئەگەر هەربیماشێتەوەو زیادە خۆری تیابکا، تورخەو کاپێچی پێ دەکاو دەیکوژێ، یا زۆری نامێنێ کە بیکوژێ، بەڵام ئاژەڵی گیاخۆر، کە بەدەم‌و جەم دەیخوات کەلەکەی هەڵ دێ، ئەوجا خۆی دەدا بەخۆرو دەست دەکا بە کاوێژو بە ئاسایی ڕیخ‌و گمیزی خۆی دەکاو، لەپاشدا هەمیشە لەسەر ئەم ڕێساو دەستوورە تێ هەڵ دەچێتەوە، لەگیا خواردن‌و وچانگرتنی خۆی، ئەو ئاژەڵە هیچی لێ نایەت.

ئیتر هەرکەسێ لە ڕێگەی ڕەواوە ماڵداری بکا، خودا بۆی پیرۆز دەکا، بەڵام هەرکەسێ بەناڕەوا سامان کۆبکاتەوە، چەشنی سکەڕۆی ژەمەنبوردە وایە، هەردەخواو هەر تێر ناخوا). {تاج/٥، لاپەڕە: ٢٩٠، زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ٥١٧٧.م}.

٦٢٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَلَسَ ذَاتَ يَوْمٍ عَلَى المِنْبَرِ، وَجَلَسْنَا حَوْلَهُ، فَقَالَ: (إِنَّ مِمَّا أَخَافُ عليكُمْ مِنْ

بَعْدِی مايُفْتَحُ عَليكُمْ مِنْ زهْرةِ الدُّنيا وَزينتِهَا). فَقَالَ رَجُلٌ: يَارَسُولَ اللهِ أَوَ يـأتِي الخَيْـرُ بالشرَّ؟ فَسَكَتَ النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقِيلَ لَهُ: مَاشَأْنُكَ. تَكَلِمُ النبيَّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلاَيُكَلِمُكَ؟ فَرَأَيْنا أَنَّهُ يَنْزِلُ عَلَيْهِ، قالَ: فَمَسَحَ عَنْهُ الرُحَـضَاءَ فَقـالَ: (أَيْـنَ السَّائِلُ؟) وَكَأَنَهُ حَمِدَهُ فَقَالَ: (إنه لا يأتِي الخيرُ بالـشرِ، وَإِنَّ مِمَّـا يُنبِـتُ الرَّبيـعُ يَقْتُـلُ أَوْيُلِمُ، إلاَّ آكِلَةَ الخَضْراءِ أَكَلَتْ حَتى إذا امْتَدَّتْ خَاصِرتاها، اسْتَقْبلَتْ عَـيْنِ الـشمْسِ، فَثَلَطَتْ وَبَالَتْ وَرتَعَتْ، وَإِنَّ هُذا المَالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، فَنِعْمَ صَاحِبُ المسْلِمِ مَاأعْطى مِنْـهُ المِسْكِينَ وَاليَتِيمَ وَابْنَ السبيلِ أوْ كَمَا قَالَ النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وإِنَّـهُ مَـنْ يَأْخُـذُهُ بِغَيْرِ حِقِهِ كَالَّـذِی يَأْكُـلُ وَلاَ يَـشْبَعُ، ويكُـونُ شَـهِيداً عليـه يَـوْمَ القِيامَـةِ). (الحـديث ١٤٦٥): [٦٢٦]

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر -دروودی خـوای لەسـەر بـێ- لەسـەر دوانگەکـە دانیـشتو ئێمـەیش لـەدەوری دانیشتین، فەرمووی: (مـن زۆرتـر لـەوە مەترسـیتان لێدەکەم، کەخودا لـەپیتو فەڕی زەوی دەری دەهێنـێ بۆتـان) عـەرزی کـرا: مەبەسـت لـەپیتو فـەڕی زەوی چییە؟ فەرمووی: (ئەوەیە کە دەبێ بەمایەی ئارایشتو ڕەونەقی ژیـانی جیهان، وەك زێڕو زیوو سامانی تر. پیاوێ عەرزی کرد: قوربان! بۆچی شتیوا دەبـێ کـە ئەم خێرو خۆشییە ببێ بە مایەی خراپەو شەڕ!

پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- هـەتا ماوەیـێ ڕامـاو مـاتو خـامۆش بوو گوتیان بە پرسیارکەرەکە: ئەوە چیتە هەر لەخۆتەوە، بەبێ ئەوە پێغەمبەر قسەت لەگەڵدا بکات، قسەی لەگەڵ دەکـەی؟ خامۆشـییەکەی پێغەمبـەر -درروودی خوای لەسەر بێ- درێژەی کێشا، هەتا زەینمـان بـۆ ئـەوە چـوو کـە لـەم بارەیـەوە

---

[٦٢٦] تجریـد/٢، ژمـارە: ٧٠٣ - ١٤٦٥، مـسلم/١٠٥٢ - ٢٣٠٤ تـرقیم مامۆسـتا خلیـل مـأمون شـیحا لمسلم.

سرووش (وەحی = نیگا)ی بۆ بێ، پاش ماوەیێ باراناوی ئارەقی ناوچەوانی خۆی سڕیو فەرمووی: (کوا پرسیارکەرەکە؟) وەك بڵێی پرسیارەکەیی پێخۆش بێ وابوو، پیاوەکە گوتی: قوربان! ئەمەتام، فەرمووی: (خێر هەرخێر دێنێو چاکە هەردەبێ بەهۆی چاکە، کەواتە: خێر شەڕ ناهێنێ! بەڵام ماڵی دنیا میوەیەکی شیرینو خۆشە، وەك سەوزەگیای بەهار ناسكو نازدارە، هەمووکەسێ کەم تازۆر حەزی لێ دەکا، جائەوەی کە بەشێوەیەکی ڕەوا پەیدای بکاو، لەسەر شێوەیەکی ڕەوایش جێگەی بکاتەوە، ئەوە کۆمەكو دەستگیرێکی فرەچاکە بۆی، وەلێ ئەوەی بەشێوەیەکی ناڕەوا پەیدای بکا، ئەوە وەك سکەڕۆو ژەمەنبووردە وایە، هەر دەخواو هەرتێر ناخوا، دەق ماڵیش وەك سەوزەو گژوگیای بەهار وایە، ئێوە دەڵێن: گوایە گژوگیای بەهار شتی چاکەو ئاژەڵی پێدەژی، ئەمە ڕاستەو وایە، بەڵام گەلێ جاریش ئەگەر ئاژەڵ هەر بیماشێتەوەو زیادەخۆری تیا بکا، تورخەو کاپێچو ژانی پێدەکاو دەیکوژێ، یازۆری نامێنێ کە بیکوژێ، بەڵام ئاژەڵی گیاخۆرکە بەدەمو جەم دەیخوا تاکەلەکەی هەڵدێ، ئەوجا خۆی دەدا بە خۆرو دەست دەکا بەکاوێژو بەئاسایی ڕیخو گمیزی خۆی دەکاو لەپاشدا هەمیشە لەسەر ئەم یاساو دەستوورە تێهەڵ دەچێتەوە، لەگیا خواردنو وچان گرتنی خۆی، ئەو ئاژەڵە هیچی لێ نایەت.

لەڕاستیدا ئەم ماڵە میوەیەکی سەوزو خۆشە وەهاریکارێکی چاکە، بۆ ئەو مسوڵمانەی کە بەشی نەداراو هەتیوو ڕێبواری لێ دەدات، وەئەوەی کە ماڵ بە ناڕەوا پەیدا بکا وەك ژەمەنبردە وایە، هەردەخواو تێر ناخوا، وە ڕۆژی قیامەتیش دەبێ بەشایەت لەسەری) (تاج/٢/٥٢ ف/٧ + تاج/٩/ ٢٩٤ ف/٢١).

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

شێخ ئەبوحامید -ڕەحمەتی خودای لێ بێ- دەڵێ: (ماڵ وەك مار وایە، کەهەم تریاقی واتیا، کە شتێکی بەکەڵکە، وەهەم زەهری واتیا، کە شتێکی کوشندەیە، خاوەن ماڵیش یا وەك مارمژی لێزان وایە، بەهۆشیارانە خۆی لە شەڕی مارەکە ڕزگار دەکاو، بەشارەزایی تریاقەکەی لێ دەردەهێنێ، یا وەك کابرایەکی گێلۆکە بەنەزانی دەیگرێو پێوەی دەداو تووکی سەری با دەیبا، خوا پەنامان بدا لەشتی وا).

## (٤٢) باب: فضل التعفف والصبر

## بەهرەی خۆپاراستن لە هەڵپەی زۆر بۆ سامان نارامگرتنو ساچان بە بەشی خودا

٦٢٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ نَاسًا مِنَ الأَنْصَارِ سَأَلُوا رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَأَعْطَاهُمْ، ثُمَّ سَأَلُوهُ فَأَعْطَاهُمْ، حَتَّى إِذَا نَفِدَ مَا عِنْدَهُ، قَالَ: « مَا يَكُنْ عِنْدِي مِنْ خَيْرٍ فَلَنْ أَدَّخِرَهُ عَنْكُمْ، وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللَّهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللَّهُ، وَمَنْ يَصْبِرْ يُصَبِّرْهُ اللَّهُ، وَمَا أُعْطِيَ أَحَدٌ مِنْ عَطَاءٍ خَيْرٌ وَأَوْسَعُ مِنَ الصَّبْرِ ».
{الحديث: ٢٤٢١ = ٢٣٩٩ فم. تجريد/٢/١٣١، رقم: ٧٠٧ = ١٤٦٩، ١٤٧٠. أبو داود. زكاة: ١٦٤٤. ترمذي. بروصلة: ٢٠٢٤. نسائي. زكاة: ٢٥٨٧. تحفة: ٤١٥٢}: [٦٢٧]

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چەند کەسێ لە یاریدەدەران (ئەنصار) چەند جارێ داوای بەشیان لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد، ئەویش هەموو جارێ بەشی دەدان، تا ئەو ماڵەی کە لەلای بوو

[٦٢٧] تجريد/٢، ژمارە: ٧٠٧ = ١٤٦٩ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٥٥ = ٢٤٢١ شيحا.

هەمووی تەواو بوو، جا فەرمووی (درووودی خودای لەسەر بێ): (ئەو ماڵو خێرو بێرەی کە لەلای من بێ، لە ئێوەی ناشارمەوە، وەمن ئەوەی لە دەستم بێ، لەئێوە درێغی ناکەم، وە هەرکەسێکیش خۆی بەدوور بگرێ لە روو زەرد یی سواڵو سواڵکردن، خودا لەهەردوو جیهانا، روو سوورو سەربەرزی دەکا، وە هەرکەسێکیش چاوی تێربێو خۆی بێ نیاز بگرێو چاوی لەدەستی ئەمو ئەو نەبێ، خودا دەوڵەمەندو بێ نیازی دەکاو، وە هەرکەسێکیش دان بەخۆیا بگرێو سەبووری خۆی بدا، دڵنیابێ کە خودایش سەبرو ئارامی پێ دەبەخشێ، وەباشترینو گەورەترین خەڵاتێ کە بەکەسێ بدرێ، یا درابێ، خەڵاتو نازو بەهرەی سەبرو ئارامگرتنە). {تاج/٢/٥٢، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ١٢٦٠} + {ریاض/١، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٢٦}.

## (٤٣) باب: في الكفاف والقناعة
## بژێویو رۆژی سەروبەرو ساچان بە بەشی خودا

٦٢٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللّٰه عَنْه قَالَ قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اللّٰهُمَّ ارْزُقْ آلَ مُحَمَّدٍ قُوتًا. (الحديث ٦٤٦٠): [٦٢٨]

ئەبو هوریرە- رەزای خودای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمبەر(درووودی خودای لەسەر بێ) دیفەرموو: خودایە! رزقو رۆژی خێزانو کەسوکاری موحەمەد ئەوەندە بدە کەسەرو بەرپێی بژینو بەس. (ریاض/٢ ل-٧٣ ز:٥٦ ژمارەی فەرموودە: ٥٠١/١١ –ش).

---

[٦٢٨] تجرید/٥، ژمارە: ٢٠٠٩ = ٦٤٦٠، مسلم: ١٠٥٥ = ٢٤٢٤ ترقیم شیحا.

## (٤٤) باب: إعطاء من سأل بفحش وغلظة
## بەشدان بە کەسێ بە ڕەقیو زبری داوای بەش بکا

٦٢٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنه) قَالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَعَلَيْهِ رِدَاءٌ نَجْرَانِيٌّ غَلِيظُ الْحَاشِيَةِ، فَأَدْرَكَهُ أَعْرَابِيٌّ فَجَبَذَهُ بِرِدَائِهِ جَبْذَةً شَدِيدَةً، نَظَرْتُ إِلَى صَفْحَةِ عُنُقِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَقَدْ أَثَّرَتْ بِهَا حَاشِيَةُ الرِّدَاءِ مِنْ شِدَّةِ جَبْذَتِهِ، ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ مُرْ لِي مِنْ مَالِ اللَّهِ الَّذِي عِنْدَكَ، فَالْتَفَتَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَضَحِكَ، ثُمَّ أَمَرَ لَهُ بِعَطَاءٍ. {الحديث: ٢٤٢٦ = ٢٤٠٤ فم. تجريد/٣، لاپەڕە: ٣٩٨، رقم: ١٢٧٣ = ٣١٤٩، ٥٨٠٩، ٦٠٨٨. تحفة الأشراف: ٢٠٥} :[٦٣٩]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەڕۆیشتم بەڕێدا، شاڵێکی نەجرانی پەراوێز ئەستووری بەسەر شانەوە بوو، عارەبێکی دەشتەکی پێ گەیشت، یەخەی پۆشاکەکەی پێغەمبەری گرتو بەتوندی وا ڕایکێشا لاملی حەزرەتی دابڕیو کاری تێکرد! ئەوجا پێی گوت: ئەی موحەممەد! لەم ماڵە کەهی خودایەو لای تۆ دانراوە بەشم بدە. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوڕی لێ دایەوەو بەدەمیەوە پێکەنیو فەرمانی کرد کە بەشی بدەن، ئەوانیش بەشیاندا). {تاج/٣، لاپەڕە: ٢٥٢، زنجیرە: ٣١، ژمارە: ٢٧٨٢} .

٦٣٠- عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ (رضى الله عنهما) أَنَّهُ قَالَ: قَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَقْبِيَةً وَلَمْ يُعْطِ مَخْرَمَةَ شَيْئًا، فَقَالَ مَخْرَمَةُ: يَا بُنَيَّ انْطَلِقْ بِنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ، قَالَ: ادْخُلْ فَادْعُهُ لِي، قَالَ: فَدَعَوْتُهُ لَهُ، فَخَرَجَ إِلَيْهِ وَعَلَيْهِ قَبَاءٌ مِنْهَا، فَقَالَ: « خَبَأْتُ هَذَا لَكَ ». قَالَ: فَنَظَرَ إِلَيْهِ،

---

[٦٣٩] تجرید/٣، ژمارە: ١٢٧٣ = ٣١٤٩ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٦٩ - ٢٤٢٦ شیحا.

فَقَالَ: « رَضِـيَ مَخْرَمَـةُ ». {الحـديث: ٢٤٢٨ = ٢٤٠٦ فـم. تجريـد/٣، لاپـەڕە: ١٩٦، رقـم: ١١٠٨ = ٢٥٩٩، ٢٦٥٧، ٣١٢٧، ٥٨٠٠، ٥٨٦٢، ٦١٣٢. أبـو داود. لبـاس: ٤٠٢٨. ترمذی. أدب: ٢٨١٨. نسائی. زينة: ٥٣٣٩، تحفة الأشراف: ١١٢٦٨} : [٦٣٠]

میسوەری کوڕی مەخرەمـە (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: بـاوکم فەرمووی پـێم: کوڕم! دەڵێن: پێغەمبـەر (درورودی خـودای لەسـەر بـێ) هەنـدێ کـەوای بـۆ هـاتووە خەریکـە دابەشـیان دەکـا، بـابڕۆین بـۆ خزمـەتی، کەچـووین پێغەمبەر (درورودی خودای لەسەر بێ) لە ماڵەوە بوو، باوکم گوتی: کوڕم بـچۆرە ژوورەوە بـانگی بکـە بـۆم (منـیش شـتی وام بـەلاوە ئەسـتەم بـوو، بۆیـە گـوتم: پێغەمبەر بانگ بکەم بـۆ تـۆ!! گوتی: کـوڕم! خـۆ مـن مەبەسـتم ئـەوە نییـە کـە لەقــەدری پێغەمبــەر (درورودی خــودای لەســەر بــێ) کــەم بکەمــەوە، بــەڵکوو مەبەستم ئەوەیە کە ئەو پێغەمبەرەو بێ هەوایە، خۆ زۆردارو زەبردار نییە، تـا بە فیزو دەعیە بێ‌و کەس نەوێرێ بانگی بکا) جا منیش چووم بانگم کرد بۆی‌و پێغەمبـەر (درورودی خـودای لەسـەر بـێ) هاتـە دەرەوە بـۆلای بـاوکم، کەوایـەکی دێباجی لەبـەردا بـوو، بـە دوگمـەی زێـڕ یەخەکـەی داخرابـوو، فـەرمووی: (ئـەی مەخرەمـە! ئەمـەمان بـۆ تـۆ شـاردۆتەوە!). فـەرمووی: باوکیـشم سـەیری کـردو بەدڵی بوو، ئەوجا فەرمووی: بەڵێ قوربان! بەدڵمە! ئیتر کەواکەی دا بـە بـاوکم. {تاج/٣، لاپەڕە: ٢٥٦، زنجیرە: ٣١، ژمارە: ٢٧٧٩}.

**ڕوونکردنەوە:**

میسوەری کوڕی مەخرەمە، خۆی‌و باوکی، لە هـاوەڵانی پێغەمبـەرن، خـۆی لە هاوەڵە بچکۆلەکانی پێغەمبەرە، چـونکە بـە دوو سـاڵ لـەدوا کـۆچ (هیجـرەت)

---

[٦٣٠] تجرید/٣، ژمارە: ١١٠٨ = ٢٥٩٩ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٧٠ = شیحا: ٥٧٠.

لەدایك بوو، لە مەككە لەدایك بووە، كە پێغەمبەر (درroodی خودای لەسەر بێ) مرد، ئەو تەمەنی هەشت ساڵان بوو، لە ریجالی صەحیحەینە، واتە: لە بوخاریو موسلیمدا فەرموودەی هەیە، لە مەككە لەدایك بووە، مەلایەكی شەرعزانی گەورە بوو، زۆر بەرێزو بەدین بوو، لە تەمەنی شەستو دوو ساڵیدا، لە ئابلۆقەكەی مەككەدا، لەسەردەمی ئیبنو زوبەیردا، لە شەستو چواری كۆچیدا لە كاتێكدا، لە مەسجیدولحەرام، لەناو حیجردا نوێژی دەكرد، بەردێ لە مەنجەنیقی گەمارۆ دەرەكان بەری كەوتو شەهیدی كرد! ئیبنو زوبەیر لە حەجوون نوێژی لەسەر تەرمەكەی كرد.

مەخرەمەی كوڕی نەوفەل (كە باوكی ئەم میسوەرمیە، لە مەسلەمەی فەتحە، رەگەز ناسێكی باش بوو، یەكێك بوو لەو چوار پیاوەی كە عومەر ناردنی بۆ نوێژەن كردنەوەی كێلەكانی بەستی مەككە، كە خاكی حیلل لە خاكی حەرەم جیادەكەنەوە، لە كۆتایی تەمەنیدا كوێر بوو، دەڵێن: سەدو پازدە ساڵ ژیاوە، لەساڵی پەنجاو چواری، یا پەنجاو پێنجی كۆچیدا مردووە، (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

### (٤٥) باب: إعطاء من يخاف على إيمانه
### بەشدان بە نۆموسوڵمانو بە باوەڕكزەكان

٦٣١- عَنْ سَعْدِ بنْ أَبِي وَقاصٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـه) أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ (أَعْطى رَهْطا وَسَعْدٌ جَالِسٌ فَتَرَكَ رَسُـولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ رَجُلًـا هُـوَ أَعْجَبُهُمْ إِلَيَّ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا لَكَ عَنْ فُلَان فَوَاللَّهِ إِنِّي لَأَرَاهُ مُؤْمِنًـا فَقَـالَ أَوْ مُـسْلِمًا فَسَكَتُّ قَلِيلًا ثمَّ غَلَبَنِي مَا أَعْلَمُ مِنْهُ فَعُدْتُ لِمَقَالَتِي فَقُلْتُ مَا لَكَ عَنْ فُلَان فَوَاللَّهِ إِنِّي لَأَرَاهُ مُؤْمِنًا فَقَالَ أَوْ مُسْلِمًا فَسَكَتَ قَلِيلاً ثمَّ غَلَبَنِي مَا أَعْلَمُ مِنْهُ فَعُدْتُ لِمَقَالَتِي وَعَادَ رَسُولُ اللَّهِ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثمَّ قَالَ يَا سَعْدُ إِنِّي لَأُعْطِي الرَّجُلَ وَغَيْرُهُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْهُ خَشْيَةَ أَنْ يَكُبَّهُ اللَّهُ فِي النَّارِ). (الحديث ٢٧ ـ طرفه في: ١٤٧٨)[٦٣١]

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: من خۆم دانیشتبووم لەوکاتەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەشی دەستەیەکی دا، بەڵام بەشی پیاوێکی نەدا، بەلای منەوە ئەو پیاوە باشترینیان بوو، لەبەرئەوە گوتم: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە بۆچی فیسارەکەست بوارد، خۆبەخودا من بەبڕواداری دەزانم، فەرمووی: بەڵکوو بڵێ بەموسوڵمانی دەزانم‌و لەحاڵی وادا شایەتی باوەڕ، کە شتێکە والەناو دڵ دا بۆئەم جۆرە کەسەی مەدە) جا منیش کەمێ بێدەنگ بووم، هەتا ئەوەی دەمزانی لەبارەی موسوڵمانەتی ئەو پیاوەوە زۆری بۆ هێنام لەبەر ئەوە پرسیارەکەمم دووبارە کردەوە، پێغەمبەریش هەر فەرمایشتەکەی پێشووی دووبارە کردەوە، لەبەر ئەوە کەمێکی تریش بێ دەنگ بوومەوە، هەتا لەبەر هەمان هۆی پێشوو پرسیارەکەمم بۆ جاری سێیەم دووبارە کردەوە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) دیسانەوە هەر فەرمایشتەکەی پێشووی دووبارە کردەوە، لەدوایی دا فەرمووی: (ئەی سەعد! گەلێ جار من بەش دەدەم بەهەندێ کەس، هەیشە لەوم خۆشتر دەوێ‌و بەشیشی نادەم، دەزانی ئەوەبۆ؟ چونکە هەندێ کەس نۆ موسوڵمانن، یاچاوچنۆکن، دەمەوێ بەبەش پێدان بیان لاوێنم‌و بیانکەم بەدۆستی ئیسلام، نەبادا بچێتەوە ناو بێ بڕوایی‌و خودا لەناو ئاگری دۆزەخ دا سەرەنگرێی بکا، بەڵام هەیە خۆی موسوڵمانی ساغە، پێویستی بەلاواندنەوە نیە).

---

[٦٣١] تجرید/١، ژمارە: ٢٦ = ٢٧، ١٤٧٨ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥١١ - ٣٧٦.

## (٤٦) باب: إعطاء المؤلفة قلوبهم على الإسلام، وتصبر من قوى إيمانه
## بەشدان بە نۆ موسوڵمان، تا هۆگری ئیسلام ببن، وە ئارامگرتنی باوەڕ قایمەکان

٦٣٢- عنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ أَنَّ نَاسًا مِنْ الأَنْصَارِ قَالُوا لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِينَ أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ أَمْوَالِ هَوَازِنَ مَا أَفَاءَ فَطَفِقَ يُعْطِي رِجَالاً مِنْ قُرَيْشٍ الْمِائَةَ مِنْ الإِبِلِ فَقَالُوا يَغْفِرُ اللَّهُ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُعْطِي قُرَيْشًا وَيَدَعُنَا وَسُيُوفُنَا تَقْطُرُ مِنْ دِمَائِهِمْ قَالَ أَنَسٌ فَحُدِّثَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمَقَالَتِهِمْ فَأَرْسَلَ إِلَى الأَنْصَارِ فَجَمَعَهُمْ فِي قُبَّةٍ مِنْ أَدَمٍ وَلَمْ يَدْعُ مَعَهُمْ أَحَدًا غَيْرَهُمْ.

فَلَمَّا اجْتَمَعُوا جَاءَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: (مَا كَانَ حَدِيثٌ بَلَغَنِي عَنْكُمْ) قَالَ لَهُ: فُقَهَاؤُهُمْ: أَمَّا ذَوُو آرَائِنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ فَلَمْ يَقُولُوا شَيْئًا وَأَمَّا أُنَاسٌ مِنَّا حَدِيثَةٌ أَسْنَانُهُمْ فَقَالُوا: يَغْفِرُ اللَّهُ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُعْطِي قُرَيْشًا وَيَتْرُكُ الأَنْصَارَ وَسُيُوفُنَا تَقْطُرُ مِنْ دِمَائِهِمْ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (إِنِّي أُعْطِي رِجَالاً حَدِيثٌ عَهْدُهُمْ بِكُفْرٍ أَمَا تَرْضَوْنَ أَنْ يَذْهَبَ النَّاسُ بِالأَمْوَالِ وَتَرْجِعُوا إِلَى رِحَالِكُمْ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَوَاللَّهِ مَا تَنْقَلِبُونَ بِهِ خَيْرٌ مِمَّا يَنْقَلِبُونَ بِهِ) قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ رَضِينَا فَقَالَ لَهُمْ: (إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ بَعْدِي أَثَرَةً شَدِيدَةً فَاصْبِرُوا حَتَّى تَلْقَوْا اللَّهَ وَرَسُولَهُ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى الْحَوْضِ) قَالَ أَنَسٌ: فَلَمْ نَصْبِرْ) (الحديث: ٣١٤٧، طرفُهُ سبق في الحديث الذي قبلهُ. أي في رقم: ١٢٧٠ت= ٣١٤٦ف)[٦٣٢]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی غەزای حونەین کە خودای گەورە ماڵێکی زۆری بێ ئارەقی مفتی زۆری ڕەخساند بۆ پێغەمبەر(دروودی

---

[٦٣٢] تجريد/٣، ژمارە: ١٤٧١ = ٣١٤٦ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥١٢ = ٢٤٣٨ شيحا.





خــوای لەســەر بــێ) لــەو ماڵــەی کــە بــەتاڵانی لــەهۆزی هــەوازین گــیرا، پێغەمبــەر(دروودی خــوای لەســەر بــێ) دەســتی کــرد بەبەخــشین لــێی، وەچــەند پیــاوێ لــەقورەیش یــەکی ســەرو ســەد وشــتری دا پێیــان، جــا چــەند کەســێ لــە یاریدەدەران گوتیان: خودا لە پێغەمبەر خۆش بێ دەچێ بەشی قورەیشیەکان دەدات، کە هەتا دوێنێ بێ باوەڕ بوون شەڕیان لەگەڵ ئێمە دەکردو بەرهەڵستی ئیــسلامیان دەکــرد، کەچــی بەشــی ئێمــە نــادات، کەهێــشتا خــوێنی ئەوانــەی کەبەشــیان دەدات، لەشمــشێرەکانمان دەتکــێ‌و، ئــەوان لەچــاو ئێمــەدا دوێنــێ موسوڵمان بوون!! ئیتر بۆ بەشی ئەوان دەدات‌و بەشی ئێمە نادات ؟.

پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) قسەکەیانی بەرگوێ کەوتــەوەو، نــاردی بەشــوێن یاریــدەدەران داو لەخێوەتێــکی چــەرمین دا کۆیکردنــەوە و، کــە کۆبوونەوە خۆیشی چوو بۆ ناویان‌و فەرمووی: (ئــەوە ئــەو قــسەیە چییە کــە لەئێوە وە پێم گەیشتۆتەوە؟!).

پیــاوە زانــاو هۆشمەنــدەکانی یاریــدەدەران -أنــصار- فــەرموویان: ئــەی پێغەمبەری خــودا! پیاوماقوڵەکانمان‌و دنیــا دیــدەکانمان هیــچیان نــەگوتووە، کــە دڵــی تــۆ گــەردی پــێ بگــرێ ئەوەنــدە هەیــە چــەند کەســێکی مێــرد منالْمــان لەهــەرزەکارەکانمان لــەڕووی نــازەوە، گلــەییان کــردووە گوتوویانــە: خــودا لــە پێغەمبەر خۆش بێ دەچێ بەشی نــۆ موســوڵمانەکان لــەتاڵان دەدا کەچــی بەشــی ئێمە نادات، وەلحاڵ ئــەوان لــەم رۆژانــەدا، بــە زەبــری شمــشێری ئێمــە موســوڵمان بوون!

پێغەمبەریش (دروودی خــوای لەســەر بــێ) فەرمووی: (بەڵــێ ئەمــە وایــە وادەبێ کەمن خەڵاتی هەندێ پیاو دەکەم، لەبەر ئەوەی کە نۆ موسوڵمانن‌و تــازە لە کوفرو بێ باوەڕی دابڕاون، چونکە دەمەوێ دڵیان رابگرم‌و دڵنــەواییان بکــەم‌و

هۆگری ئیسلامیان بکەمو بیانلاوێنم، وبەجوانی بیانکەمە خۆم، بەڵام ئەمە مەعنای وانیە کە من باوی ئەوان دەدەم بەسەر ئێوەدا، دەی باشە ئایا ئێوە بەشی خۆتان دەگۆڕنەوە بەبەشی ئەو خەڵکە، دەی پێم بڵێن: ئایا ئێوە بەو بەشە رازی نابن کە خەڵکی ماڵو پڕو پیتی دنیا لەگەڵ خۆیان ببەنەوە و، بەڵام ئێوە لەجیاتی ئەوە پێغەمبەری خودا ببەنەوە لەگەڵ خۆتان بۆ ماڵەوەتان، سابەو خودا گەورەیە، ئەم بەشەی کەئێوە دەیبەنەوە، کە بریتییە لە خۆشەویستیو لێ رازی بوونی خوداو پێغەمبەری خودا، گەلێ گەلێ باشترەو گەورەترە لەوبەشەی کە ئەو خەڵکەی تر دەیبەنەوە کە بریتییە لەپڕوپیتی جیهان!

گوتیان: بەلێ، ئەی پێغەمبەری خودا! رازی دەبینو زیاتریش، فەرمووی: (دەی بزانن کە ئێوە لەپاش من تووشی خۆ خۆییەکی سەخت دەبن هەندێ کەسو هەندێ کار بەدەستو فەرمانڕەوای وا پەیدا دەبن کەهەر بەلای خۆیانا رایدەکێشنو کەسی تریان لەبیر نییە، بەڵام ئێوە خۆتان رابگرنو بەهیچ جۆرێ لایەنی هەقو ئیسلام بەرمەدەن، هەتا دەمرنو لەو دنیا دەچنەوە بەر دیوانی خودا، وەمن خۆم لەسەر حەوزی کەوسەرم چاوەڕوانتان دەکەمو، ئەوانەی کە ئارام دەگرن لەبەر هیچ مەهانەو بیانوویەك لەخەتی ئیسلام لانادەن، خەڵاتو پاداشی باشو گەورە وەردەگرن).

یاریدەدەران -أنصار- یش فەرموویان: ئێمەیش بەڵێنەو دەیدەین صەبرو ئارام دەگرین! (ش) (تاج/٨/ل-١٥٣ز-٦٥ف-١-باسی خەلات کردنی نۆ موسوڵمان).

**راڤەو شیکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەیە: کەهەندێ کاربەدەست لەموسوڵمانان پەیدا دەبن، زۆر خۆپەرستو بەرژەوەند پەرستن، وە خۆخۆییەکی زۆر دەکەن هەتا خۆیانو کەسو کاری خۆیان وەستابێ، کەسی تریان لەبیر نییە، ئەم فەرموودەیە لەوڵاتی ئێمەدا، لەم رۆژگارەی ئێمەدا بەڵگەیە لەسەر ئەم دووشتە:

١- کاربەدەستانی کوردستان نموونەیەکی زیندوون لەم جۆرە کاربەدەستە خۆپەرستە موسوڵمانانە، لە خوا بەزیادبێ هێشتا موسوڵمانن!! لەبەر ئەوە تکایە بوختانی ناموسوڵمانییان بۆ مەکەن.

٢- هەر موسوڵمانێ صەبرو ئارام بگرێ لەسەر ئەم خۆخۆییو خۆپەرستی ئەم زۆربەرێزانە، مژدەی لێ بێ کەلەرۆژی قیامەتدا، لەسەر حەوزی کەوسەر بەخزمەتی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەگا.

لێرەدا بۆ بەراورد لەگەڵ گێڕانەوەکانی بوخاریو موسلیمدا، دەقی وەرگەڕاوی گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیە، لە موختەصەری صەحیحی موسلیمیشەوە راگوێزدەکەین، کە ئاماژەیەکی گەورەی واتیادا، بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم فەرموودەیەو داستانەکەی. (بڕوانە: ژمارە: ٦٣٥).

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: رۆژی غەزای حونەین، کە رەزمگای حونەین رویدا، لەشکری هۆزی هەوازینو سوپای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرامبەری یەکتری راوەستان، هۆزی هەوازینو هۆزی غەطەفانو چەند کۆمەڵێ لەچەند هۆزێکی تر، بەخۆیانوماڵو منداڵو خێزانو ئاژەڵیانەوە هاتبوون بۆ ئەو جەنگە، سوپاکەی پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) بێجگە لەو نۆ موسوڵمانانەی کە لەکاتی گرتنی مەککەدا ئیسلام بوو بوون، دە هەزار کەس بوون، جا لەسەرەتاوە،




لەشکرەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شکستیان هێنا، تەنانەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی بەتەنیا مایەوە، جا لەوکاتەدا، دوو بانگەوازی کرد، لەنێوانیانا، بانگەوازی تری لەکەسی تر نەکرد، بەلای راستیدا ئاوڕی دایەوەو فەرمووی: (ئەی کۆمەڵەی یاریدەدەران! ئەی دەستەی ئەنصار!) ئەنصارەکانیش بەیەك دەنگ وەڵامیان دایەوەو فەرموویان: (ئەی پێغەمەری خودا! ئەمەتاین وایین لەخزمەتتا، فەرموو بفەرموو سەرمان لەڕێتایە!) فەرمووی: ئەوجا ئاوڕی دایەوە بەلای چەپاو دیسان فەرموویەوە: (ئەی کۆمەڵەی یاریدەدەران!) ئەوانیش بەیەك دەنگ فەرموویانەوە: ئەی پێغەمەری خودا! موژدەت لێ بێ واین لەخزمەتتا، سەرمان وا لەڕێتا، فەرموو بفەرموو). پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا ئەوکاتە، بەسواری هێسترێکی سپی بوو، جا لەوڵاخەکەی دابەزی، کەناوی دوڵدوڵ بوو، فەرمووی: (من بەندەو پێغەمبەری خودام‌و، درۆزن‌و جادوو بازنیم‌و، قسەی من وەحیەو راست‌و دروستەو سەرکەوتن هەر بۆ ئێمەیە ئیتر بۆ ورە بەردەدەن‌و نوشوست دەهێنن، ئیتر لەشکری ناموسوڵمانەکان شکاو هەڵیان تۆڕاند، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تالآنییەکی زۆری دەست کەوت، دابەشی کرد بەسەر کۆچکاران‌و ئازادکراوەکانی فەتحی مەککەدا، هیچ بەشی یاریدەدەرانی لەو تالآنییە نەدا، جا یاریدەدەران لەسەر ئەمە گلەییان لە پێغەمبەر کرد وەك ئەوە گوتیان: (ئەگەر تەنگانە بێ ئێمە بانگ دەکرێین، بەڵام تالآن دەدرێ بەکەسانی تر). کە ئەم قسەو باسە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردی بەشوێنیاناو لەناو خێوەتێکی چەرمێندا کۆیکردنەوەو فەرمووی: (ئەی کۆمەڵەی ئەنصار! ئەو قسەیە چییە کە لەئێوەوە پێم گەیشتۆتەوە، گوایە گلەییتان لەمن کردووە؟). ئەوانیش بێ دەنگ بوون، ئەوسا بۆ دڵدانەوەی ئەوان

فەرمووی: (ئەی کۆمەڵەی یاریدەدەران! ئایا بەوە رازی نابن، کە خەڵکی پڕوپیتی جیهان لەگەڵ خۆیان ببەنەوە، بەڵام ئێوە موحەممەدی پێغەمبەری خودا، لەبری بەش، لەگەڵ خۆتان ببەنەوە بۆ ماڵەکانتان لەشاری مەدینە؟). گوتیان: بەڵێ: ئەی پێغەمەری خودا! بەوە رازین. فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەی بزانن ئەگەر خەڵکی تر هەموویان، لەشارێوە بڕۆن، بەڵام ئێوەی یاریدەدەران، لە باریکە رێوە بڕۆن، من لە باریکە رێگەی ئێوەوە دەڕۆمو ئەومندەم خۆش دەوێن لەئێوە جیانابمەوە).

هیشامی کوڕی زەیدی کوڕی ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرموێ: عەرزی ئەنەسی باپیرەمم کرد: ئەی ئەبو حەمزە! ئایا تۆ بۆخۆت ئامادەی ئەم داستانە بووی؟ فەرمووی: (بەڵێ ئەی چۆن لەوێ نەبم؟). بڕوانە ئەم جێگەیانە، بۆ شارەزایی تەواو لە درێژەی باسی ناو ئەم فەرموودەیە: {تاج/٤، زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ٤٥١٧ + زنجیرە: ٤٩، ژمارە: ٤٤٧٠ + زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ٤٥١٨، ٤٥١٩ + زنجیرە: ٩٦، ژمارە: ٤٦٣٤ + تەجرید. ژمارە: ١٢٧٠، ١٢٧١، ١٥٩٥. موسلیم. زکاە: ٢٤٣٣، ٢٤٣٤، ٢٤٣٦، ٢٤٣٧، ٢٤٣٩، ٢٤٤٠، ٢٤٤١، ٢٤٤٢، ٢٤٤٣، ٢٤٤٤}.

٦٣٣- عن أنس بن مالك رَضِيِ اللّٰهُ عَنْهُ عن النبي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: ابن أخت القوم من أنفسهم. (الحديث ٦٧٦٢): [٦٣٣]

خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: خوشکە زای پیاو یەکێکە لە کەسوکارەکەی. (تاجی کوردی/٣ ل/٢٢ ز/٩ ژ/٢ – باسی دانی کەلەپوور بەخاڵوان (ذەویلئەرحام).

لێرەدا ئاوایە، کە لەژمارە (٦٣٤)دا هاتووە، ئەمەیش پوختەی ئەم ژمارەیەیە:

---

[٦٣٣] تجرید/٥، ژمارە: ٢٠٦١ = ٦٧٦٢، مسلم: ١٠٥٩ = ٢٤٣٦ ترقیم مامۆستا خەلیل مأمون شیحا.

ئەنــەس (ڕەزای خــودای لێ بــێ) فــەرمووی: لــەو داســتانەی گلــەیی یاریدەدەران، کە لەژمارە (٦٣٢)دا رابورد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێش ئەوەی کە دەست بکا بە گفتوگۆکەی لەگەڵ یاریدەدەران (ئەنصار)دا، پێی فـەرموون: (کەسـی واتـان تیادایـە کـە لـەئێوە نـەبێ؟) گوتیـان: نـەخێر، تـەنیا خوشکەزایەکی خۆمـان نـەبێو بـەس. پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (خوشـکەزا نـامۆو دەرەکـی نییـە، خوشـکەزای مـرۆڤ یەکێکـە لـە کەسوکارە لەبەرەکانی!).

٦٣٤- عَنْ انَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَـالَ جَمَـعَ النَّبِـيُّ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) نَاسًا مِنْ الانْصار رضيَ الله عنهَمْ فَقَالَ: انَّ قُرَيْشًا حَدِيث عَهْدٍ بِجَاهِلِيَةٍ وَمُصِيبَةٍ وَانِّي ارَدْتُ انْ اجْبُرَهُمْ وَاتَالَّفَهُمْ امَا تَرْضوْنَ انْ يَرْجِعَ النَّاسُ بالدُّنْيَا وَتَرْجِعُونَ بِرَسُـول اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَى بُيُـوتِكُمْ؟ قَـالُوا: بَلَـى قَـالَ: لَـوْ سَـلَكَ النَّـاسُ وَادِيًـا وَسَلَكَتْ الانْصار شِعْبا لَسَلَكْتُ وَادِيَ الانْصار اوْ شِعْبَ الانْصَارِ (الحـديث: ٤٣٣٤، طرفه في: ١٢٧٠ت = ٣١٤٦ ف = بەرگی٣/ تەجریدی صـەریح =موختەصـەری صەحیحی بوخاری، لاپەڕە: ٣٩٤) + (ژمارە: ١٢٧١ تجريد): [٦٣٤]

ئەنەسی کوڕی مالیـك (ڕەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: ڕۆژی غـەزای حونەین، کە خودا مـاڵێکی بـێ ئـارەقی مفتـی ڕەخـساند بـۆ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لــێ بــێ) لـەو ماڵـەی کـە لـەهۆزی هـەوازین بـەتالانی گـیرا، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لــێ بــێ) دەسـتی کـرد بـە بەخـشین لێـی، وەچـەند پیـاوێ لـە قوڕەیش، یـەکی سـەرو سـەد و شـتری دا پێیـان، جاچـەند کەسـێ لەیاریـدەدەران (لەئەنصار) گوتیان: خودا لە پێغەمبەر خۆش بێ، دەچێ بەشی قوڕەیشییەکان دەدات کەهەتا دوێنێ بێ بـاوەڕ بـوون و بەرهەڵستی ئیسلامیان دەکـرد، کەچی

---

[٦٣٤] تجريد/٤، ژمارە: ١٥٩٤ = ٤٣٢٨، ١٨٨، ١٩٦، مسلم: ٢٤٣٧ شيحا.

بەشی ئێمە مانان نادات، کە هێشتا خوێنی شەڕی کاتی بێباوەڕی ئەوان لە شمشێرەکانمان دەتکێ و ئەوان لە چاو ئێمەدا دوێنێ موسوڵمان بوون، ئیتر بۆ بەشی ئەوان دەدا وبەشی ئێمە نادات!؟

پێغەمبەریش (دروودی خودای لێ بێ) قسەکەیانی بەرگوێ کەوتەوەو ناردی بەشوێن یاریدەدەران داو، لە خێوەتێکی چەرمین دا کۆیکردنەوەو کە کۆ بوونەوە خۆشی تەشریفی چوو بۆ ناویان و فەرمووی: (کەسێکی واتان تیادایە کە لە خۆتان نەبێ؟). گوتیان: نەخەیر، مەگەر خۆشکەزای خۆمانمان لەناو دابێ، فەرمووی: (خۆشکەزای عەشرەت یەکێکە لەخۆیان).

ئەوجا فەرمووی (هەموو دەزانین کەهۆزی قوڕەیش هەم نۆ موسوڵمانن و هەم تازە کۆست کەووتوون، جابۆیە منیش دەمەوێ تۆڵەیان بۆ بکەمەوە و دڵنەوایی یان بکەم، باشە ئەدیی ئێوە بەوە ڕازی نابن کە خەڵکی تر دینارو درەم و مەڕو مالات لەگەڵ خۆیان ببەنەوە بۆماڵەوەیان، کەئەمانە مایەی خۆشی ئەم جیهانە بێ بەقایەن، بەڵام ئێوە لەباتی ئەو پڕو پیتی دنیایە کە ئەوان دەیبەنەوە، پێغەمبەری خودا لەگەڵ خۆتان ببەنەوە بۆماڵەوەتان و ئەو لەخۆتان ڕازی بکەن، کە ڕەزای ئەو مایەی بەختەوەری هەردوو ژیانە! بزانن ئەگەر خەڵکی تر هەموویان لە شاڕێگەکانەوە بڕۆن، بەڵام ئێوەی ئەنصار لە بارێکە ڕێگەیەکەوە بڕۆن، من لەگەڵ ئەو خەڵکە ناڕۆم بەڵام لەگەڵ ئێوە دەڕۆم، خەیاڵ نەکەن و دڵ لەدڵ مەدەن، ژینم ژێنی ئێوەیە، مردنم مردنی ئێوەیە، هاوژینیی ئێوە بەکەسی ترنادەم) (تاج/ ٨ ل/١٥٦ ف/٢+ ١ ز/٦٥- باسی: خەلاتکردنی نۆ موسوڵمان). {بڕوانە: ژمارە: ٦٣٢ کە ئەم داستانە لەوێدا بەتێرو تەسەلی رابورد}.

٦٣٥- عَنْ أَنَسٍ – رضى الله عنه – قَالَ لَمَّا كَانَ يَوْمَ حُنَيْنٍ الْتَقَى هَوَازِنُ وَمَعَ النَّبِيِّ – صلى الله عليه وسلم – عَشَرَةُ آلاَفٍ وَالطُّلَقَاءُ فَأَدْبَرُوا قَالَ « يَا مَعْشَرَ الأَنْصَارِ » . قَالُوا لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ ، لَبَّيْكَ نَحْنُ بَيْنَ يَدَيْكَ ، فَنَزَلَ النَّبِىُّ – صلى الله عليه وسلم – فَقَالَ « أَنَا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ » . فَانْهَزَمَ الْمُشْرِكُونَ ، فَأَعْطَى الطُّلَقَاءَ وَالْمُهَاجِرِينَ وَلَمْ يُعْطِ الأَنْصَارَ شَيْئًا فَقَالُوا ، فَدَعَاهُمْ فَأَدْخَلَهُمْ فِى قُبَّةٍ فَقَالَ « أَمَا تَرْضَوْنَ أَنْ يَذْهَبَ النَّاسُ بِالشَّاةِ وَالْبَعِيرِ ، وَتَذْهَبُونَ بِرَسُولِ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – » ، فَقَالَ النَّبِىُّ – صلى الله عليه وسلم – « لَوْ سَلَكَ النَّاسُ وَادِيًا وَسَلَكَتِ الأَنْصَارُ شِعْبًا لاَخْتَرْتُ شِعْبَ الأَنْصَارِ»: [٦٣٥]

**وەرگەڕاوی ئەم ژمارەیە لە فەرموودەی ژمارە (٦٣٢)دا بەتەواوی ڕۆیشت.**

٦٣٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَاصِمٍ قَالَ : لَمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ يَوْمَ حُنَيْنٍ مَا أَفَاءَ قَسَمَ فِى النَّاسِ فِى الْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَلَمْ يَقْسِمْ أَوْ لَمْ يُعْطِ الأَنْصَارَ شَيْئًا فَكَأَنَّهُ وَجَدَ إِذْ لَمْ يُصِبْهُمْ مَا أَصَابَ أَوْ كَأَنَّهُمْ وَجَدُوا إِذْ لَمْ يُصِبْهُمْ مَا أَصَابَ النَّاسَ فَخَطَبَهُمْ فَقَالَ :« يَا مَعْشَرَ الأَنْصَارِ أَلَمْ أَجِدْكُمْ ضُلاَّلاً فَهَدَاكُمُ اللَّهُ بِى وَكُنْتُمْ مُتَفَرِّقِينَ فَأَلَّفَكُمُ اللَّهُ بِى وَعَالَةً فَأَغْنَاكُمُ اللَّهُ بِى ». قَالَ كُلَّمَا قَالَ شَيْئًا قَالُوا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمَنُّ قَالَ :« مَا يَمْنَعُكُمْ أَنْ تُجِيبُوا ». قَالُوا : اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمَنُّ قَالَ :« لَوْ شِئْتُمْ قُلْتُمْ جِئْتَنَا كَذَا وَكَذَا أَلاَ تَرْضَوْنَ أَنْ يَذْهَبَ النَّاسُ بِالشَّاةِ وَالْبَعِيرِ وَتَذْهَبُونَ بِرَسُولِ اللَّهِ إِلَى رِحَالِكُمْ لَوْلاَ الْهِجْرَةُ لَكُنْتُ امْرَأً مِنَ الأَنْصَارِ وَلَوْ سَلَكَ النَّاسُ وَادِيًا أَوْ شِعْبًا لَسَلَكْتُ وَادِىَ الأَنْصَارِ وَشِعْبَهَا الأَنْصَارُ شِعَارٌ وَالنَّاسُ دِثَارٌ إِنَّكُمْ سَتَلْقَوْنَ بَعْدِى أَثَرَةً فَاصْبِرُوا حَتَّى تَلْقَوْنِى عَلَى الْحَوْضِ»: [٦٣٦]

---

[٦٣٥] تجريد/٢، ژمارە: ١٢٧١ = ٣١٧١ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥١٢.

[٦٣٦] بخاری، مغازی: ٤٣٣٠، مسلم: ٢٤٤٣ شيحا.

ئەمە دەقی وەرگەڕاوی ژمارە (٢٤٤٣)یە لە صەحیحی موسلیمدا، بەپێی تەرقیمو ژمارە بۆ دانانی مامۆستا (شێخ خلیل مەئموون شیحا):

عەبدوڵلای کوڕی زەید (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ غەزای حونەین تەواوبوو، دەسکەوتی جەنگی زۆری دابەش کرد، بەشی نۆ موسوڵمانەکانی بەتێرو تەسەلی دا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستیەوە کە هاوەڵان، کە لەزمانی سوننەتدا ناسراون بە ئەنصار، لەم لایەنەوە گلەیی‌یان هەیە، وەك لەژمارەکانی پێشەوە شێوەی گلەییەکەیان روونکراوەتەوە، وە یاریدەدەرانیش حەزیان لەوەبووە، کە ئەوانیش وەك ئەو خەڵکەی تر لەو دەستکەوتە بەشیان پێ بدرێ.

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆیکردنەوەو هەڵسایەوە وتارێکی دا بۆیان، سوپاسو ستایشی جوانی خودای گەورەی کردو ئەوجا فەرمووی: (ئەی کۆمەڵەی یاریدەدەران، ئەی دەستەی ئەنصار! ئەرێ کاتێ من کۆچم کرد بۆ ناوتانو لە مەککەوە هاتم بۆ ناو ئێوە، ئێوە سەرلێشێواوو گومڕا نەبوونو خودای گەورە بەهۆی منەوە لەو سەرلێشێواویو گومڕاییە رزگاری نەکردنو هیدایەتی نەدان؟ دیارە کە ئەمە شتێکی حاشا هەڵنەگرەو وەهایە، وە ئێوە هەژارو نەدارا بوونو خودا بەهۆی منەوە داراو دەوڵەمەندی کردن، وە پرژو بڵاوو پەرتو پارچە پارچە بوون، خودا بەهۆی منەوە کردنی بەیەكو کۆیکردنەوە).

یاریدەدەرانیش هەموو جارێ، ئاوا وەڵامی پێغەمبەریان دەدایەوە: چی دەفەرمووی وایە، منەتو نازو بەهرەی خودا بەهۆی پیرۆزی ئایینی ئیسلامەوە لەسەر ئێمە گەلێ گەلێ زۆرو گەورەیە.

ئەوجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێیان: (ئەوە بۆ ئێومیش وەڵامی من نادەنەوە، چاکەی ئێومیش بەسەر منەوە چییە بیڵێن؟) هاوەڵانیش دەیانفەرموو: چاکەی خوداو پێغەمبەری خودا لەژمارە نایەت. ئەوجا پێغەمبەر خۆی لەسەر زمانی ئەوان وەڵامی خۆی دایەوەو فەرمووی: (بێگومان ئەگەر ئێوە وەڵامی من بدەنەوەو بڵێن: تۆ دەربەدەر بوویتو ئێمە پەنامان دایت، تۆ بێ لانە بوویتو ئێمە جێگەو ڕێگەمان بۆ ئامادە کردیت. ئەوجا فەرمووی: (ئایا ئێوە بەوە ڕازی دەبن کە ئەو خەڵکە بزنو مەڕو گاو گۆتاڵو وشترو ئاژەڵ لەباتی بەش ببەنو ئێومیش لەباتی بەش پێغەمبەر لەگەڵ خۆتان ببنەوە بۆ ماڵەکانتان بۆ مەدینەی نازدار؟ ئێوەی ئەنصار ژێر بەرگنو نزیکترین کەسن لەمنەوە، هەم بەجەستەو هەم بەگیان، ئەو خەڵکەی تریش سەربەرگنو لەچاو ئێوەدا دوورنو کەم نزیکن).

ئەوجا فەرمووی: (لەبەر ئەوە نەبێ کە بەپێی قورئان من کۆچکارمو کەسێکم لە کۆچکاران، دەنا دەبووم بەیەکێ لەئێوەی ئەنصار! دەی بزانن ئەگەر خەڵکی تر هەموویان لە شارێوە بڕۆن، بەڵام ئێوەی یاریدەدەران، لە باریکە ڕێگەو ڕێچکەو توولە ڕێگەوە بڕۆن، من لەباریکە ڕێگەی ئێوەوە دەڕۆمو ئەومندەم خۆش دەوێن، من هەرگیز لەئێوە جیانابمەوە، دڵنیابن کە لەپاش خۆم تووشی خۆپەرستیو خۆمانە خۆمانە دەبن، بەڵام ئارام بگرنو ئاژاوە بەرپا مەکەن، تا لەسەر حەوزی کەوسەر لەبەهەشتی بەریندا دەگەنەوە بەخۆمو لەو شوێنە پیرۆزەدا دێن بۆ لام بۆ نۆشکردنی ئاوە پیرۆزەکەی).

٦٣٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ حُنَيْنٍ آثَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أُنَاسًا فِي الْقِسْمَةِ فَأَعْطَى الأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ مِائَةً مِنْ الإِبِلِ وَأَعْطَى عُيَيْنَةَ مِثْلَ ذَلِكَ وَأَعْطَى أُنَاسًا مِنْ أَشْرَافِ الْعَرَبِ فَآثَرَهُمْ يَوْمَئِذٍ فِي الْقِسْمَةِ قَالَ رَجُلٌ وَاللَّهِ إِنَّ

هَذِهِ الْقِسْمَةَ مَا عُدِلَ فِيهَا وَمَا أُرِيدَ بِهَا وَجْهُ اللَّهِ، فَقُلْتُ: وَاللَّهِ لأُخْبِرَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَتَيْتُهُ فَأَخْبَرْتُهُ فَقَالَ: (فَمَنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ يَعْدِلْ اللَّهُ وَرَسُولُهُ رَحِمَ اللَّهُ مُوسَى قَدْ أُوذِيَ بِأَكْثَرَ مِنْ هَذَا فَصَبَرَ) (الحديث ٣١٥٠، أطرافُهُ في: ٣٤٠٥، ٤٣٣٥، ٤٣٣٦، ٦٠٥٩، ٦١٠٠، ٦٢٩١، ٦٣٣٦):[٦٣٧]

عەبدوڵلای کوڕی مەسعود(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کەرۆژی غەزای حونەین رووی دا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەماڵی تالآنی جەنگ، بەشی چەند کەسێکی زیاتر دا، سەد وشتری دا بە ئەقرەعی کوڕی حابیس سەدیشی دا بەعویەینە و، بەشی چەند کەسێکی تریشی لەخانەدانەکانی عەرەب بەم شێوەیە دا، لەو رۆژەدا ئەوانەی لەبەش پێداندا جیاکردەوەو بەشی زۆر باشی پێدان! پیاوێکیش گوتی: خودایە! ئەم بەشکردنە نە بەهەقو عەدالەت بوو، وەنە بۆ رەزای خودا بوو، گوتی: منیش گوتم: بەخودا دەبێ بیگێڕمەوە بۆ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ).

جا چووم بۆ خزمەتیو قسەی کابرام بۆ گێڕایەوە بۆی، رەنگی حەزرەت وەك خوێن سوور داگیرسا لەپاشا فەرمووی: (ئەگەر خوداو پێغەمبەری خودا شت بەهەقو دادپەروەری نەکەن، ئەی کێی تر ئەوە دەکا؟!). دوایی فەرمووی: (رەحمەتی خودا لە پێغەمبەر مووسا، لەلایەنی گەلەکەیەوە لەمەیش زیاتر ئازار دەدرا، بەڵام ددانی بەخۆدا گرت، کەواتە شتی وا، صەبر لەسەر ئازاری نەفامانو إعراضو چاوپۆشی لەهەڵەیان رەفتاری پێغەمبەرانە، منیش پابەندی ئەمە دەبم).

---

[٦٣٧] تجرید/٣، ژمارە: ١٣٧٤ - ٣١٥٠، مسلم: ١٠٦٢ = ٢٤٤٤.

ئەنەس فەرمووی: منیش لەدڵی خۆما گوتم: وای لێ هات! کەواتە هەتا هەتایە دوای ئەم جارە هیچ قسەیەکی لەم بابەتەی بۆ نابەمەوە! (تاج/٨ل-١٥٦ز-٦٥- خەڵاتکردنی نۆ موسوڵمان).

## (٤٧) باب: ذكر الخوارج وصفاتهم
## باسی خەواریجەکان لەگەڵ نیشانەیان

٦٣٨- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) قَالَ بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْسِمُ غَنِيمَةً بِالْجِعْرَانَةِ إِذْ قَالَ لَهُ رَجُلٌ اعْدِلْ فَقَالَ: لَهُ لَقَدْ شَقِيتُ إِنْ لَمْ أَعْدِلْ) (الحديث ٣١٣٨):[٦٣٨]

جابیری کوڕی عەبدوڵلا(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەجەعرانە تالانی دابەش دەکرد بەسەر یارانیدا، لەپاش غەزای هەوازین، لەو دەمەدا پیاوێ کەناوی ذولخوەیصەرەی تەمیمی بوو، پێی گوت: شتەکە بەعەدالەت دابەشکە! پێغەمبەریش پێی فەرموو: (بەدبەخت خۆم ئەگەر عادڵو دادپەروەر نەبم!). (بڕوانە: ژمارە: ١١٨٣ تجريد = ٢٨٦٤ بوخاری + ژمارە: ١٠١٥ تجريد = ٢٣٠٧ بوخاری).

٦٣٩- عَنْ أَبِی سَعِيدٍ الْخُدْرِیِّ (رضی الله عنه)، قَالَ: بَعَثَ عَلِیُّ بْنُ أَبِی طَالِبٍ (رضی الله عنهما) إِلَی رَسُولِ اللَّهِ مِنَ الْيَمَنِ بِذَهَبَةٍ فِی أَدِيمٍ مَقْرُوظٍ، لَمْ تُحَصَّلْ مِنْ تُرَابِهَا، قَالَ: فَقَسَمَهَا بَيْنَ أَرْبَعَةِ نَفَرٍ بَيْنَ عُيَيْنَةَ بْنِ حِصْنٍ، وَالأَقْرَعِ بْنِ حَابِسٍ، وَزَيْدِ الْخَيْلِ وَالرَّابِعُ إِمَّا عَلْقَمَةُ بْنُ عُلاَثَةَ، وَإِمَّا عَامِرُ بْنُ الطُّفَيْلِ، فَقَالَ: رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ: كُنَّا نَحْنُ أَحَقَّ بِهَذَا مِنْ هَؤُلاَءِ، قَالَ: فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِیَّ (صلی الله عليه وسلم)، فَقَالَ: «أَلاَ تَأْمَنُونِی وَأَنَا أَمِينُ مَنْ فِی السَّمَاءِ، يَأْتِينِی خَبَرُ السَّمَاءِ صَبَاحًا وَمَسَاءً؟!».

---

[٦٣٨] تەجرید/٢، ژمارە: ١٢٦٧ = ٣١٣٨، مسلم: ١٠٦٣ = ٢٤٤٧ شیحا.

قَالَ: فَقَامَ رَجُلٌ غَائِرُ الْعَيْنَيْنِ، مُشْرِفُ الْـوَجْنَتَيْنِ، نَاشِـزُ الْجَبْهَـةِ، كَـثُّ اللِّحْيَـةِ، مَحْلُوقُ الرَّأْسِ، مُشَمَّرُ الإِزَارِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اتَّقِ اللَّهَ! فَقَالَ: « وَيْلَكَ أَوَلَسْتُ أَحَـقَّ أَهْلِ الأَرْضِ أَنْ يَتَّقِيَ اللَّهَ؟ ». قَالَ: ثُمَّ وَلَّى الرَّجُلُ، فَقَالَ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ: يَا رَسُـولَ اللَّـهِ أَلاَ أَضْرِبُ عُنُقَهُ؟ فَقَالَ: « لاَ، لَعَلَّهُ أَنْ يَكُونَ يُصَلِّي ». قَالَ خَالِدٌ: وَكَمْ مِنْ مُصَلٍّ يَقُولُ بِلِسَانِهِ مَا لَيْسَ فِي قَلْبِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنِّي لَـمْ أُومَـرْ أَنْ أَنْقُبَ عَنْ قُلُوبِ النَّاسِ، وَلاَ أَشُقَّ بُطُونَهُمْ». قَالَ: ثُمَّ نَظَرَ إِلَيْهِ وَهُـوَ مُقَـفٍّ فَقَـالَ: « إِنَّـهُ يَخْرُجُ مِنْ ضِئْضِئِ هَذَا قَوْمٌ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ رَطْبًا، لاَ يُجَاوِزُ حَنَـاجِرَهُمْ، يَمْرُقُـونَ مِـنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ). قَـالَ: أَظُـنُّ قَـالَ: «لَـئِنْ أَدْرَكْـتُهُمْ لأَقْتُلَـنَّهُمْ قَتْـلَ ثَمُودَ ». {الحديث: ٢٤٤٩. زكاة = ٢٤٢٧ فتح الملهم. تجريد/٤، لاپـەڕە: ٣٥٠، رقـم: ١٦٠٢ = ٤٣٥١، ٣٣٤٤، ٣٦١٠، ٤٦٦٧، ٥٠٥٨، ٦١٦٣، ٦٩٣١، ٦٩٣٣، ٧٤٣٣، ٧٥٦٢. أبـو داود. سـنة: ٤٧٦٤. نـسائي. زكـاة: ٢٥٧٧، ٢١١٢. تحفـة الأشـراف: ٤١٣٢}:[٦٣٩]

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئیمامی عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) لە یەمەنەوە، پارچۆڵەیێ زێڕی پوختە نەکراوی، لەماڵی تالآنی جەنگ، نارد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زێڕەکە لەپارچە قایشێکا بوو، بەگەڵا سەلەم (قورظ) خۆشە کرابوو، هێشتا خاك‌و خۆڵی ناو کانەکەی پێوە بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دابەشی کرد بەسەر ئەم چوار کەسەدا: بەسەر عویەینەی کوڕی حیصنی کوڕی حوزەیفەی کوڕی بەدرو بەسەر ئەقرەعی کوڕی حابیس‌و زەیدی خەیلداو، چوارەمیشیان یا عەلقەمەی کوڕی عولاسە بوو، یا عامیری کوڕی توفەیل بوو. پیاوێ لە یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئێمە شایستەتر بووین بەم

---

[٦٣٩] تجرید/٤، زمارە: ١٦٠٤ = ٤٣٥١، مختصر صحیح مسلم/٢، زمارە: ٥١٤ = ٢٤٤٩ شیحا.

ماڵو سامانی تاڵانییه، که پێغهمبهر (دروودی خودای لهسهر بێ) دابهشی کرد بهسهر ئهمانهدا!! جا ئهم قسهیه گهیشتهوه به پێغهمبهر (دروودی خودای لهسهر بێ) فهرمووی: (من که ئهمینداری خودای ئهرزو ئاسمانمو ئێوارهو بهیانی له ئاسمانهوه وهحیو سرووشم بۆدێ، کهچی هێشتا ئێوه متمانهم پێ ناکهنو، ئهوهتانێ ههندێکتان بهقای پێم نییهو رهخنهم لێ دهگرێ!).

فهرمووی: جا کابرایهکی چاو بهقووڵا چووی، سهر کوڵم دهرپهڕیوی، گۆنا زهقی، ناوچاوان قۆقزی، ریش پڕی، سهرتاشراوی، چاك بهلادا کردوو، پیاوێکی لهم حاڵهو لهم رهنگه، ههڵسا گوتی: ئهی پێغهمبهری خودا! لهخودا بترسهو شهرمو شکۆیێ لهخودا بکه!!

حهزرهت (دروودی خودای لهسهر بێ) فهرمووی: (بهدبهخت خۆت! ئهی خانه خراپ! بۆچی کهس ههیه لهسهر رووی زهوی، که وهك من لهخودا بترسێو، ئهوهندهی من شهرمو شکۆ لهخودا بکات!. گوتی: ئهوجا کابراکه رۆیشت، خالیدی کوڕی وهلیدیش فهرمووی: ئهی پێغهمبهری خودا! بۆچی نهدهم له گهردنی؟ فهرمووی: (نا، شتی وا مهکه، بهشکم نوێژکهر بێ). خالید فهرمووی: زۆر نوێژکهری وا ههیه، زمانو دڵی یهك نینو، سهری زمانی شیرینهو بنی زمانی ژههرینه. پێغهمبهریش (دروودی خودای لهسهر بێ) فهرمووی: (من خودا پێی نهفهرمووم، کهناو دڵی خهڵك بپشکنم، یاناو سکیان ههڵ بدڕم!).

گوتی: کهکاتێ پیاوهکه پشتی ههڵکردو رۆیشت، پێغهمبهر (دروودی خودای لهسهر بێ) فهرمووی: (لهنهوهی ئهم پیاوه هۆزێ دهکهونهوه، به زمانی پاراو، نامهی خودا، قورئانی پیرۆز، دهوردهکهنهوه، بهڵام له گهروویان رهت نابێو ناچێته ناو دڵیانهوه، ئهوانه وا لهئایین بهلهسه دهبن، وا لهئایینی ئیسلام

بەپەلە دەردەچن‌و تەرا دەبن، وەك چۆن تیری کەبدا لە نێچیری، خێرا گورج دەیسمی‌و لێی دەردەپەڕی، ئەوانیش ئاوا لە ئیسلام دەردەچن‌و تەرادەبن!).

فەرمووده گێڕەوە (ڕاوی) دەفەرموێ: وادەزانم حەزرەت (درووردی خودای لەسەر بێ) فەرمووشی: (ئەگەر خۆم فریای ئەو هۆزەو وەچەیە بکەوم، لەچەرخی مندا، کەسانێ لەوانە، پەیدا ببن،، وەك چۆن خودا یافتی هۆزی ئەموودی بڕییەوە، منیش ئاوا، یافتی ئەوان دەبڕمەوە، هەموویان دەکوژم تاقیان لێ نابوێرم!). {بڕوانە: تاج/٤، لاپەڕە: ٨٤٨، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٤٦٤٩}.

٦٤٠- قَالَ سَمِعْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ يَقُولُ بَعَثَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ - رضى الله عنه - إِلَى رَسُولِ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - مِنَ الْيَمَنِ بِذُهَيْبَةٍ فِي أَدِيمٍ مَقْرُوظٍ لَمْ تُحَصَّلْ مِنْ تُرَابِهَا ، قَالَ فَقَسَمَهَا بَيْنَ أَرْبَعَةِ نَفَرٍ بَيْنَ عُيَيْنَةَ بْنِ بَدْرٍ ، وَأَقْرَعَ بْنِ حَابِسٍ وَزَيْدِ الْخَيْلِ ، وَالرَّابِعُ إِمَّا عَلْقَمَةُ وَإِمَّا عَامِرُ بْنُ الطُّفَيْلِ ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ كُنَّا نَحْنُ أَحَقَّ بِهَذَا مِنْ هَؤُلاَءِ . قَالَ فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ - صلى الله عليه وسلم - فَقَالَ « أَلاَ تَأْمَنُونِي وَأَنَا أَمِينُ مَنْ فِي السَّمَاءِ ، يَأْتِينِي خَبَرُ السَّمَاءِ صَبَاحًا وَمَسَاءً » . قَالَ فَقَامَ رَجُلٌ غَائِرُ الْعَيْنَيْنِ ، مُشْرِفُ الْوَجْنَتَيْنِ ، نَاشِزُ الْجَبْهَةِ ، كَثُّ اللِّحْيَةِ ، مَحْلُوقُ الرَّأْسِ ، مُشَمَّرُ الإِزَارِ ، فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ، اتَّقِ اللَّهَ . قَالَ « وَيْلَكَ أَوَلَسْتُ أَحَقَّ أَهْلِ الأَرْضِ أَنْ يَتَّقِيَ اللَّهَ » . قَالَ ثُمَّ وَلَّى الرَّجُلُ ، قَالَ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ يَا رَسُولَ اللَّهِ ، أَلاَ أَضْرِبُ عُنُقَهُ قَالَ « لاَ ، لَعَلَّهُ أَنْ يَكُونَ يُصَلِّي » . فَقَالَ خَالِدٌ وَكَمْ مِنْ مُصَلٍّ يَقُولُ بِلِسَانِهِ مَا لَيْسَ فِي قَلْبِهِ . قَالَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - « إِنِّي لَمْ أُومَرْ أَنْ أَنْقُبَ قُلُوبَ النَّاسِ ، وَلاَ أَشُقَّ بُطُونَهُمْ » قَالَ ثُمَّ نَظَرَ إِلَيْهِ وَهْوَ مُقَفٍّ فَقَالَ «إِنَّهُ يَخْرُجُ مِنْ ضِئْضِئِ هَذَا قَوْمٌ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ رَطْبًا ، لاَ يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ ،

يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ » . وَأَظُنُّهُ قَالَ « لَئِنْ أَدْرَكْتُهُمْ لأَقْتُلَنَّهُمْ قَتْلَ ثَمُودَ»:[٦٤٠]

**ئەمە دەقی ژمارە (٦٣٩)یە، هەردوو فەرموودەكە یەك بابەتن.**

٦٤١- عَنْ ابِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (يَخْرُجُ فِيكُمْ قَوْمٌ تَحْقِرُونَ صَلاتَكُمْ مَعَ صَلاتِهِمْ وَصِيَامَكُمْ مَعَ صِيَامِهِمْ وَعَمَلَكُمْ مَعَ عَمَلِهِمْ وَيَقْرَءونَ الْقُرْآنَ لا يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ يَمْرُقُونَ مِنْ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنْ الرَّمِيَةِ يَنْظرُ فِي النَّصْلِ فَلا يَرَى شَيْئًا وَيَنْظرُ فِي الْقِدْحِ فَلا يَرَى شَيْئًا وَيَنْظرُ فِي الرِّيشِ فَلا يَرَى شَيْئًا وَيَتَمَارَى فِي الْفُوقِ). (الحديث ٥٠٥٨- اطرافه فى : ٣٣٤٤، ٤٣٥١، ٤٦٦٧، ٦١٦٣، ٦٩٣١، ٦٩٣٣، ٧٤٣٢، ٧٥٦٢ ) ( بڕوانە : ژ: ١٦٠٢ تەجرید بەرگی چوارەم )؛ [٦٤١]

**ئـەبو سـەعیدی خـودری (ڕەزای خـودای لـێ بـێ)لـە پێغەمبـەری ئـازیزو خۆشەویـستەوە (دروودی خـودای لـێ بـێ) وە ڕەحمـەت و بـەرەكاتی خـودای گەورەی لێ بێو، سەرو ماڵ و مناڵ و هەسـتو نەسـت بـە قوربـانی گـەردی سـەر گۆڕی پیرۆزی بێت، دەفەرموێ: (هۆزێ لـە ناوتانـا پەیـدا دەبـن، نوێـژو ڕۆژوو و كردەوەی خۆتان لەچاو هی ئەواندا بەهیچ دادەنێن، بەڵام ئەو هـۆزە كـە قورئـان دەخوێنن لە گەرویان ڕەت نابێ و سەر زارەكی دەیخوێنن و ناچێتە ناو دڵیان..**

**ئەوانە وا لە دین یاخی و بەلەسە دەبـن و لـە ئـایین دەردەچـن وەك تـیرێ بدا لە نێچیرێ و گورج بیسمێ و بە بێ ئەوە كە شتێ لە نێچیرەكە لەگـەڵ خـۆی بەرێ لێی دەرچێ، ئەمانیش ئاوا بەبێ ئەوەی شتێ لە شوێنەواری دینیـان پێـوە بمێنێ لێی دەر دەچن، جا تیر هاوێژەكە سـەیری پەیكانەكـە دەكـا هـیچ خـوێن و**

---

[٦٤٠] بڕوانە ژمارە: (٦٣٩).

[٦٤١] تجرید/٤، ژمارە: ١٧٤٠ - ٥٠٥٨، مسلم: ١٠٦٤ - ٢٤٥١ هەتا ٢٤٥٢.

ئەسەری پێکانی پێوە نابینێ، تەماشای کلکی تیرەکە دەکا هەروا هیچی پێوە نابینێ سەیری پەڕەی تیرە کە دەکا هیچی پێوە نابینێ، لە لەلەی شوێنی ژێی کەوانەکەیشا بەشکە، کە خوێن و شوێنەواری نێچیرەکەی پێوەیە یا نا.

واتە : چۆن ئەو تیرە ئەوەندە خێرا نێچیرەکە دەسمێ و لێی دەردەچێ و لەکاتی سمین و لێ دەرچوونەکەدا لەبەر خێرایی خۆی هیچ لە نێچیرەکە لەگەڵ خۆی نابات، ئەم هۆزەیش ئاوا فریان بەسەر ئایین دارییەوە نامێنێ ). (تاج/٥ ل —٢٨٧ ز: ٧٨ ژ: ٨- ش/ د/ ت = شەیخان ئەبوداوودو ترمزی (رەحمەتی خودای لێ بێ)).

٦٤٢- أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ – رضى الله عنه – قَالَ بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – وَهْوَ يَقْسِمُ قَسْمًا أَتَاهُ ذُو الْخُوَيْصِرَةِ – وَهْوَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ – فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ اعْدِلْ . فَقَالَ « وَيْلَكَ ، وَمَنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ أَعْدِلْ قَدْ خِبْتَ وَخَسِرْتَ إِنْ لَمْ أَكُنْ أَعْدِلُ » . فَقَالَ عُمَرُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ائْذَنْ لِي فِيهِ ، فَأَضْرِبَ عُنُقَهُ . فَقَالَ « دَعْهُ فَإِنَّ لَهُ أَصْحَابًا ، يَحْقِرُ أَحَدُكُمْ صَلاَتَهُ مَعَ صَلاَتِهِمْ وَصِيَامَهُ مَعَ صِيَامِهِمْ ، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ ، يُنْظَرُ إِلَى نَصْلِهِ فَلاَ يُوجَدُ فِيهِ شَىْءٌ ، ثُمَّ يُنْظَرُ إِلَى رِصَافِهِ فَمَا يُوجَدُ فِيهِ شَىْءٌ ، ثُمَّ يُنْظَرُ إِلَى نَضِيِّهِ – وَهْوَ قِدْحُهُ – فَلاَ يُوجَدُ فِيهِ شَىْءٌ ، ثُمَّ يُنْظَرُ إِلَى قُذَذِهِ فَلاَ يُوجَدُ فِيهِ شَىْءٌ ، قَدْ سَبَقَ الْفَرْثَ وَالدَّمَ ، آيَتُهُمْ رَجُلٌ أَسْوَدُ إِحْدَى عَضُدَيْهِ مِثْلُ ثَدْىِ الْمَرْأَةِ ، أَوْ مِثْلُ الْبَضْعَةِ تَدَرْدَرُ وَيَخْرُجُونَ عَلَى حِينِ فُرْقَةٍ مِنَ النَّاسِ » . قَالَ أَبُو سَعِيدٍ فَأَشْهَدُ أَنِّى سَمِعْتُ هَذَا الْحَدِيثَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – ، وَأَشْهَدُ أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِى طَالِبٍ قَاتَلَهُمْ وَأَنَا مَعَهُ ، فَأَمَرَ بِذَلِكَ الرَّجُلِ ، فَالْتُمِسَ فَأُتِيَ بِهِ حَتَّى نَظَرْتُ إِلَيْهِ عَلَى نَعْتِ النَّبِيِّ – صلى الله عليه وسلم – الَّذِى نَعَتَهُ.[٦٤٢]

---

[٦٤٢] بخاری: ٣٦١٠، مسلم: ٢٤٥٣ شيحا.

ئـەبو سـەعیدی خـودری (رەزای خـودای لیٚ بـێ) فـەرمووی: جاریٚ ئێمـە لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) خـەریك بـوو دەسـتكەوتێكی جـەنگی دابـەش دەكـرد، لەوكاتـەدا پیـاوێكی بـەنی تـەمیمی هات، ناوی ذولخووەیصیرە بوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! دادپەروەرانـە ئـەم دەستكەوتە دابەش بكە!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (خانە خراپ، ئەگـەر من دادپەروەر نەبم ئـەی كـێ دادپـەروەرە؟ بەڕاسـتی نائومێـدو زیانەوەمەنـد مـن دەبم ئەگەر دادپەروەر نەبم!).

عومــەر فــەرمووی: ئــەی پێغەمبــەری خــودا! مۆڵــەتم بــدە بــا بــدەم لەگـەردنی؟ فـەرمووی: (وازی لیٚ بهێنـە، ئەمـە كۆمـەڵیٚ هـاوەڵی وای هەیـە، بـۆ نوێژو ڕۆژوو، ئێوە بەقولیانا ناگەن، قورئان دەخوێنن لەگـەروویان رەت نابـێ، وا خێرا لەئایین دەردەچن، وەك تیر چۆن كـە لەنەچیر دەدا گـورج لێـی دەردەچیٚ ئاوا، بە رەنگێكی وا خێرا لە ئیسلامەتی دەردەپەڕن‌و فڕیان پێوەی نامێنێ، وەك ئـەوە تیرهاوێژەكـە سـەیری پەیكانەكـە دەكـا هـیچ خـوێن‌و ئەسـەرو شـوێنەواری پێكـانی پێـوە نابینـێ، تەماشـای كـووپی پەیكانەكـە دەكـا هیـچی پێـوە نابینـێ، سەیری كلكی تیرەكە دەكا هیچی پێوە نابینێ، سەیری پەڕە پـەڕەی تیرەكـە دەكـا هیچی پێوە نابینـێ، تیرەكـە وا بەحوجـەت بـەناو خـوێن‌و سـەخورەكەدا فڕكـە دەكا هیچ لەگەڵ خۆی نابا، ئەمانـەیش ئـاوا كـە لـەئایین دەردەچـن هـیچ لەگـەڵ خۆیـان نابـەن، نیـشانەی ئـەم لـەئایین دەرپەڕیوانـە ئەوەیـە: پیـاوێكی رەشـیان واتیادا، قۆڵێكی وەكوو مەمكی ژن وایە، یا وەكوو گولەنگی گۆشـتین وایـە، گولـمە گۆشتێكی شلكەی شلە پەتەیـە، لەخۆیـەوە دێ‌و دەچـێ‌و دەلەرێتـەوە، ئـەم هـۆزە

کاتێ سەر هەڵ دەدەن و لەفەرمانی ئیسلام دەردەچن، کە موسوڵمانان لەناو خۆیانا بوون بەدوو بەرەوەو دوو بەرەکیو ناکۆکییان تێ دەکەوێ).

ئەبو سەعید (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گەواهو شایەتی دەدەم کە بۆ خۆم ئەمەم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستووە، هەروەها شایەتی دەدەم کە عەلی کوڕی ئەبو تالیب (رەزای خودای لێ بێ) لەگەڵ ئەمانەدا جەنگیو چوو بەگژیانا، وە لەوکاتەدا من خۆم لەگەڵ لەشکری عەلیدا بووم، عەلی (رەزای خودای لێ بێ) دەستووری دا، گەڕان بەشوێنی ئەو پیاوە رەشەدا، جا لەناو کوژراوەکاندا بۆی گەڕان، بەکوژراوی دۆزییانەوەو هێنایان، بەچاوی خۆم تەماشای لاشەکەیمکرد، رێك لەسەر ئەو ناوو نیشانەیە بوو کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتی خۆی باسی کرد بۆمان! (تاج/٥، زنجیرە: ٩١، ژمارە: ٥٥٢٣ ج/٤).

## (٤٨) باب: التحريض على قتل الخوارج
## هاندان لەسەر جەنگین لەگەڵ خەواریج
## واتە: دەرەکییەکان

٦٤٣- عن عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) اذا حَدَّثْتُكُمْ عَنْ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)حَدِيثا فَوَاللّٰهِ لانْ اخِرَّ مِنْ السَّمَاء احَبُّ الَيَ مِنْ انْ اكْذبَ عَلَيْهِ وَاذا حَدَّثْتُكُمْ فِيمَا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ فَانَّ الْحَرْبَ خِدْعَةٌوَانِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ سَيَخْرُجُ قَوْمٌ فِي اخِرِ الزَّمَانِ احْدَاث الاسْنَان سُفَهَاء الاحْلامِ يَقُولُونَ مِنْ خَيْرِ قَوْلِ الْبَرِيَةِ لا يُجَاوِزُ ايمَانُهُمْ حَنَاجِرَهُمْ يَمْرُقُونَ مِنْ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنْ الرَّمِيَةِ فَايْنَمَا

لَقِيتُمُوهُمْ فَاقْتُلُوهُمْ فَانَّ فِي قَتْلِهِمْ اجْرًا لِمَنْ قَتَلَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. (الحديث: ٣٦١١، اطرافه في: ٥٠٥٧، ٦٩٣٠):[٦٤٢]

پێشەوا عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ فەرموودەی پێغەمبەرتان بۆ بگێڕمەوە، ئەوەم پێ خۆشترە کە لە ئاسمانەوە بەر ببمەوەو پەراش پەراش ببم، هەتا ئەوە خوانە خواستە درۆ بە دەم پێغەمبەرەوە هەڵبەستم، کاتێکیش باسی نێوانی خۆمان و خۆتانتان بۆ بکەم، ئەوە دیارە کە جەنگ فریودا نەو، شەڕ بە درۆ و هاشەو هووشە دەبرێتەوە، شتی وا لە کاتی وا دا ڕێگەی پێ دراوە! جا لەم ڕوانگەیەوەو لەم بیرو باوەڕەوە، پێتان ڕادەگەیەنم، کە من بەگوێی خۆم، لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیستووە، کە دەیفەرموو: (لە ئاخر زەمانا، کۆمەڵێ پەیدا دەبن، پڕوپاگەندە بەناوی ئیسلامەوە بۆ خۆیان بلاو دەکەنەوە، وەك خەوارپجەکان دەیانگوت: لاحکم الاالله، ئەمانە نیشانەیان ئەوەیە منالّ و توالّن، هەڵەشەو پەڵەشەو هەرزە و نەفامن، بۆ قسە دانامێنن، بەقسە بێ کەس وەك ئەوان قسەی باش ناکا، قورئان دەخوێنن، دەم لە فەرموودەی پێغەمبەر دەکوتن، بەلام ئەمان هەربەدەم موسوڵمانن.. باوەڕیان لە گەروویان ڕەت نابێ و ئیسلام وەك خۆی لەناو دڵیانا نەچەسپیوە. وەك چۆن تیرێ کە نیشان دەسمێ، خێرا لێی دەردەچێ، ئەوانیش ئاوا بە ترە بیانوویێ، بە بەرزکردنەوەی دروشمی ڕاست و دروست بۆ مەبەستی ناڕەوا، ئەوانیش ئاوا خێرابەم جۆرە مەهانەیە لە ئایین دەردەچن‌و لە ئیسلام پاش گەز دەبنەوە، جا لە هەر لاو لە هەر کوێ تووشی ئەوانە بوون و بەرهەوێڵتان کەوتن، بوارمیان مەدەن و بیانکوژن، بە ڕاستی کەسێ یەکێ لەوانە بکوژێ لە ڕۆژی قیامەتدا

---

[٦٤٢] تجرید/٤، ژمارە: ١٤٣٦ = ٣٦١١، مسلم: ١٠٦٦ ترقیم محمد فؤاد عبدالباقی = ٢٤٥٩ ترقیم شیحا.

پاداشـتی گـەورەی بۆھەیــە). (بــڕ: تــاج/٣ ل/٢٣٠ ز/٨٨ = تــاج/٣، ژمــارە: ٢٣٣٨ حوكمی وەرگـەڕاو لـە دیـنو ئـاژاوەگێڕو..) + (تـاج/٥ ل/٢٨٨ ف/٩ ز/٧٨ = تـاج/٤، ژمارە: ٣٦٢٠).

**ڕاڤەو شیكرنەوە:**

ئەم جۆرە چینو تاقمانە، چین و تاقمەیەكی تایبەتی نین، وەلـە زۆر كـات و سەردەم دا سەریان هەڵ داوەو سـەرهەڵ دەدەن، بـەڵام دیـاری كردنـی ئەمانـەو كوشـتنیان هـەروا كـارێكی ئاسـان نییـە، لەبـەر ئـەوە بـۆ ئێمـە مانـان دەسـت لێ نەدانیان باشترە نابێ لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆدا، ڕەشە خەڵك شتی وا ئـەنجام بـدەن و خەڵك بكوژن و ئـەم جـۆرە فەرموودانـە بكـەن بەمەهانـە و بیـانوو، مەبەسـت لـەم جـۆرە فەرمانانـەو جێبـەجێ كردنیـان نەتـەوەی ئیسلامو قـازیو مـوفتیو كاربەدەستانە نەك ڕەشە خەڵك و تاك تاكی خەڵك.

**(٤٩) باب: الخوارج شر الخلق والخليقة**

**خەواریجەكان بەدترینی دروستكراوانی خودای گەورەو مەزنن**

٦٤٤- حديث سهل بْنِ حُنَيْفٍ عن يسير بن عمـرو، قـال: قلـت لـسهل بـن حنيف: هَلْ سَمِعْتَ النَّبِيَّ – صلى الله عليه وسلم – يَقُـولُ فِـي الْخَـوَارِجِ شَـيْئًا قَـالَ سَمِعْتُهُ يَقُولُ – وَأَهْوَى بِيَدِهِ قِبَلَ الْعِرَاقِ – « يَخْرُجُ مِنْهُ قَوْمٌ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ ، يَمْرُقُونَ مِنَ الإِسْلاَمِ مُرُوقَ السَّهْمِ مِنَ الرَّمِيَّةِ»:[٦٤٤]

سـەهلی كـوڕی حونـەیف (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: ژنـەوتم لـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) سـەبارەت بـە خەواریجـەكان شـتێكی

(٦٤٤) بخاری. إستتابە الموتدین: ٦٩٣٤، مسلم. شیحا: ٢٤٦٧.

فەرموو، گوێم لێی بوو دەیفەرموو، لەو کاتەیشدا بەدەستی ئاماژەی بەرەو عێراق دەکرد، وە دەیفەرموو: (ئا لێرەوە، لە عێراقەوە هۆزگەلێ پەیدادەبن‌و سەر هەڵدەدەن، قورئان دەخوێنن بەڵام لەگەروویان رەت نابێ‌و بەدڵ نەتێی دەگەن‌و نە کاری پێ دەکەن، چۆن تیرەکە دەدا لە نەچیر، خێرا بەگورجی دەیسمێ‌و لێی دەردەچێ‌و هیچ لە خوێن‌و گۆشت‌و ئەندامی نەچیرەکە لەگەڵ خۆی نابا، ئەوانیش ئاوا خێرا لە ئایین دەردەپەڕن‌و بەهیچ شێوەیێ سوودی لێ وەرناگرن!).

(٥٠) **باب: تحريم الزكاة على رسول الله (صلى الله عليه وسلم) وعلى آلِه، وهن بنوهاشم وبنو المطلب دون غيرهم**

**زەکات بۆ پێغەمبەرو کەسوکاری نادروستە، کەسوکاری پێغەمبەر کە زەکاتیان پێ ناشێ ئەم دوو بەرە بابەن:**

**یەکەم: بەرەبابی بەنی هاشم**

**دووەم: بەرەبابی بەنی موطەللیب**

٦٤٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قالَ: كَانَ رَسُولُ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ يُؤْتى بالتَمْرِ عِنْدَ صِرامِ النَّخْلِ، فَيَجِئُ هذا بِتَمْرِهِ، وَهذا مِنْ تَمْـرِهِ، حَتَّـى يَـصيرَ عِنْـدَهُ كُوماً مِنْ تَمْرٍ، فَجَعَلَ الحَسَنُ وَالحُسَيْنُ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمـا يَلْعَبَـان بِـذلِكَ التَمْـرِ، فَأَخَـذَ أحَدُهُما تَمْرةً فَجَعَلَهُ في فِيهِ، فَنَظَرَ إلَيْهِ رسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فأخْرَجَها مِـنْ فيهِ، فَقال: (أَمَـا عَلِمْـتَ أنَّ آل محمـدٍ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ لايـأكُلُونَ الـصَّدَقَةَ). (الحديث ١٤٨٥ – طرفاه في: ١٤٦١، ٣٠٧٢)[٦٤٥]

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران لەکاتی ڕنینی بەری دارخورمادا، زەکاتی خورمایان دەهێنا بۆ پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ-

---

[٦٤٥] تجريد/٢، ژمارە: ٧١٥ = ١٤٨٥، مسلم: ١٠٦٩ = ٢٤٧٠ شيحا.

ئـەم دەیهێنـاو ئـەو دەیهێنـا، هـەتا لـە خزمـەت پێغەمبـەردا دەبـوو بەخـەرمانێ خورما، حەسەن‌و حوسەین -ڕەزای خوایان لێ بێ- یاریان بـەو خورمـای زەکاتـە دەکرد، جا یەکێکیان دەنکێ خورمای هەڵگرت‌و نایە نـاو دەمیـەوە، پێغەمبـەر - دروودی خوای لەسەر بێ- سـەرنجێکی داو بەپەنجـەی لـەدەمی دەریهێنـاو ئەوسا فـەرمووی: (ئـەوە چ عەجـەب کـە نـازانی کـە خانـەوادەی موحەممـەد -دروودی خوای لەسەر بێ- زەکات ناخۆن). (تاج/٢/١٤٦ ز/١٩ = ژمارە: ١٢٥٤).

٦٤٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- أَنَّهُ قَالَ « إِنِّي لأَنْقَلِبُ إِلَى أَهْلِي فَأَجِدُ التَّمْرَةَ سَاقِطَةً عَلَى فِرَاشِي ثُـمَّ أَرْفَعُهَـا لآكُلَهَـا ثُـمَّ أَخْـشَى أَنْ تَكُونَ صَدَقَةً فَأُلْقِيهَا ».[٦٤٦]

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: جاری وادەبێ دەڕۆمەوە بۆ ماڵەوە، دەبینم دەنکێ خورمـا لەسـەر نوێنەکـەم کـەوتووە، هـەڵی دەگـرم کـە بیخـۆم، لەپاشـا مەترسـی ئەوەم هەیە کە ئـەو دەنکـە خورمایـە هـی زەکـات بـێ، لەبەرئـەوە فڕێـی دەدەم‌و نـایخۆم!).

٦٤٧- عَنْ أَنَسٍ - رضى الله عنه - قَالَ مَرَّ النَّبِيُّ - صلى الله عليه وسلم - بِتَمْرَةٍ مَسْقُوطَةٍ فَقَالَ « لَوْلاَ أَنْ تَكُونَ صَدَقَةً لأَكَلْتُهَا ».[٦٤٧]

ئەنەسـی کـوڕی مالیـك (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ڕوانـی وا لەسـەر ڕێگـە دەنکـێ خورمـا کـەوتووە، فەرمووی: (دەترسم ئەمە هینی زەکات بێ، دەنا دەیم خوارد).

---

[٦٤٦] اخرجه البخاری فی (٣٤) کتاب البیوع (٤) مسلم/٢٤٧٤.

[٦٤٧] بخاری: ٢٠٥٥، ٢٤٣١، مسلم: ٢٤٧٥.

**(٥٢) باب: إباحة الهدية للنبي (صلى الله عليه وسلم) ولبني هاشم وبني المطلب وإن كان المهدى ملكها بطريق الصدقة وبيان أن الصدقة إذا قبضها المتصدق عليه زال عنها وصف الصدقة وحلت لكل أحد ممن كانت الصدقة محرمة عليه**

**دیاری بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دروستە، وە هەروەها بۆ بەرەبابی بەنی هاشمو بەرەبابی بەنی موطەلیب، گەرچی دیاریدەر لەڕێگەی زەکاتەوە ئەو دیارییەی دەست کەوتبێ، زەکات کە بوو بەماڵی زەکاتپێدراو، ئیتر لە زەکاتی دەردەچێ، وە بۆ هەموو کەسێ دروستە کە وەری بگرێ، یا لێی بخوا با ئەو کەسە زەکاتیشی پێ نەشێ**

٦٤٨- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: أَهْدَتْ بَرِيرَةُ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) لَحْمًا تُصُدِّقَ بِهِ عَلَيْهَا، فَقَالَ: « هُوَ لَهَا صَدَقَةٌ وَلَنَا هَدِيَّةٌ ». {الحديث: ٢٤٨٢ = ٢٤٦٠ فم. زكاة. تجريد/٢/١٤١، رقم: ٧١٨ = ١٤٩٥، ٢٥٧٧. أبو داود. زكاة: ١٦٥٥. نسائي. عمرى: ٣٧٦٩. تحفة/ ١٢٤٢} : [٦٤٨]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گۆشتیان هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەبیخوات، عەرزیان کرد: ئەم گۆشتە هی زەکاتە، دراوە بە بەریرەی ئازادکراوی عائیشە، ئایا تۆ لێی دەخۆیت؟! فەرمووی: (ئەمە بۆ بەریرە زەکاتە، بەڵام بۆ ئێمە، کە بەریرە بەدیاری داوێتی پێمان، دەبێ بەدیاریو لە زەکاتی دەردەچێ لەبەرئەوە حەڵاڵەو دەیخۆین). {بڕوانە: تاج/٢/٥٠، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ١٢٥٦}.

**ڕوونکرنەوە:**

زەکات بەهەموو کەسێ ناشێ، ئەوەی زەکاتی پێ دەشێ مەرجی خۆی هەیە. بەڵام هەرکاتێ ماڵی زەکات بەپێی شەرع درا بەکەسێ، وە کەسەکە وەری گرت، ئیتر لە زەکاتی دەردەچێ، وە دەبێ بەهی وەرگرەکەی، خاوەنە تازەکەی

[٦٤٨] تجرید/٢، ژمارە: ٧١٨ - ١٤٩٥ بخاری. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥١٧ - ٢٤٨٢.

دەتوانێ هەموو تەصەرروفێکی شەرعی تیادا بکا، وەك ئەوە بیفرۆشێ، یا بەدیاری بیدا بە دەوڵەمەندێ، یا دەرخواردی سەییدی بدات کە نەوەی پێغەمبەرن، یا بیدات بە سەرفترەی خۆیو خێزانی، یا بیکا بەخێر.

٦٤٩- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: بَعَثَ إِلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِشَاةٍ مِنَ الصَّدَقَةِ، فَبَعَثْتُ إِلَى عَائِشَةَ مِنْهَا بِشَيْءٍ، فَلَمَّا جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِلَى عَائِشَةَ قَالَ: « هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ؟ ». قَالَتْ: لاَ، إِلاَّ أَنَّ نُسَيْبَةَ بَعَثَتْ إِلَيْنَا مِنَ الشَّاةِ الَّتِي بَعَثْتُمْ بِهَا إِلَيْهَا، قَالَ: « إِنَّهَا قَدْ بَلَغَتْ مَحِلَّهَا ». {الحديث: ٢٤٨٧ = ٢٤٦٥ فم. زكاة. تجريد البخارى/٢/١١٥، رقم: ٦٩٣ = ١٤٤٦، ١٤٩٤، ٢٧٧٩. تحفة الأشراف: ١٨١٢٥} : [٦٤٩]

ئوم عەتێ (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: من کەناوم نوسەیبەی ئەنصارییەو، ناسراوم بە دایکی عەتێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مەڕێکی زەکاتی بۆم نارد، کاتێ سەریم بڕی، بەدیاری بەشی عائیشەی هاوسەری پێغەمبەرم لێی نارد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە عائیشە دەفەرموێ: (ئایا شتێکتان لەلا هەیە کە قاوەڵتی پێ بکەین؟). عائیشە دەفەرموێ: هیچم لەلا نییە، تەنیا دیارییەکەی ئوم عەتێ نەبێ، کە لە گۆشتی ئەو مەڕە زەکاتە بۆی ناردووم، کەتۆ پێت دابوو، ئایا تۆ لەوە دەخۆیت؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی دەفەرموێ: (بیهێنە بۆم، ئەوە گەیوەتە جێگەی خۆی، گەیوەتە ئەو جێگەیەی کە پێی حەڵاڵ دەبێ، چونکە هەتا زەکات بێ بەمن نادروستە، ئێستا بووە بە ماڵی ئوم عەتێو لە زەکاتی دەرچووە، بەڵکوو دادەنرێ بەدیاری، دیاریش بەمن دروستە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٩ = ژمارە: ١٢٥٦}.

---

[٦٤٩] تجرید/٢، ژمارە: ٦٩٣ = ١٤٤٦ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥١٨ = ٢٤٨٧ شیحا.

### (٥٣) باب: قبول النبي (صلى الله عليه وسلم) الهدية ورده الصدقة
### پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دیاری وەردەگرت، بەڵام زەكاتی وەرنەدەگرت بۆ خۆی

٦٥٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: إِنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ إِذَا أُتِيَ بِطَعَامٍ، سَأَلَ عَنْهُ، فَإِنْ قِيلَ: هَدِيَّةٌ، أَكَلَ مِنْهَا، وَإِنْ قِيلَ صَدَقَةٌ، لَمْ يَأْكُلْ مِنْهَا. {الحديث: ٢٤٨٨ = ٢٤٦٦ فم. زكاة}:(٦٥٠)

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: دەسـتووری پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) وابـوو، كاتـێ نانیـان بـۆی دادەنـا، ئەگـەر لـە حەڵاڵییەكەی دڵنیا نەبوایە دەیپرسی، جا ئەگەر بگوترایە: هی دیارییە، لێی دەخوارد، بەڵام ئەگەر بگوترایە: هی زەكاتە، لێی نەدەخوارد). {تاج/٢، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ١٢٥٧ — ت/م = ترمزیو مسلم}.

### (٥٤) باب: الدعاء لمن أتى بصدقته
### نزای باشكردن بۆ زەكاتدەر

٦٥١- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أَوْفَى (رضى الله عنه) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِذَا أَتَاهُ قَوْمٌ بِصَدَقَتِهِمْ، قَالَ: « اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَيْهِمْ ». فَأَتَاهُ أَبِي أَبُو أَوْفَى بِصَدَقَتِهِ، فَقَالَ: « اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أَبِي أَوْفَى ». {الحديث: ٢٤٨٩ = ٢٤٦٧ فم. تجريد/٢/١٤١، رقم: ٢٧٠ = ١٤٩٧، ٤١٦٦، ٦٢٣٢، ٦٣٥٩. أبو داود. زكاة: ١٥٩٠. نسائي. زكاة: ٢٤٥٨. ابن ماجة. زكاة: ١٧٩٦}: (٦٥١)

عەبـدوڵڵای كـوڕی ئـەبو ئـەوفا (رەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، كە كەسێ زەكاتی خۆی

(٦٥٠) مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥١٩ = ٢٤٨٨.

(٦٥١) تجريد/٢، ژمارە: ٧٢٠ = ١٤٩٧. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥١٠ = ٢٤٨٩ شيحا.




بۆی دەهێنا، دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أَبِي فُلَانٍ): خودایە! ڕەحمەت بڕێژە بەسەر کەسوکارو بنەماڵەی فیسارە کەسدا).

باوکیشم کە زەکاتەکەی خۆی بۆی برد فەرمووی: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أَبِي أَوْفَى): خودایە ڕەحمەت بڕێژە بەسەر بنەماڵەی ئەبو ئەوفادا). {تاج/٢/٤٢، زنجیرە: ١٧، ژمارە: ١٢٤١}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- ئەوەی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پاڕانەوەو نزاکردن، لەلایەنی زەکات وەرگرەوە، بۆ زەکات دەرکەر، سوننەتە، بەپێی ئایەتی: {وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَاتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ – توبة/١٠٣} واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! کاتێ زەکات لە موسوڵمانان وەردەگریت، بۆیان بپاڕێرەوەو نزای باشیان بۆبکە، ئەم نزاو پاڕانەوەی تۆ بۆ ئەوان بەتایبەتی لەم کاتەدا، دەبێ بەهۆی دڵ ئارامی بۆ ئەوان، وە ئەم نزایەی پێغەمبەریش، بەپێی ئەم ئایەتە بووە.

٢- عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا (ڕەزای خودایان لێ بێ) خۆیو باوکی لە هاوەڵانی پێغەمبەر بوون، ئەبو ئەوفا ناوی عەلقەمەی کوڕی خالیدە، لە عەبدوڵڵاوە نەوەدو پێنج فەرموودە گێڕانەوە کراوە، بوخاری یازدە فەرموودەی لەوەوە گێڕاوەتەوە، ئەبو ئەوفا، یەکێك بوو لەو کۆمەڵە هاوەڵانە، کە لە ڕۆژەکەی حودەیبییەدا، لەبن دار سەموورەکەدا پەیمانی خۆشنوودییان بەست لەگەڵ پێغەمبەردا، کە ناودارە بە بەیعەتی ڕیزوان.

عەبدوڵڵا (یەکێکە لەو حەوت سەحابەیە، کە پێشەوا ئیمامی ئەبو حەنیفە (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) بە خزمەتیان گەیشتووە، کە یەکێکی تریان ئەنەسی کوڕی مالیکە، ئەوکاتە کە ئەبو حەنیفە بەخزمەت عەبدوڵڵا دەگا، ساڵی هەشتای کۆچی بووە، ئەبو حەنیفە حەوت ساڵان بووە، کە تەمەنی

فامین‌و لەشت تێگەیشتنە، کەواتە: ئەبو حەنیفە تابیعییە، بەپێی فەرموودەی ساغی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەباشی‌و چاکیدا، لەپلەی دووەمی چاکانی نەتەوەی ئیسلام دایە، وەك دەفەرموێ: « خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ – تاج/٣، لاپەڕە: ٥٣١، زنجیرە: ١، ژمارە: ٣٢٢١ – ش/د/ت».

عەبدوڵلا ئامادەی حودەیبییەو خەیبەرو مەڵبەندو شەڕگەکانی تری دوا ئەوانیش بووە، خۆی‌و باوکی لە یارانی بەیعەتی ریزوانن، عەبدوڵلا هەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەفاتی کرد، لەمەدینە لە خزمەتیدا بوو، لەپاشا باریکرد بۆ کووفە، لەکۆتایی تەمەنیدا نابینا بوو، عەبدوڵلا دەیفەرموو: (شەش غەزام لە خزمەتی پێغەمبەردا کردووە، لەو غەزایانەدا، لەبرسانا کوللەمان دەخوارد، لەهەشتاو حەوت، هەشتاو شەشی کۆچیدا لە کووفە مردووە، دوا هاوڕێی پێغەمبەر بووە کە لەکووفە مردووە، ئەم زاتانە فەرموودەیان لەوەوە گێڕاوەتەوە: ئەبو ئیسحاقی شەیبانی‌و سەلەمەی کوڕی کەهیل (ڕەزای خودایان لێ بێ).

## ڕوونکردنەوە:

## پوختەی بڕیارە شەرعییەکانی نامەی زەکات

١- زەکات روکنی سێیەمە لە پێنج روکنەکەی ئیسلام‌و فەرزە.

٢- زەکات لە دانەوێڵەو ئاژەڵ‌و پول‌و پارەو زێڕو زیوو سامانی بازرگانی دەکەوێ، هەریەکەیان بەپێی مەرجی خۆی.

٣- زەکات نەدان تاوانێکی گەلێ گەورەیەو دەبێ بەهۆی سزای سەختی خودا، زوو یا درەنگ.

٤- زەکات وەرگر، بانزای باش بۆ زەکاتدەر بکا، واباشە هەردوولا لەیەکتری رازی بن‌و فەرمانی شەرع رەچاو بکەن.

٥- ئەوانەی زەکاتیان پێ دەشێ هەشت جۆرە کەسن.

٦- سەیيدی نەسەب ساخ زەکاتی پێ ناشێ، مەگەر مافی شەرعی خۆی پێ نەدرێ‌و نەداراو هەژار بێ.

٧- ماڵی زەکات کەدرا بەکەسێ، لە زەکاتی دەردەچێ‌و دەبێ بەماڵی ئەو کەسە، ئیتر ئەو کەسەی وەری گرتووە هەرچی لێ دەکا دروستە.

٨- سەرفیترە فەرزە، هەموو ساڵێ لەسەر هەموو موسوڵمانێ.

٩- ماڵ‌و سامان، بێجگە لە زەکاتیش، مافی شەرعی تری واتیادا، وەك یارمەتی هەژارو نەداراو لێقەوماو خەرج کردنی لەهەموو کارێکی باشدا، وەك غەزاو حەج‌و مزگەوت دروستکردن...

١٠- خێرو خێرات‌و شت بەخشین جۆری زۆرە، بەشێوەی گشتی خێر هەر خێرە، کەمیش بێ هەر زۆرە، بەهەموو کەسێکیش دەشێ، خزم بێ، بێگانەبێ، تەنانەت بە ناموسوڵمانیش دەشێ، بگرە بە ئاژەڵ‌و جانەوەرو دارو درەختیش خێر هەر خێرە.

١١- سواڵکردن کارێ ناباشە مەگەر لەبەر ناچاری، دەنا دەبێ بەهۆی رووزەردی هەردوو جیهان.

١٢- لەکاتی خێرکردندا، کۆمەڵێ بەشدارن لە پاداشتەکەیدا، هەر کەسەیان بەپێی ئەرکێ کە دەیکێشێ لەو پێناوەدا، وەك:

أ- خاوەن ماڵ، کە ماڵەکەی پەیدا کردووەو ماڵەکە هی ئەوە.

ب- ئەو کەسەی خێرەکە جێبەجێ دەکاو دەیداتە دەست خێر پێکراوەکە، وەك ژن‌و نۆکەرو مناڵ‌و سەرپەرشتیار، چونکە خێرەکە جێبەجێ دەکاو دەبێ بەهۆی جێبەجێ کردنی.

ج- مەلاو مامۆستا، کە سەرپەرشتی جێبەجێ کردنی خێرەکە دەکەن، هەتا بەپێی شەرع بێو بەهەڵە نەکرێ، وەك چاوێری سەربڕینی قوربانیو حەوتەو نەزرو شتی تریوا، کە مامۆستاو مەلاکان بەم کارە هەڵ دەسنو گەڵێ جار نزای تایبەت دەخوێننو رێو رەسمی شەرعی جێبەجێ دەکەنو رێنمایی شایان ئەنجام دەدەن.

١٣- مەرجی سەرەکی قەبووڵ بوونی خەرجکردنی سامانو ماڵ بەخشین سێ شتە: یەکەم نیازی پاك، دووەم: لەبەر ریا بازیو شانازیو منەتو شاباش نەبێ، سێیەم: ماڵەکە حەڵاڵ بێ.

١٤- خاوەن ماڵ، نێربێ، یامێ، گەورەبێ، یا بچووك، شێت بێ، یاژیر، زەکاتو سەرفترەی لەسەرە، وە هەروەها بەپێی حاڵ خێرو خێراتی تر لە ماڵەکەی دەکرێ، بەڵام بەپێی یاساو رێسایەکی تایبەت، کە لەشوێنی خۆیدا باسکراوە.

١٥- پاداشی خێرکردن بۆ مردوو پێی دەگا، بەتایبەتی خێری سامانی، وەك وەقفو قوربانی.

١٦- شتدان بە دۆخە بە ئاتاج سوننەتە، وەك بزنە بە دۆخەو شتی تری وا.

١٧- خێری شاراوە زۆر پەسەندە.

١٨- خێر جۆری زۆرە، هەرچی شەرع پەسەندی بکا دادەنرێ بەخێر، با وشەیەکی خێریش بێ، یا سوبحانەڵلایێ بێ.

١٩- رۆژانە ئادەمیزاد کۆمەڵێ خێری لەسەرە.

٢٠- گوزەرانی سەروبەرو بێ رازیبوونی مایەی رزگارییە، هەڵپەی زۆریش بۆ پڕوپیتی جیهان نیشانەی چاو برسێتیو چاو چنۆکییە!

٢١- خۆشی ژیانی جیهان، ئەگەر لێزانانە نەبێو بەپێی یاسا نامەی خودا نەبێ، هۆی سەرتیاچوونو کێشەو بەرەیە.

٢٢- دروشمی پیاو چاکان ئەمەیە: (نە داوای یارمەتی لەکەس دەکەین و نە یارمەتی کەسیش رەت دەکەینەوە!).

٢٣- بەپێی تەوانا، ئەوەی داوای یارمەتیت لێ دەکا، هەرکەسێ هەیە نا ئومێدی مەکە. رەحمەت لە گوتەری ئەم شیعرانە:

سەر مەشقێ جوان بە، وەک داری بەری
لەبەری دەخۆن دەچنە سێبەری
بەردی تێ دەگرن، تێت دەگرێ بەری
نزات بۆ دەکەن: فریشتەو پەری!
نەی بەندەی باشی خودای میهرەبان
تا دووربی کەمە لەپێڕی شەیتان!
ژیرو دانابەو خاوەنی ویژدان
سەرمەشقێ جوان بە وەک خۆری بەیان
تیشکی دەبەخشێ بە هەموو جیهان
بەبێ بەرابەر، بەبێ منەتنان!

## ١٣- كتاب الصيام
## نامەی ڕۆژوو
### (١) باب: فضل شهر رمضان
### باسی گەورەیی‌و پیرۆزی مانگی ڕەمەزان

٦٥٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ « إِذَا جَاءَ رَمَضَانُ فُتِحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ». (الحديث ١٨٩٨، طرفاه ١٨٩٩، ٣٢٧٧):[٦٥٢]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ کە ڕەمەزان دێت هەموو دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە ڕەحمەت دەبارێ. (تاج/٢/٧١ ز/٢٥ ف/٢ ش/ت/ن).

وعَنْهُ فِي الرِوايَة لأخرى: قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) « إِذَا دَخَلَ شَهْرُ رَمَضَانَ فُتِّحَتْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ جَهَنَّمَ، وَسُلْسِلَتِ الشَّيَاطِينُ». (الحديث ١٨٩٩).

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: کاتێ کە مانگی ڕەمەزان تەشریف دەهێنێ، دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوەو ڕەحمەت دەبارێ. دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن، وە شەیتانەکان کۆت‌و زنجیرو کەلەپچە دەکرێن. (ریاض/٣/٩١٠ ز/٢١٧، ژمارە: ١٢٢٠ - ش).

---

[٦٥٢] تجرید/٢، ژمارە: ٨٧٤ = ١٨٩٨، ١٨٩٩. مسلم: ١٠٧٩ - مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٧٢ - شیحا: ٢٤٩٢.

## (٢) باب: وجوب صوم رمضان لرؤية الهلال والفطر لرؤية الهلال
## گرتنی ڕۆژوو بەپێی بینینی مانگ، هەروا جەژنکردن بەپێی بینینی مانگی نوێ

٦٥٣- أَنَّ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ « إِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَصُومُوا، وَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَأَفْطِرُوا، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَاقْدُرُوا لَهُ ». وَقَالَ غَيْرُهُ عَنِ اللَّيْثِ حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ وَيُونُسُ لِهِلاَلِ رَمَضَانَ. (الحديث ١٩٠٠، طرفاه ١٩٠٦، ١٩٠٧):[٦٥٣]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ژنەوتم لە خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو : تامانگی نوێ نەبینن نەبیکەن بەڕەمەزانو نەبیکەن بەجەژن! ئەگەر هەورو هەلاّش بوو، وە هەور بەری مانگی گرتبوو، سیی ڕۆژی تەواو دابنێن بۆ مانگی پێشوو. (تاج/٢/٨١ ز/٢٩ – ش/د/ت/ن).

٦٥٤- عَنِ ابْنَ عُمَرَ (رضى الله عنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « إِنَّا أُمَّةٌ أُمِّيَّةٌ، لاَ نَكْتُبُ وَلاَ نَحْسُبُ، الشَّهْرُ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا، وَعَقَدَ الإِبْهَامَ فِى الثَّالِثَةِ، وَالشَّهْرُ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا، يَعْنِى تَمَامَ ثَلاَثِينَ». {الحديث: ٢٥٠٨ = ٢٤٨٧ فم. تجريد/٢/٢٦٨، رقم: ٨٨٢ = ١٩١٣. أبو داود. صوم: ٢٣١٩. نسائى. صيام: ٢١٣٩}:[٦٥٤]

ئەم گێڕانەوەی تری پێشەوا موسلیم، لەم شوێنەدا ڕاگوێز دەکەم، چونکە ڕوونترە:

---

[٦٥٣] تجرید/٢، ژمارە: ٨٧٥ = ١٩٠٠ بخاری. مسلم: ٢٤٩٩.

[٦٥٤] تجرید/٢، ژمارە: ٨٨٢ = ١٩١٣ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٧٦ = ٢٥٠٨.

ئیبنــو عومــەر (ڕەزای خودایــان لێ بــێ) فــەرمووی: پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) فــەرمووی: (ئێمــە گــەلێکی نەخوێنــدەوارو بــێ ســەوادین، نووســینو ئەســتێرە ژمێریــی نــازانین، مەگــەر زۆر کــەم، جا لەبەرئــەوە خــودای میهرەبان بــەپێی حــاڵ، نیــشانەی ئاسانو ئاشکرای بۆدانــاوین، بــۆ زانینــی کــاتی طاعــەتو پەرستشو کاروبــاری ترمــان، وەك دیتنــی خــۆرو دیتنــی مــانگی یــەك شەوە، هەموو مانگێکیش مەرج نییە سیی ڕۆژی تەواوبێ).

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ڕوونکردنــەوەی باســەکە، دووجار بە پەنجەکانی هەردوو دەستی ئاماژەی کردو لەجاری یەکەما، بەهــەر دە پەنجەکــەی ســێجار فــەرمووی: (جــاری وا دەبــێ مــانگ ئەوەنــدەو ئەوەنــدەو ئەوەندەیــە) لــە ئامــاژەی ســێیەمی ئــەمجاری یەکەمــەدا، پەنجــە کەڵــەی خــۆی نووقاند، واتە: وا دەبێ مانگ دووجار دەو یەك جار نۆیە کە دەکاتە بیــستو نــۆ ڕۆژ، بــەڵام لــەجاری دووەمــا، بەهــەر دە پەنجەکــەی ســێجار ئامــاژەی کــردو فــەرمووی: (جــاری وایــش دەبــێ مــانگ ئەوەنــدەو ئەوەنــدەو ئەوەندەیــە، واتــە: سێجار دە، کە دەکاتە سیی ڕۆژی تەواو).

٦٥٥- عن ابْنَ عُمَرَ - رضى الله عنهما - عَنِ النَّبِىِّ - صلى الله عليه وسـلم - أَنَّهُ قَالَ « إِنَّا أُمَّةٌ أُمِّيَّةٌ ، لاَ نَكْتُبُ وَلاَ نَحْسُبُ الشَّهْرُ هَكَذَا وَهَكَـذَا » . يَعْنِـى مَـرَّةً تِسْعَةً وَعِشْرِينَ ، وَمَرَّةً ثَلاَثِينَ.[٦٥٥]

بەتەواوی لەژمارە (٦٥٤)دا ڕابورد.

٦٥٦- حديث أَبِى هُرَيْرَةَ - رضى الله عنه - يَقُولُ قَالَ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم) أَوْ قَالَ قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ (صلى الله عليه وسـلم): « صُـومُوا لِرُؤْيَتِـهِ ، وَأَفْطِـرُوا لِرُؤْيَتِهِ ، فَإِنْ غُبِّىَ عَلَيْكُمْ فَأَكْمِلُوا عِدَّةَ شَعْبَانَ ثَلاَثِينَ».[٦٥٦]

---

[٦٥٥] بڕوانە ژمارە: (٦٥٤).

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەری خـودا (دروودی خودای لەسـەر بـێ)، کـە کەسـناوی ئەبولقاسمـە، فەرمووی: (تـا مـانگی نـوێ نـەبینن نەبیکـەن بـە رەمـەزانو نـە بیکـەن بەجـەژن، وە ئەگـەر هـەورو هەڵایش بوو، وە هەور بەری مانگی گرتبوو، سیی رۆژی تەواو دابنێن بـۆ مـانگی کوڵەمانگ (کولەمانگ = شەعبان) ئەوجا بیکەن بە رەمەزان).

**(٣) باب: لا تقدموا رمضان بصوم يوم ولا يومين**

**لە پێش هاتنـی مانگی ڕەمەزانا، بە ڕۆژێ، یا بە دوو ڕۆژ بەڕۆژوو مەبن**

٦٥٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ « لاَ يَتَقَدَّمَنَّ أَحَدُكُمْ رَمَضَانَ بِصَوْمِ يَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ رَجُلٌ كَـانَ يَـصُومُ صَـوْمَهُ فَلْيَصُمْ ذَلِكَ الْيَوْمَ ». (الحديث ١٩١٤ ):[٦٥٧]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لـێ بێ) لەحەزرەتەوە (دروودی خوای لەسـەر بێ) دەفەرموێ: بەرۆژوو دوو رۆژ لەپێش ڕەمـەزانا بـەرۆژوو مـەبن، مەگـەر بـۆ کەسێ رۆژووی خـۆی بگـرێ، وەك ئـەوە کەسـێ دەسـتووری وابـێ، دوو شـەممان‌و پێنـج شەممان بەرۆژوو بێ، یا رۆژووی نەزر بێ، یا قـەزا بـێ. (تـاج/٢/١٢١ ز/٥٤ = ژمارە: ١٤٠٥ - ش/د/ت).

---

[٦٥٦] مسلم: ٢٤٩٥ — ٢٥٠٢. بخاری: ١٩٠٦، ١٩٠٠.

[٦٥٧] تجرید/٢، ژمارە: ٨٨٣ = ١٩١٤. مسلم: ١٠٨٢ = ٢٥١٤ = مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٧٣.

## (٤) باب: الشهر يكون تسعة وعشرين
## جاری وا دەبێ مانگ بیستو نۆ ڕۆژ دەبێ

٦٥٨- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رضى الله عنها): أَخْبَرَتْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) حَلَفَ أَنْ لاَ يَدْخُلَ عَلَى بَعْضِ أَهْلِهِ شَهْرًا، فَلَمَّا مَضَى تِسْعَةٌ وَعِشْرُونَ يَوْمًا غَدَا عَلَيْهِمْ، أَوْ رَاحَ، فَقِيلَ لَهُ: حَلَفْتَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ أَنْ لاَ تَدْخُلَ عَلَيْنَا شَهْرًا، قَالَ: « إِنَّ الشَّهْرَ يَكُونُ تِسْعَةً وَعِشْرِينَ يَوْمًا ». {الحديث: ٢٥١٩ = ٢٤٩٨ فم. تجريد/٢/٢٦٧، رقم: ٨٨٠ = ١٩١٠، ٥٢٠٢ فتح}:[٦٥٨]

ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لە پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرەکانی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوێندی خوارد لە ژنەکانی، کە یەك مانگ نەچێتەلایان، کەبەم جۆرە سوێندە لە زاراوی شەرعی پیرۆزدا دەگوترێ: ئیلاء، جا لەپاش بیستو نۆ ڕۆژ، سەر لەبەیانی، یا سەر لەئێوارە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو بۆلای خیزانەکانی، کەپێیان گوت: خۆ تۆ سوێندت خواردبوو کە یەك مانگ نەچیت بۆلایان؟ فەرمووی: (مانگ بیستو نۆ ڕۆژیش دەبێ، خۆ مەرج نییە کە گشت مانگێ سیی ڕۆژی دەق بێ). {تاج/٢/٨٦، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ١٣١٥، ج/٤}.

## (٧) باب: بيان معنى قوله (صلى الله عليه وسلم) «شَهْرا عِيدٍ لاَ يَنْقُصَانِ»
## واتای ئەم گوتەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) «مانگی ڕەمەزانو مانگی قوربان کەم ناکەن»

٦٥٩- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «شَهْرَا عِيدٍ لاَ يَنْقُصَانِ، رَمَضَانُ وَذُو الْحِجَّةِ ». {الحديث: ٢٥٢٧ = ٢٥٠٦ فم.

---

[٦٥٨] تجريد/٢، ژمارە: ٨٨٠ = ١٩١٠، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٧٥ = ٢٥١٩.

بخاری/٢/٢٦٨، رقم: ٨٨١ = ١٩١٢. أبو داود. صـوم: ٢٣٢٣. ترمـذی. صـوم: ٦٩٢. ابن ماجة. صيام: ١٦٥٩. تحفة الأشراف: ١١٦٧٧} :[٦٥٩]

ئەبو بەكرە (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دوو مانگی دوو جەژنەكە (واتە: مانگی رەمەزان‌و مـانگی قوربان) بەدەگمەن رێ دەكەوێ، كە لەیـەك سـالّا، كـە هـەردوو مانگـەكان لەسـیی رۆژ كەمتربن، بەلّكوو زۆرینەی كات، یا هەردوو مانگـەكان سـیی تـەواو دەبـن، یـا ئەگەر یەكێكیان بیست‌و نـۆ بـوو ئـەوی تریـان سـیی تـەواو دەبـێ). {تـاج/٢/٨٧، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ١٣١٦، ج/٤} . هەنـدێ دەفـەرموون: مەبەسـت ئەومیـە ئـەم دوو مانگـە ئەگـەر بـە ژمـارەی رۆژیـش لەسـیی كـەمتربن، هـەر خێـری تـەواوی ئـەو سالّانەی تریان هەیە كەسیی پربن. {ریاض/٣/١٦٥، زنجیرە: ٢٢١، ژمارە: ١٢٢٩} .

**راڤەو شیكردنەوە:**

**ئەم بەهرانە لەم فەرموودانە وەردەگیرێن:**

١- ئامـاژەو ئیشارەت بایـەخی خۆی هەیە بـۆ ڕونكردنـەوەی مەبەسـت، وەك بلّێ: خاوەری ژنم تەلّاقی كەوتبێت بەدەستیش بەدوو پەنجە ئاماژە بكـات، ئـەوە دوو تەلّاقی دەكەوێ.

٢- زانستی ئەستێرە ژمێری زانستێكی وردو بایخدارە مانـگ جـاری وا دەبـێ بیست‌و نۆ رۆژە جاری وایش دەبێ سیی رۆژی رێكە.

٣- بەپێی فەرمودەكان، سەری مانـگ بەسێ شێوە دەچەسپێ:

أ- بەبینینی مانگی یەك شەوەی مانگی نوێ.

---

[٦٥٩] تجرید/٢، ژمارە: ٨٨١ = ١٩١٢، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٧٩ = ٢٥٢٧ ترقيم شيحا.

ب- ئەگەر هەورو هەڵا بوو مانگ نەبینرێ، سیی رۆژی تـەواو دادەنـرێ بـۆ مانگی پێشوو ئەوجا دەبێ بەیەکی مانگی دواتر.

ج- بەپێی حیسابی فەلەکی، کە ئەمڕۆ زۆر بەئاسانی دەتوانرێ کە سـەری مانگی تازە زۆر بەوردی دیاری بکرێ.

لەبـەر گرنگـی ئـەم مەبەسـتە حەزدەکـەم بـە ئیقتیبـاس لەپـەڕاوی (كيف نتعامل مع السنة) کە دانراوی (د. یوسـف قەرزاویـە) ئـەم باسـە روون بکەمـەوە، چونکە لەو بڕوایەدام کەکاتی ئەوە هاتووە لەم بابەتە گرنگەدا سوود لە حیسابی فەلـەکیش وەربگـیرێ، پێـشەکی لەغایەتولئوصـوولی شـەرحی تـاجول ئوصـولا لەبەرگی دووەم لاپەڕە پەنجاو پێنـج دا دەفەرموێ:

جـەماوەری زانایـان دەفـەرموون: بایـەخ بەقـسەی ئەسـتێرە شـوناسو حیـسابگەر نییـە... بـەڵام شـەرعزانە شـافیعییەکان دەفـەرموون: حیـسابو ژمێریاریی ئەمانە بایەخی هەیە، چ بۆ خۆیانو چ بـۆ ئەوانـەی کـە باوڕیـان پـێ دەکـەنو حیـسابەکەیان بەڕاسـت دەزانـن، لەبـەر ئـەوە بۆیـان هەیـە کـە کـار بەقـسەکەیان بکـەن، چـونکە ئـەم فەرموودانـە دەق نـین لەسـەر کارنـەکردن بـە حـسابی حـساب گـەڕان، بـەڵکوو بەپێـچەوانەوە ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەکـەن کـە حیسابگەری زانستێکی دانسقەی بایەخدارە، کە بەهـەموو کەسـێ نـازانرێ وەکـی تریش نوێژ کە هاوتای رۆژووە، بە ئیتفـاقی نەتـەوەی ئیـسلام کاتـەکانی بـەپێی حیـساب دیـاری دەکـرێ لـە قورئـانیش دا ئایـەتێ بـەدەق پەسـەن (مـەدح)ی ئـەو زانایانـە دەکـا کـە بـەهۆی ئەسـتێرەوە شـارەزایی شـایان لـە بابەتـەکان دا پەیـدا دەکەن کە بەدەق دەفەرموێ: {وَعَلامَاتٍ وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ} (النحل /١٦).

لە موغنی موحتاجیش دا ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەکـا کـە بـەلای نـەوەویو سـوبوکیو زەرکەشییەوە جۆرە بایەخێ بۆ حیسابگەری دادەنرێ.




لێـرەدا ئێمـە فیقهـی مەقاصـید ڕەچـاو دەکـەین‌و بۆمـان هەیـە کـەبڵێین شەرعزان بۆی هەیە کە بفەرموێ لەم فەرموودانەدا مەبەست دیاری کراوە کە گرتنـی ڕۆژووی مـانگی ڕەمەزانــە سەرانــسەری بــەبێ کــەم‌و زیــاد بــەبێ لــێ کەلکردن.

هۆکارێکی لەباریش لەگـەڵ بـارودۆخی ئـەو ڕۆژگـارەدا دیـسان دەستنیـشان کراوە، بۆ گەیشتن بەو مەبەستە نـەگۆڕە، کەئـەو هۆکـارە بینینـی مـانگی نوێیـە بەچـاوی سـەر، لەلایـەن یـەك شـایەتەوە یـا لەلایـەن چـەن شـایەتێکەوە ئـەم هۆکارەیش هۆکارێکی ئاساییە کە بـۆ هـەموو سـەردەمێ دەست دەدا، جـەماوەری خەڵك بەئاسانی دەتوانن بەهرەی لێ وەربگرن.

دیـارە کەلەسـەردەمی بەختـەوەری دا کـە چـاخی پێغەمبەرییـە بینینـی مـانگی نـوێ بەچـاوی سـەر بـەبێ دووربـین‌و تەلەسکۆپ‌و شـتی تـری وا یەکـەم هۆکاری ئاسانی ئاسایی لەباری ئەو ڕۆژگارە بووە، کـە بـۆ هـەموو کەسـێ دەسـتی داوە، لەسەر ئەوە فەرموودەکەش ئـەوەی (واتـە: بینینـی) دەستنیـشانکردووە بـۆ گەیشتن بەو مەبەستە گرنگە، چونکە نـەدەکرا کـە لەنەتەوەیـەکی بـێ سـەوادی وەك نەتەوەی ئیسلام لەوکات‌و ساتەدا داوای کارکردن بـە حیـسابی فەلـەکی لـێ بکـرێ بـۆ دیـاریکردنی هـاتنی سـەری مـانگ، چـونکە شـتی واو داوای وا، لـەو سـەردەمەدا بـۆ ئـەوان‌و لـەوان کـاری کـەس نـەکردەیی بـووە! تووشـی سەراسێی دەکردن.

پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: خـودا منـی کـردووە کە ببم بە مامۆستایەکی نەرمونیان بۆیـان، کـار ئاسـان بکـەم بـۆ ئۆمـەتم، خـودا منی بۆئەوە ڕەوانە نەکردووە کە مەردووم تووشی ڕەنج‌و سەراسێ بکـەم‌و بـاری سەرشانیان قورستر بکەم‌و ئەرکیان گرانتر بکەم.




دەی باشە ئێمە دەڵێین: راستە مەبەست لێرەدا نەگۆڕە، بەڵام هۆکار شایانی گۆڕانە، لەزاتی خۆیدا، چونکە هۆکار نە مەبەستەو نە بەشێکە لەمەبەست بەڵکوو پەیژەو هۆکارە بۆ گەیشتن بەمەبەست هەروەك چۆن لەکۆن دا وڵاخی سواری باشترین هۆکار بووە بۆ گەیشتن بەمەبەست کە حەجکردنە بەڵام هۆکاری باشتر پەیدابووە وەك فڕۆکەو خۆشرۆ.

دەی کەوایە هەرکاتێ هۆکاری تری باشتری لەبارتر پەیدا بوو بۆ گەیشتن بەمەبەستی دیاریکردنی سەری مانگ کە کراوە بەئامانجو مەبەست لەم فەرموودانەدا، کە ئەو هۆکارە بەشێوەیەکی وابێ، هەم هەڵەی کەمتر بێ هەم ئاسان تربێ هەم راستتر بێ هەم لەتوانا دابێ، ئیتر بۆ دەبێ ئێمە خۆمان شەتڵ بکەین بەهۆکارە کۆنەکەوە بۆ دەبێ خۆمان لەئامانجی سەرەکی فەرموودەکان هەڵە بکەینو کوێرانە خۆمان شەتەك بدەین بەڕوو کەشکارییەوە!.

بێگومان ئەمڕۆ لەسایەی خواوە، شۆڕشی زانست هەموو سەر ڕووی زەوی گرتۆتەوە، سوپاس بۆ خودا ئەمڕۆ گەلی ئیسلام رۆشنبیرە پڕە لە زانای پایە بەرز لەهەموو بوارەکان دا پڕە لەپسپۆڕانی لێهاتووی لێزان زانای ئاسمانیو زەمین ناسو دەریاناسی وامان هەیە پسپۆڕن لەسەر ئاستی جیهانی، ئێستا بەهۆی رادارو تەلەسکۆبو شتی تری واوە تەنێکی بچکۆلەی زۆر لەمانگ دوور ترو بچووکتر لەقوڵایی ئاسمان دا شوێنو دووریو چەندیو چۆنی دیاری دەکرێ، بەڵێ ئێستا وەك جاران نەماوە ئەمڕۆ مرۆڤ لەسەر رووی گۆی مانگ گەشتو گوزار دەکا، نموونەی بەردو چەوو خاكو خۆڵی سەرمانگی هێناوە بۆ سەر زەوی گەلێ بەئاسانی دەتوانێ سەری مانگ بە تەلەسکۆبو هۆکاری ئاسمانشوناسی نوێ دیاری بکرێ گەلێ راستترو بەهێزتر لەبینینی مانگی نوێ بەچاوی سەر




لەلایەنی چەند کەسێکی کەمەوە کە دوور نییە تەنکە هەورێ یان تارماییەکیان لێ بووبێ بەمانگی یەك شەوە.

ئەوە کە گومانی تیادا نییە هەرکاتی بە تەلەسکۆبو شتی وا چەسپا کە مانگی نوێ لەپاش نوێژی خەوتنان بەپێی کاتی مەککە لەدایك دەبێ ئەوە هەرکەسێ لافی ئەوە لێ بدا کە ئەو ئێوارەیە لەمەککە یەکسەر لەپاش خۆرئاوا بوون مانگی دیوە ئەوە درۆیەکی پەتی دەکا هۆشی ساخو بەلگەی راستو دروست بەدرۆ دەخاتەوە گەرچی قازی لەسەر شایەتیی ئەویش بڕیاری هاتنی مانگی نوێ دەربکا(*) چونکە ئەم هۆکارە تازانە لەچاو ئەو هۆکارە کۆنانەدا هەر خوایان یەکە، بەلگەیەکی بێ هەڵەی بێ فڕو فێڵن لەهەمان کاتا زۆر بەئاسانی دەتوانرێ رۆژانی رەمەزانو رۆژانی جەژنو بۆنە پیرۆزەکانی تر یەك بخرێن، لەهەموو وڵاتو نیشتمانی ئیسلام دا پێکەوە رۆژوو بگیرێ، یا جەژن بکرێ، دەتوانرێ چارەسەری ئەم پەرتیو سەرگەردانییەی ئێستا هەیە بەئاسانی بکرێ، چونکی ساڵی وا هەیە جەژن لەوڵاتێ تەواو دەبێ ئەوسا لەوڵاتێ تر دەست پێ

(*) لەیادمە جارێ قازی سوننیو قازی جەعفەریو بەڕێوەبەری (الدائرە الفلکیە) لەبەغداد، لەپێش ڕەمەزانا نەدومیەکیان گرت لەم بابەتە دووان، دوا پرسیار کە لەبەڕێوەبەری فەرمانگەی ئاسمانشوناسی کرا، کەوا دەزانم ناوی (قدامە الملاح)بوو ئەمە بوو: ئەم شەو مانگی نوێ لەدایك دەبێ یانا؟ گوتی: بەبێگومان ئەم شەو سەعات دوازدەی شەو بەکاتی بەغدا، لەفلانە وڵات لەدایك دەبێ، ئەویش واتای وایە کەمانگ بەپێی ئاسۆی عێراق، ئەم ئێوارەیە لەپێش خۆردا ئاوا دەبێ، واتە: بەهیچ شێوەیەك ئەم ئێوارەیە مانگ بەچاوی مرۆڤ لەعێراق نابینرێ، کەچی قازی بەغدادی ئەووەل کەناوی (مامۆستا عبدالقادر ئیبراهیم) بوو فەرمووی: ئێمە ئەم ئێوارەیە لەدادگای شەرعی دادەنیشین، ئەگەر شایەتی بایاخدار هاتنو شایەتییان دا کەمانگمان دیوە، بەیانی دەیکەین بەڕەمەزان، هەقمان بەسەر حیسابی فەلەکییەوە نییە، قازی جەعفەریش هەروای گوت. وەرگێڕ.

دەکا، ئەمساڵ کە ساڵی (٢٠٠٢)ی زایینییە یەکی رەمەزان لەلیبیا سێ شەممە بوو، لەزۆرینەی وڵاتە ئیسلامییەکانی تر چوار شەممە بوو، لەپاکستانو ئێران یەکی مانگ پێنج شەممە بوو!.

گەرچی ئەم وەزعە زۆرتر سیاسەتو سیاسەتمەدارەکان دروستیان کردووە بەڵام ئەگەر شەرعزانەکان لایەنگیرییان نەکەن ئەوان ناتوانن سەربەخۆ شتی وا بسەپێنن بەسەر خەڵکا.

دەی شتی وا نەدین پێی خۆشە نە هۆشی ساخ پەسەندی دەکا، نەزانست پشتگیری لێ دەکا، لە راستی دا ئەمڕۆ حیسابی فەلەکی باشترین هۆکارە بۆ ساخکردنەوەی سەری مانگ، کەواتە دەبێ بەقیاسول ئەولا، کار بەم هۆکارە نوێیە بکرێ، چونکە لەشوێنێ شەرع رێگە بدا مەبەستێ بەهۆکارێکی نزمتر ساخ ببێتەوە وەك بەچاوی بینین بێ، لەم مەسەلەی بەردەستمان دا کە هەڵدەگرێ بەهەڵە دا بچێ، دەی لە جێگەیێ کە شەرع رێگەی هۆکاری وا بدا ئیتر چۆن رێگە لە هۆکارێکی چاکتری بێ هەڵەتر دەگرێ، کەلەسەدا سەد مەبەستەکە مسۆگەر دەکا، لەهەمان کاتا جیهانی ئیسلامی لەگێژاوەی فرە جەژنیو شتی تری وا ناقۆڵا رزگاری دەبێ.

مامۆستای موحەدیثو فەرموودەزانی گەورە عەللامە شێخ ئەحمەشاکیر (رەحمەتی خودای لێ بێ) لەساڵی ١٩٣٩ دا دەفەرموێ: کارکردن بە حیسابی فەلەکی لەم سەردەمەدا رێك بەپێی دەقی سوننەتی پێغەمبەر خۆیەتی نەوەك بەپێی شتێکی تر.

وەلەسەر ئەم شێوەیە ئەم بریارە ساخ دەکاتەوە کەدەفەرموێ: بریاری چەسپاندنی سەری مانگی نوێ، بەهۆی چاوی سەرەوە عیللەتو بایستەکەی لەناو سوننەت دا بەدەق گوتراوە کەئەمەیە: (إنا أمة أمية لا نكتب ولا نحسب،

الـشهر هكـذا وهكـذا) كەبـە وردی سـەرنجی فـەرمووده سـەر بەڵگـەكانی ئـەم مەسەلەیە دەدەین ئەمـەمان بـۆ روون دەبێتـەوە بۆیـە ئێـستا ئێمـە كـار بـەدیتن بەچاو دەكەین‌و كار بەزانستی ئاسمان شوناسی ناكەین، چونكە لـەم سـەردەمەدا نەتەوەی ئیسلام گەلێكی بێ سەوادی نەخوێندەوارن، لەبەرئەوە ناتوانن بـەهۆی زانـستی ئاسمـان شوناسـیەوە هـاتنی مـانگی هـەیفی (شـەهری قەمـەری) دیـاری بكەن، دەی ئەمە بەڵگەی ئەوەیـەو واتـای وایـە: كەهـەر كاتـێ نەتـەوەی ئیـسلام رۆشنبیر بوون زاناو خوێندەواری باشیان تیا پەیـدا بـوو، كـە بتـوانن بەحیـسابی فەلەكی هاتنی مانگی نوێ بسەلمێنن ئیتر ئەو بایـستە نامێنـێ بـۆ دیـاری كردنـی سـەری مـانگ بـەهۆی بیـنین بەچـاو دەی ئـەوەتانێ سـوپاس بـۆ خـودا ئـەمڕۆ نەتەوەی ئیسلام لەزانستی ئاسمان شوناسی دا زۆر پێـشكەوتووە ئـەم زانـستەیش ئێـستا بـووە بـە زانـستێكی بـەرێزی بەسـوودی رێكـو پێـك یاسـاو دەسـتووری دامەزراوی خۆی هەیە كـە بەسـەدان ئـامێرو تاقیگـەو پـسپۆڕ كـاری تیـا دەكـەن، وەك جـاران نـەماوە كـە پیـاوی فێڵبـازو فاڵچی‌و حیـسابگرو شـتی تـری وا لافـی غەیبزانی پێوە لـێ بدەن..!.

لەڕاسـتی دا بـۆ ماوەیـەكی زۆر كـەم بەتایبـەتی لەدەوروبـەری سـەردەمی پێغەمبەر دا ئەم جۆرە گێلە پیاوانە بوو بوون بـەهۆی دابـەزین‌و پەسـتیی پلـەو پایەی ئەم زانستە مەزنە، گەرچی هـەتا ئێـستایش بنـەبڕ نـەبوون‌و هـەر رۆژەی بەناوێكەوە لەناو كۆمەڵە ساویلكەكان دا سەرهەڵ دەدەن!.

بـەڵێ، ئـەمڕۆ لەسـایەی خـوداوە رۆڵـەكانی ئیـسلام ویاربوونەتـەوە زۆر بەوردی دەتوانن بەپێی زانستی ئاسمان شوناسی‌و ئامێری فرە پێشكەوتووی تازە یەكەم چركەی سەرەتای مانگی نوێی هـەیفی هـەموو مانگـێ لەسـالا بـەبێ هەڵـە دیاری بكەن، وە ئەمە راسـتەقینەیەكی بەڵگـە نەویـستە، خـۆ لـێ‌گیلكردنی ئـەو

پەڕی گێلییە. کەواتە: بەلایەنی کەمەوە دەبێ ئێمە کار بەیەکێ لەم دوو یاسایە بکەین.

**یەکەم:** بەهۆکاری ئاسمان شوناسی یاخود بەبینینی مانگی یەك شەوە بەچاو، یان کار بەهەردوولا بکەین.

**دووەم:** ئەگەر بەپێی حیسابی فەلەکی نەدەگونجا کە مانگ بەچاو ببینرێ، دەبێ قازی شایەتی لەکەس لەم بارەیەوە وەرنەگرێ، چونکە بەلگە بەپێی شەرع کاتێ باوەڕو کاری پێ دەکرێ، کە هەستو هۆشو شەرع بەدرۆی نەخەنەوە، دەی لەباری وادا هەستو هۆش شایەتی وا پووچ دەکەنەوە.

ئیمامی سوبوکی (ت ٧٥٦هـ) کە یەکێکە لە گەورە کۆششکار (موجتەهید)ەکانی مەزهەبی شافیعی، لەفەتواکانی دا باسی ئەوە دەکا ئەگەر بەپێی حیسابی فەلەکی مەودا نەبوو بۆ بینینی مانگ، وەك ئەو ئێوارەیە لەو شوێنە مانگ لەپێش خۆردا ئاوا ببێ، ئەوە پێویستە لەسەر قازی کەشایەتی شایەتەکان وەرنەگرێ.

لەموغنی موحتاج دا ئەم گوتەی سوبوکییە ئاوا ڕاگوێز دەکات:

(لو شهد برؤية الهلال واحد أو الإثنان واقتضى الحساب عدم امكان رؤيته، قال السبكي رحمه الله تعالى لا تقبل هذه الشهادة لأن الحساب قطعي والشهادة ظنية والظني لايعارض القطعي... الخ).

واتە: ئەم شایەتییە وەرناگیرێ، چونکە حیسابی فەلەکی بەلگەیەکی بڕەری بەلگە نەویستە، بڕیارەکەی ڕاستەو بەبێگومانە، بەڵام قسەی شایەتەکان هەواڵە، هەواڵیش هەڵدەگرێ ڕاست بێ هەڵ دەگرێ درۆبێ، کەواتە لەو جۆرە بەلگانەیە کە گومانی هەڵەی لێ دەکرێ، دەی بەلگەی گومانیی چۆن بەلگەی بڕەر (دلیل قاطع) ڕەد دەکاتەوە، چ جای ئەوەی پێش ئەو بخرێ..!.

ماموٚستا شاكير دەفەرموێ: ماموٚستا شێخ مستەفای مەراغی كە شێخی زانكۆی ئەزهەری شەریف بوو كاتێ سەرۆكی دادگای باڵای شەرعی بوو، رای وەك ئیمامی سوبووكی وابوو (ڕەزای خوای لێ بێ) هەروەها دەفەرموێ: ئەم مەسەلەیە بەر ئەو یاسا ئوصولییە دامەزراوە دەكەوێ، كە بڕیار دەدا: بڕیار بە بوونو نەبوون لەگەڵ بایستەكان دا دەسووڕێ، (الحكم يدور مع العلة وجوداً وعدماً).

ماموٚستای عەینیش پاش رونكردنەوەیەكی دورو درێژ دەفەرموێ: كاتێ بۆمان هەیە لەزانستی ژمارە گەری تێ روانین كەشتەكە زۆر روونو ئاشكرا بێ یا وەك ئاشكرا وابێ...

دەی بێگومان لەم سەردەمەدا كە ساڵی (٢٠٠٢)ی زاینییە، كارەكە گەیشتۆتە پلەی بێگومانیو بەڵگە نەویست.

ماموٚستای مەلا عەبدلكەریمی مودەریسیش لەشەریعەتی ئیسلام دا دەفەرموێ: رەمەزان بەقسەی حیسابگەرو ئەستێرە ژمێر لەسەر خۆیانو لەسەر ئەوانەی كە باوەڕیان پێ دەكەن دەچەسپێ.

بڕوانە: ئەم سەرچاوانە، عمدە القارئ شرح صحيح البخاری، ج/١٠ ص/٢٨٧، شەریعەتی ئیسلام/٢٤١/١، مغنی المحتاج/٤٢١/١، كيف نتعامل مع السنه، د.قەرزاوی ص/١٤٥، فتح الباری ج/٤ ص/١٢٧).

**(٨) باب: بيان أن الدخول في الصوم يحصل بطلوع الفجر، وأن له الأكل وغيره حتى يطلع الفجر، وبيان صيفة الفجر الذى تتعلق به الأحكام من الدخول في الصوم، ودخول وقت صلاة الصبح وغير ذالك**

**ڕۆژوو دەست پێ دەکات، بە شەبەقدان، وە هەتا بەیان دەدا ڕۆژووەوان بۆی هەیە کە شت بخواو شت بخواتەوە، وە هەموو شتێکی ڕەوا بکا هەتا بەیان دەدا، وە نیشانەی ئەو شەبەقەی کە بڕیارەکانی پێ دادەمەزرێ چۆنە، وەك دەست پێکردنی ڕۆژوو، هاتنی کاتی نوێژی بەیانیو شتانی تریش**

٦٦٠- عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ لَمَّا نَزَلَتْ ( حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ ) عَمَدْتُ إِلَى عِقَالٍ أَسْوَدَ وَإِلَى عِقَالٍ أَبْيَضَ، فَجَعَلْتُهُمَا تَحْتَ وِسَادَتِي، فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ فِي اللَّيْلِ، فَلاَ يَسْتَبِينُ لِي، فَغَدَوْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَذَكَرْتُ لَهُ ذَلِكَ فَقَالَ « إِنَّمَا ذَلِكَ سَوَادُ اللَّيْلِ وَبَيَاضُ النَّهَارِ ». (الحديث ١٩١٦، طرفاه ٤٥٠٩، ٤٥١٠):[٦٦٠]

عەدی کوڕی حاتەم (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە {حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ} بخۆنو بخۆنەوە تا هێڵی ڕەشی شەو لەهێڵی سپی ڕۆژ جیادەکەنەوە. کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە چووم پەتێکی ڕەشو پەتێکی سپیم هێنا، کەبەشەو دەخەوتم لەژێر سەرینەکەما دام دەنان، کەچی هەر تەماشای ئەوم دەکرد، بەلاّم شەوم لەڕۆژ بۆ جیانەدەکرایەوە، جا ڕۆژێ چووم بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) عەرزیم کرد ئەی پێغەمبەری خودا! من کە دەخەوم ئاوا دەکەم بەلاّم هیچم بۆ دەرناکەوێ؟ ئەویش فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): مەبەست لە خەیتی ئەبیەزو خەیتی ئەسوەد لە ئایەتەکەدا تاریکی شەوو ڕوناکی ڕۆژە. (تاج/٢/٧٨ ز/٢٧ = ژمارە: ١٣٠٨ چ/٤).

---

[٦٦٠] تجرید/٢، ژمارە: ٨٨٥ = ١٩١٦. مسلم: ١٠٩٠ = ٢٥٢٨.

٦٦١- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رضى الله عنهما) قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَـذِهِ الآيَـةُ: (وَكُلُـوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْـوَدِ)، قَـالَ: فَكَـانَ الرَّجُـلُ إِذَا أَرَادَ الصَّوْمَ، رَبَطَ أَحَدُهُمْ فِي رِجْلَيْهِ الْخَيْطَ الأَسْوَدَ، وَالْخَيْطَ الأَبْـيَضَ، فَـلاَ يَـزَالُ يَأْكُـلُ وَيَشْرَبُ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُ رِئْيُهُمَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ بَعْدَ ذَلِكَ: (مِنَ الْفَجْرِ) فَعَلِمُـوا أَنَّمَـا يَعْنِـي بِذَلِكَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ. {الحديث: ٢٥٣٠ = ٢٥١٠ فم. بخارى. صوم: ١٩١٧، ٤٥١١. تحفة الأشراف: ٤٧٥٠}:

سەهلی کوڕی سـەعد (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: کاتـێ ئـەم ئایەتـە هاتە خوارەوە: { وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ – بەقـەرە/ ١٨٧} واتـە: بخـۆنو بخۆنـەوە تـا هێڵـی ڕەش لـە هێڵـی سـپی جیادەکەنەوە، کە ئەم ئایەتە لەسەر ئەم شێوەیە هاتە خوارەوە، پیاوی وا هەبوو کاتێ دەیویست بۆ بەیانی بەڕۆژووبێ، دەچوو پەتێکی سپی دەبەست بە قاچێکی خۆیـەوەو پـەتێکی ڕەشیـشی دەبەسـت بەقاچـەکەی تریـەوە، ئـیتر هەرشـتی دەخواردو شتی دەخواردەوەو بەشەوی دادەنا، هەتا شێوەو ڕەنگـی دوو پەتەکـەی لەیەکتری جیا دەکردەوە، ئەوجا دایدەنا بەڕۆژوو وازی لە خواردنو خواردنەوەو شـتی تـری وا دەهێنـا. جـا خـودای گـەورە لـەپاش ئەمـە، بـۆ ڕوونکردنـەوەی مەبەستەکە، وشەی (مِنَ الفَجْرِ) لە کۆتایی ئایەتەکەوە دابەزاندو ئایەتەکە ئاوای لێهات: { وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّى يَتَبَـيَّنَ لَكُـمُ الْخَـيْطُ الأَبْـيَضُ مِـنَ الْخَـيْطِ الأَسْوَدِ مِـنَ الْفَجْـرِ – بەقـەرە/ ١٨٧}. جـا واتـای ئایەتەکـە ئـاوا ڕوون بوویـەوە: (کاتـێ دەتانەوێ لە ڕۆژدا بەڕۆژووبن، بەشەو بخۆنو بخۆنـەوەو هەرچـی لـە ڕۆژووەوان نادروست دەبێ، لەخۆتانی نادروست مەکەن، تا ڕوشتەی سـپیدەی بـەیانیتان، لـە ڕوشتەی ڕەشی تاریکی شەو بۆجیا دەبێتەوە).

**ئەوجا موسوڵمانان زانییان کە مەبەستی ئایەتەکە جیاکردنەوەی شەوە لەرۆژ.**
**{بڕوانە: تاج/٢/٨٠، زنجیرە: ٢٧، ژمارە: ١٣٠٦، ١٣٠٨ + تەجرید/٢/٢٧٦، ژمارە: ٨٨٥ = ١٩١٦، ٤٥٠٩، ٤٥١٠ – فتح الباری}.**

**٦٦٢- عَنْ ابنْ عمَر (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِنَّ بِلَالًا يُؤَذِنُ بِلَيْلٍ فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُنَادِيَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ ثمَّ قَالَ وَكَانَ رَجُلًا أَعْمَى لَا يُنَادِي حَتَّى يُقَالَ لَهُ أَصْبَحْتَ أَصْبَحْتَ). (الحديث ٦١٧- أطرافه في: ٦٢٠، ٦٢٣، ١٩١٨، ٢٦٥٦، ٧٢٤٨):**

**ئیبنوعومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بیلال هێشتا شەوی دەمێنێ کەبانگی یەکەمی بەیانی دەدا، جالەبەرئەوە ئەگەر ویستتان لەپاش بانگی بیلالیش، هەر شت بخۆن و بخۆنەوە، تائیبنوئوممی مەکتووم بانگ دەدا ئیتر واز لەهەموو شتێ بهێنن کەڕۆژووی پێ دەشکێ). قسەگێڕەوە (ڕاوی) فەرمووی: ئیبنوئوممی مەکتووم پیاوێکی کوێر بوو، بانگی نەدەدا هەتا لەهەموولایەکەوە خەڵکەکە پێیان دەگوت: وابەیانە بانگدە. (ت/٢/٧٩/٥ ز-٢٧ ژ-١٣١٠ چ-٤ = ش).**

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

**ئیبنوئوممی مەکتووم ناوی عەبدوڵڵایە، لەموسوڵمانە پێشینەکانە پێغەمبەر زۆر ڕێزی دەگرت، زۆرجاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیکرد بەئەمیر لەسەر مەدینە، لەکاتی جێنشینی عومەردا ئامادەی جەنگی قادسییە بوو، لەوجەنگەدا شەهید بوو، ئەو کوێرەیە کەلەسورەتی عەبەسەدا باس کراوە.**

٦٦٣- عَنِ عبدالله بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ: كَانَ لِرَسُولِ اللَّـهِ مُؤَذِّنَانِ: بِلاَلٌ، وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ الأَعْمَى، فَقَالَ رَسُولُ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّ بِلاَلاً يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُؤَذِّنَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ »، قَالَ: وَلَمْ يَكُنْ بَيْنَهُمَا، إِلاَّ أَنْ يَنْزِلَ هَذَا، وَيَرْقَى هَذَا. {الحديث: ٢٥٣٣ = ٢٥١٣ فم. تجريد/٢/٣٥٦، رقم: ٣٥٨ = ٦١٧، ٦٢٠، ٦٢٣، ١٩١٨، ٢٦٥٦، ٧٢٤٨}:[٦٦٣]

ئيبنو عومەر (خودايان لىٰ رازى بىٰ) فەرمووى: جاران پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بىٰ) دوو بانگدەرى هەبوو، يەكێكيان بيلال بوو، ئەوى تريان ئيبنو ئوممى مەكتووم بوو، كە پياوێكى كوێر بوو، پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بىٰ) دەيفەرموو: (بيلال هێشتا شەوى دەمێنىٰ كە بانگى يەكەم دەدا، جا لەبەرئەوە بخۆن و بخۆنەوە تا ئيبنو ئوممى مەكتووم بانگى دووەم دەدا، فەرمووى: هەرئەوەندەشيان بەين بوو، كە ئەميان دادەبەزى و ئەويتريان سەردەكەوت). {تاج/٢/٨٤، زنجيرە: ٢٧، ژمارە: ١٣١٠ چ/٤} + {رياض/٣/١٦٦، زنجيرە: ٢٢١، ژمارە: ١٢٣١}.

٦٦٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لَا يَمْنَعَنَّ أَحَدَكُمْ أَوْ أَحَدًا مِنْكُمْ أَذانُ بِلَالٍ مِنْ سَحُورِهِ فَإِنَّهُ يُؤَذنُ أَوْ يُنَادِي بِلَيْلٍ لِيَرْجِعَ قَائِمَكُمْ وَلِيُنَبِّهَ نَائِمَكُمْ وَلَيْسَ أَنْ يَقُولَ الْفَجْرُ أَوْ الصُّبْحُ وَقَالَ بِأَصَابِعِهِ وَرَفَعَهَا إِلَى فَوْقُ وَطَأْطَأَ إِلَى أَسْفَلُ حَتَّى يَقُولَ هَكَذا بِسَبَّابَتَيْهِ إِحْدَاهُمَا فَوْقَ الْأُخْرَى ثُمَّ مَدَّهَا عَنْ يَمِينِهِ وَشِمَالِهِ). (الحديث ٦٢١– طرفاه في: ٥٢٩٨، ٧٢٤٧):[٦٦٤]

عەبدوڵڵاى كوڕى مەسعود (ڕەزاى خواى لىٰ بىٰ) دەفەرموىٰ: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بىٰ) فەرمووى: (كەستان بەبانگى بيلال واز

---

[٦٦٣] تجريد/٢، ژمارە: ٣٥٨ = ٦١٧، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٨٤ = ٢٥٣٣.

[٦٦٤] تجريد/٢، ژمارە: ٣٦٠ = ٦٢١. مسلم: ٢٥٣٦ = شيحا.

لەپارشێوکردن مەهێنن، چونکە ئەو شەوی دەمێنێ کەبانگ دەدا، مەبەستی ئەومیە شەونوێژکەرتان ئاگادار بکاتەوە کەوا بەیان نزیکە، ئەگەر دەیەوێ باسەرخەوێ بشکێنێ، یائەگەر دەیەوێ پارشێوبکا تازووە بیکا،هەروەها مەبەستی ئەومیە خەوتووتان لەخەوهەڵبستێنێ هەتا خۆی ئامادەبکا بۆبەیان، ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەنجەکانی سەرەوژوور هەڵبڕیو سەرەوخواری کردنەوە بەئاماژە نەخشەی بەیانییە درۆزنەی کێشاو فەرمووی: (شەبەقدان ئاوانییە، بەڵام شەبەقدان ئاوایە) جاهەردوو پەنجەی لەسەریەك داناو ئاماژەی پێیان کردو نەخشەی بەیانی ڕاستەقینەی کێشاو فەرمووی: (هەتا ئاوا ڕووناکی لەکەناری ئاسمانەوە، لەخۆرهەڵاتەوە بەڕاستو چەپا بڵاو دەبێتەوەو دەبێ بەرۆژی تەواو!) (ت/٢/٨٠/١ ز-٢٨ ژ-١٣١١).

## (٩) باب: فضل السحور وتأكيد إستحبابه وإستحباب تأخيره وتعجيل الفطر خێرو پاداشی پارشێو زۆر سوننەتە، وە سوننەتە دوابخرێ، وەك سوننەتە بەربانگ زوو بکرێ دوا نەخرێ

٦٦٥- عَنْ أَنَسٍ (رضی الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السُّحُورِ بَرَكَةً ». {الحديث: ٢٥٤٤ = ٢٥٢٤ فم} : [٦٦٥]

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پارشێو بکەن، چونکە پیرۆزییو پیتو فەڕ وا لەپارشێودا). {تاج/٢/٩١، زنجیرە: ٣٢، ژمارە: ١٣٢٤ ج/٤} + {ریاض/٣/١٦٥، زنجیرە: ٢٢١، ژمارە: ١٢٢٩}.

---

[٦٦٥] تجريد/٢، ژمارە: ٨٨٧ = ١٩٢٣، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٨٠ = ٢٥٤٤.

٦٦٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثابِتٍ حَدَّثَهُ أَنَّهُمْ تَسَحَّرُوا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثمَّ قَامُوا إِلَى الصَّلَاةِ قُلْتُ كَمْ بَيْنَهُمَا قَالَ قَدْرُ خَمْسِينَ أَوْ سِتِّينَ يَعْنِي آيَةً). (الحديث ٥٧٥ ـ طرفه في: ١٩٢١)[٦٦٦]:

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: زەیدی کوڕی ثابیت بۆیگێڕامەوە فەرمووی: چەندکەسێ بووین لەخزمەت پێغەمبەردا پارشێومان کردەوە ئینجا هەڵساین چووین بۆنوێژی بەیانی، گوتم: نێوانی پارشێوەکەو بانگەکە چەندێ دەبوو؟ فەرمووی: دەوری پەنجا تاشەست ئایەت دەبوو).

٦٦٧- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رضى الله عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لاَ يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الْفِطْرَ ». {الحديث: ٢٥٤٩ = ٢٥٢٩ فم. تجريد/٢/٢٨٦، رقم: ٩٠٣ = ١٩٥٧. ترمذى. صوم: ٦٩٩} :[٦٦٧]

سەهلی کوڕی سەعدی ئەل‌ساعیدی، (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (مەردوم هەتا پەلە لەبەربانگ بکەن‌و بەربانگ بە فنگا نەخەن‌و، لەکاتی خۆیدا ڕۆژوو بشکێنن، نیشانەی ئەوەیە کە هێشتا هەر باشن‌و لە ڕێگەی ڕاست لایان نەداوە).

{تاج/٢/٩٣، زنجیره: ٣٢، ژماره: ١٣٣٠ + ریاض/١٦٧/٣، زنجیره: ٢٢٢، ژماره: ١٢٣٣}.

---

[٦٦٦] تجرید/١، ژماره: ٣٣٦ = ٥٧٥. مسلم: ١٠٩٧ = ٢٥٤٧.

[٦٦٧] تجرید/٢، ژماره: ٩٠٣ = ١٩٥٧. مختصر صحیح مسلم/٢، ژماره: ٥٩٣ = ٢٥٤٩ شیحا.

## (١٠) باب: بيان وقت إنقضاء الصوم وخروج النهار
## كاتى تەواو بوونى كاتى ڕۆژوو، وە تەواو بوونى ڕۆژ

٦٦٨- عن عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ عَنْ أَبِيهِ - رضى الله عنه - قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - « إِذَا أَقْبَلَ اللَّيْلُ مِنْ هَا هُنَا ، وَأَدْبَرَ النَّهَارُ مِنْ هَا هُنَا ، وَغَرَبَتِ الشَّمْسُ ، فَقَدْ أَفْطَرَ الصَّائِمُ»: [٦٦٨]

بڕوانە: فەرموودەی ژمارە (٥٩٢)ی (مختصر صحيح مسلم/٢) كە لەدوا ئەم ژمارەيەوە دێ.

٦٦٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِى أَوْفَى (رضى الله عنهما) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِى سَفَرٍ فِى شَهْرِ رَمَضَانَ، فَلَمَّا غَابَتِ الشَّمْسُ قَالَ: « يَا فُلاَنُ انْزِلْ فَاجْدَحْ لَنَا ». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ عَلَيْكَ نَهَارًا. قَالَ: « انْزِلْ فَاجْدَحْ لَنَا ». قَالَ: فَنَزَلَ فَجَدَحَ، فَأَتَاهُ بِهِ فَشَرِبَ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم) ثُمَّ قَالَ بِيَدِهِ: « إِذَا غَابَتِ الشَّمْسُ مِنْ هَا هُنَا، وَجَاءَ اللَّيْلُ مِنْ هَا هُنَا فَقَدْ أَفْطَرَ الصَّائِمُ ». {الحديث: ٢٥٥٤ = ٢٥٣٤ فم. تجريد/٢/٢٨٠، رقم: ٨٩٤ = ١٩٤١، ١٩٥٥، ١٩٥٦، ١٩٥٨، ٥٢٩٧. أبو داود. صوم: ٢٣٥٢. تحفة الأشراف: ٢٥٥٤} : [٦٦٩]

ئەبو ئیبراهیم عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو ئەوفا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێكا، لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین، بەڕێوە بەسواری دەڕۆیشتین، دنیا ڕەمەزان بوو، حەزرەت خۆی بەڕۆژوو بوو، كە خۆر ئاوابوو حەزرەت بە پیاوێكی فەرموو: (ئەی فیسار! دابەزە لە وڵاخەكەت، قاوتو ئاومان بۆ بكەو بەكەوگیرەكە تێی ڕادە تاباش ساف ببێ).

---

[٦٦٨] بخاری. صوم: ١٩٥٤، مسلم. شیحا: ٢٥٥٣.

[٦٦٩] تجرید/٢، ژمارە: ٨٩٤ = ١٩٤١، مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٩٢ = ٢٥٥٤.

پیاوەکەیش (کە بیلال بوو) فەرمووی: ئەی پێغەمەری خودا! زووە، بابەتەواوی ببێ بە ئێوارە، خۆ ئەوە رووناکی خۆرە. حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەوە: (دابەزەو قاوتو ئاوەکەمان بۆ بگرەوە). بیلال دیسان گوتی: قوربان! هێشتا هەر رۆژە. فەرمووی: (تۆ دابەزەو قاوتو ئاومان بۆ بگرەوە). بیلالیش دابەزیو قاوتو ئاوی بۆ کردنو باش شەڵەقاندیو دای پێیان، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خواردیەوە. لەپاشا فەرمووی: (کە تەماشاتان کرد وا خۆر لێرەوە، لە رۆژئاواوە ئاوابوو، وە شەو لێرەوە لە خۆرهەڵاتەوە داهات، ئیتر کاتی بەربانگی رۆژووەوانەو با رۆژووەکەی بشکێنێ). {ریاض/١٦٩/٣، زنجیرە: ٢٢٢، ژمارە: ١٢٣٧}.

## (١١) باب: النهي عن الوصال في الصوم
## رێگریو جڵەوگیریی لە رۆژوو دانەدەم رۆژوو

٦٧٠- عَنِ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنِ الْوِصَالِ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ: فَإِنَّكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ تُوَاصِلُ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « وَأَيُّكُمْ مِثْلِي إِنِّي أَبِيتُ يُطْعِمُنِي رَبِّي وَيَسْقِينِي ». فَلَمَّا أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا عَنِ الْوِصَالِ وَاصَلَ بِهِمْ يَوْمًا ثُمَّ يَوْمًا، ثُمَّ رَأَوُا الْهِلاَلَ، فَقَالَ: « لَوْ تَأَخَّرَ الْهِلاَلُ لَزِدْتُكُمْ »، كَالْمُنَكِّلِ لَهُمْ حِينَ أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا. {الحديث: ٢٥٦١ = ٢٥٤١ فم. أبو داود. حدود: ٦٨٥١. تحفة الأشراف: ١٥٣٢١. تجريد/٢/٢٨٨، رقم: ٩٠٧ = ١٩٦٥، ١٩٦٦، ٦٨٥١، ٧٢٤٢، ٧٢٩٩}: [٦٧٠]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رێگەی نەدەدا، کە کەسێ دوو رۆژ یا زیاتر شەوو رۆژ

[٦٧٠] تجرید/٢، ژمارە: ٩٠٧ = ١٩٦٥، مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٩٥ = ٢٥٦١.

بەرۆژوو بێو لەو ماوەیەدا بەهیچ جۆرێ ڕۆژووەکەی نەشکێنێ. یاران گوتیان: ئەی پێغەمەری خودا! تۆ خۆت وادەکەی؟ فەرمووی: جا ئێوە وەك من وان، من جیام لەئێوە، من خودا فرسەتم دەداو بەشەو نانو ئاوم دەداتێ).

جا کەهەر وازیان نەهێنا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو ڕۆژ لەسەریەك نەیشکاند پێیان، تا مانگیان دیو بوو بەجەژن، جا فەرمووی: (ئەگەر مانگ نەبینرایە پترم پێ دەگرتن، وەك کەسێ بیەوێ چاو ترسێنیان بکا، تا جارێکی تر شتی وا نەکەن). {تاج/٢/١٠٧، زنجیرە: ٤١، ژمارە: ١٣٥٩. چاپی چوارەم}.

٦٧١- عن أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَنِ الْوِصَالِ فِي الصَّوْمِ فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ إِنَّكَ تُوَاصِلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ « وَأَيُّكُمْ مِثْلِي إِنِّي أَبِيتُ يُطْعِمُنِي رَبِّي وَيَسْقِينِ ». فَلَمَّا أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا عَنِ الْوِصَالِ وَاصَلَ بِهِمْ يَوْمًا ثُمَّ يَوْمًا، ثُمَّ رَأَوُا الْهِلاَلَ، فَقَالَ « لَوْ تَأَخَّرَ لَزِدْتُكُمْ ». كَالتَّنْكِيلِ لَهُمْ، حِينَ أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا. وعنه في رواية قال: إنِّي أبيتُ يطعمني ربِّي ويسقيني فاكلفوا من الأعمال ماتطيقون). (الحديث ١٩٦٥، أطرافه ١٩٦٦، ٦٨٥١، ٧٢٤٢، ٧٢٩٩): [٦٧١]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ڕێگەی نەدەدا کە کەسێ دوو ڕۆژ یا زیاتر شەوو ڕۆژ بەڕۆژوو بێو لەو ماوەیەدا بەهیچ جۆرێ ڕۆژووەکەی نەشکێنێ. هاوڕێیانی گوتیان: قوربان ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ خۆت وادەکەی؟ فەرمووی: جا ئێوە وەك من وان، من جیام لەئێوە، من خودا فرسەتم دەداو، بەشەو نانو ئاوم دەداتێ، جا کە هەروازیان نەهێنا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دوو ڕۆژ لەسەریەك

[٦٧١] لە ژمارە: (٦٧٠)دا تەخریج کرا.

نەیشکاند پێیان، هەتا مانگیان دیو بوو بەجەژن، ئیتر شکاندیان، فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): ئەگەر ئەم ئێوارەیە مانگ نەبینرایە، رۆژووی پەیوەستی پترم پێتان دەگرت، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بۆیە وایکردو وای پێگوتن، وەك كەسێ بیەوێ چاو ترسێنیان بكا تا جارێكی تر شتی وا نەكەن.

لەگێڕانەوەیەكا: دووجار فەرمووی: نەكەن رۆژوو بدەنە دەم رۆژووی تر، گوترا: تۆ خۆت وادەكەی فەرمووی: من بەشەو لەخزمەتی پەروەردگارم دا دەبم، ئەو فرسەتم دەدا نانو ئاوم دەداتێ، ئێوە كارێ بكەن كەلە تواناتانا بێ، ئیشێ بگرنە ئەستۆی خۆتان كە بۆتان بكرێ. (تاج/٢/١٠٢ = زنجیرە:٤١:، ژمارە: ١٣٥٩ - ش/د/ت).

٦٧٢- عَنْ أبي هُرَيْرَةَ - رضى الله عنه - عَنِ النَّبِىِّ - صلى الله عليه وسلم - قَالَ « إِيَّاكُمْ وَالْوِصَالَ » . مَرَّتَيْنِ قِيلَ إِنَّكَ تُوَاصِلُ . قَالَ « إِنِّى أَبِيتُ يُطْعِمُنِى رَبِّى وَيَسْقِينِ ، فَاكْلَفُوا مِنَ الْعَمَلِ مَا تُطِيقُونَ»: [٦٧٢]

وەرگەڕاوو واتاكەی لە ژمارە (٦٧٠)دا رابورد.

٦٧٣- عَنْ أَنَسٍ رضى الله عنه قَالَ وَاصَلَ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم) آخِرَ الشَّهْرِ ، وَوَاصَلَ أُنَاسٌ ، مِنَ النَّاسِ فَبَلَغَ النَّبِىَّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: « لَوْ مُدَّ بِىَ الشَّهْرُ لَوَاصَلْتُ وِصَالاً يَدَعُ الْمُتَعَمِّقُونَ تَعَمُّقَهُمْ ، إِنِّى لَسْتُ مِثْلَكُمْ ، إِنِّى أَظَلُّ يُطْعِمُنِى رَبِّى وَيَسْقِينِ»: [٦٧٣]

ئەنەسی كوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ئاخرو ئۆخری مانگەوە، چەند رۆژێ شەوو رۆژ

---

[٦٧٢] أخرجه البخارى فى (٣٠) كتاب الصوم (٤٩) باب التنكيل لمن أكثر الوصال.

[٦٧٣] بخارى: ٧٢٤١، مسلم: ٢٥٦٦ شيحا.

بەرۆژوو دەبوو، وە نەیشکاند، چەند کەسێکیش چاویان لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کردو ئەوانیش رۆژوو دانە دەم رۆژوویان ئەنجام دا، شەوی جەژن پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەمەی زانی، وە رۆژووەکەیان شکان.

ئەوجا بۆ روونکردنەوەی هەڵوێستی ئەو کەسانە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر نەبوایە بە جەژن‌و رەمەزان بەردەوام بوایە، رۆژووەکەم نەدەشکان‌و لەسەر رۆژووی شەوو رۆژ بەردەوام دەبووم، تا کەسانێ شت زۆر قووڵ دەکەنەوە، واز لەو توندڕەوییە بهێنن‌و خواپەرستی نەکەن بە بارێکی قورسی وا کە لەتاقەتیانا نەبێ!

لەم جۆرە شتانەدا چاو لەمن مەکەن، من وەك ئێوە نیم، من خودای گەورەو سەروەرم فرسەتم دەدا، نان‌و ئاوی تایبەتیم دەداتێ، لەم جۆرە کاتانەدا، کە دەبێ بەمایەی خۆگریم!!).

٦٧٤- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ نَهَى رَسُولُ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنِ الْوِصَالِ ، رَحْمَةً لَهُمْ فَقَالُوا إِنَّكَ تُوَاصِلُ . قَالَ « إِنِّى لَسْتُ كَهَيْئَتِكُمْ ، إِنِّى يُطْعِمُنِى رَبِّى وَيَسْقِينِ»: [٦٧٤]

واتاکەی بەتەواوی لەپێشەوە رابورد، بەتایبەتی لە ژمارە (٦٧٠)دا.

---

[٦٧٤] بخاری (٣٠) کتاب الصوم (٤٨) باب الوصال.

## (١٢) باب: بيان أن القبلة في الصوم ليست محرمة على من لم تُحَرِكْ شهوته بۆ ڕۆژووەوان ماچو مۆچ نادروست نییە، بە مەرجێ ئارەزووی ڕەگەزیی نەبزوێنێ!

٦٧٥- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ إِنْ كَـانَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صـلى الله عليه وسلم) لَيُقَبِّلُ بَعْضَ أَزْوَاجِهِ وَهُوَ صَائِمٌ . ثُمَّ ضَحِكَتْ): [٦٧٥]

عائیشەی هاوسـەری پێغەمبـەر (دروودی خـودا لەسـەر پێغەمبـەرو ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لەسەر هەموو هاوسەرانو هاوەڵانو شوێنکەوتوانی بێ تـا ڕۆژی دوایـی) عائیـشە فـەرمووی: گـەلێ جـار پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) بەڕۆژوو بوو، لەوکاتەدا، یەکێ لە هاوسەرەکانی خۆی ماچ دەکرد. ئەوجا عائیشە بـۆ دڵنیـایی تـەواو لـەم باسـە پێکـەنیو بـەو پێکەنینـە ئـەوەی چەسـپاند، کـە هاوسەرە ماچکراوەکە خۆی بووە.

٦٧٦- عَنْ عَائِشَةَ – رضى الله عنها – قَالَتْ كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَـلَمَ) يُقَبِّلُ وَيُبَاشِرُ، وَهُوَ صَائِمٌ، وَكَانَ أَمْلَكَكُمْ لإِرْبِـهِ. (الحـديث ١٩٢٧، طرفـه ١٩٢٨): [٦٧٦]

عائیـشە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: وادەبـوو پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەڕۆژوو دەبوو، کەچی لەگـەڵ ئەوەشـا مـاچو یـاریو دەسـبازی لەگەڵ حەڵاڵی خۆیا دەکرد. واتە: بەم جۆرە شـتانە ڕۆژوو ناشـکێ. بـەڵام کێتـان وەك پێغەمبەری پێ دەکرێ، ئەو لەهـەمووتان باشـتر ئـارەزووی خـۆی پـێ زەوت دەکـرا، وە لـەم لایەنـەوە لـەڕادە دەرنەدەچـوو، لەبـەر ئـەوە تووشـی بـێ شـەرعی نەدەبوو. (تاج/٢/١٠٣ ز/٤٢ = ژمارە: ١٣٦١ - ش/د/ت/ن).

---

[٦٧٥] بخاری فی (٣٠) کتاب الصوم (٢٤) باب القبله للصائم مسلم: ٢٥٦٨.

[٦٧٦] تجریـد/٢، ژمـارە: ٨٩٠ = ١٩٢٧ مـسلم: ١١٥٥، مختـصر صـحیح مـسلم/٢، ژمـارە: ٥٩١ = ٢٥٧١ شیحا.

## (١٣) باب: صحة صوم من طلع عليه الفجر وهو جنب
## بڕیاری ڕۆژووی کەسێ بەیانی لێ بداو لەشی پیس بێت

٦٧٧- عَنْ عَائِشَةَ وَأُمِّ سَلَمَةَ زَوْجِي النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُمَا قَالَتَا: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لَيُصْبِحُ جُنُبًا مِنْ جِمَاعٍ غَيْرِ احْتِلَامٍ فِي رَمَضَانَ، ثُمَّ يَصُومُ. {الحديث: ٢٥٨٧ = ٢٥٦٧ فـم. تجريد/٢/٢٧٨، رقم: ٨٨٩ = ١٩٢٥، ١٩٢٦، ١٩٣٠، ١٩٣١، ١٩٢٦، ١٩٣٢}: [٦٧٧]

عائیشەو ئوم سەلەمە (کە هەردوکیان هاوسەری پێغەمبەر بوون)، دەفەرموون: شەوی وا دەبوو، لە رەمەزانا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ حەلاڵو هاوسەری خۆیدا دروست دەبوو، هەتا بەیانی لێ دەدا، بەو لەش پیسییەوە دەمایەوە، ئەوسا خۆی دەشۆردو لەکاتی ئاسایی نوێژی بەیانیدا، نوێژی بەیانیی دەکرد، لەهەمان کاتا ئەو رۆژە بەرۆژوو دەبوو، مەبەستی پێغەمبەر لەم کارە بەیانی جەوازی شتی وابوو. {تاج/٢/١١٠، زنجیرە: ٤٤، ژمارە: ١٣٦٣، ١٣٦٤ + ریاض/٣/١٧٣، زنجیرە: ٢٢٤، ژ/١٢٤٤، ١٢٤٥}.

ئەبوبەکری کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی حاریثی کوڕی هیشام فەرمووی: کاتێ عەبدوڕەحمانی باوکم ئەم فەرموودەی عائیشەو ئوم سەلەمەی گێڕایەوە بۆ مەڕوان کە میری سەر مەدینە بوو، مەڕوان بە عەبدوڕەحمانی گوت: سوێندم بەخودا دەبێ بەم فەرموودەیە سەرو گوێلاکی ئەبو هورەیرە بکوتێ، کە دەڵێ: کەسێ بەلەشی پیسەوە بەیانی لێ بدا، رۆژووەکەی پووچە.

ئەبوبەکر فەرمووی: عەبدوڕەحمان ئەم گوتەی مەڕوانی بەدڵ نەبوو، بەڵام رێکەوتی خوایی وابوو، لە زولحولەیفە کۆبووینەوە، ئەبو هورەیرە لەوێ پارچەیێ زەوی هەبوو، عەبدوڕەحمان بە ئەبو هورەیرەی فەرموو: من شتێکت

---

[٦٧٧] تجرید/٢، ژمارە: ٨٨٩ = ١٩٢٥ مسلم: ٢٥٨٧ - مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٨٥.




بۆ باس دەکەم، مەڕوانی فەرمانڕەوای سەر مەدینە سوێندی داوم کە باسی بکەم بۆت، دەنا باسم نەدەکرد بۆت، ئەوجا گوتەکەی عائیشەو ئوم سەلەمەی باس کرد بۆی.

ئەبو هورەیرە فەرمووی: من کەوا دەڵێم، ئەوەم لە فەضلی کوڕی عەبباس بیستووە، دیارەکە فەزڵ خۆی باشتری لێ دەزانێ!).

## ڕوونکردنەوە:

گەرچی واباشە، مرۆڤ بەلەشی پاکەوە بچێ بەپیر ڕۆژووەوە، بەلام بە لەشپیسی، بەهەر هۆیەکەوە بێ ڕۆژوو ناشکێ، گریمان کەسێ لە شەودا لەگەڵ حەلالی خۆیدا دروست ببێ، یا شەیتانی ببێ، یا سووڕی مانگانەی تەواو ببێو خۆی نەشۆرێو بەیانی بەڕۆژوو بێ، ڕۆژووی ئەمانە هەموو دروستەو ڕۆڵی خۆی دەبینێ.

## کورتو پوخت:

بەکورتی پەتی لەشی پاک مەرجە بۆ نوێژو تەوافو شتی تری وا، مەرج نییە بۆ ڕۆژوو.

**(١٤) باب: تغليظ تحريم الجماع في نهار رمضان على الصائم، و وجوب الكفارة الكبرى فيه، وأنها تجب على الموسر والمُعسر، وتثبت في ذمة المعسر حتى يستطيع**

**دروستبوون (جيماع) له ڕۆژووی ڕەمەزانا بۆ کەسێ ڕۆژووی لەسەر بێ، زۆر زۆر حەرامو نادروستە، وە کەسێ شتی وای لێ قەوما برێتی (کەفارەت)ی قورسی لەسەرە، خۆی دەوڵەمەند بێ، یان هەژار بێ، بەلام هەژار هەرکاتێ بووی ئەوسا کەفارەتەکە دەدات**

٦٧٨- عن أبي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ بَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوسٌ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلَكْتُ. قَالَ « مَا لَكَ ». قَالَ وَقَعْتُ عَلَى امْرَأَتِي وَأَنَا صَائِمٌ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « هَلْ تَجِدُ رَقَبَةً تُعْتِقُهَا ». قَالَ لاَ. قَالَ « فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ ». قَالَ لاَ. فَقَالَ « فَهَلْ تَجِدُ إِطْعَامَ سِتِّينَ مِسْكِينًا ». قَالَ لاَ. قَالَ فَمَكَثَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَبَيْنَا نَحْنُ عَلَى ذَلِكَ أُتِيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِعَرَقٍ فِيهَا تَمْرٌ – وَالْعَرَقُ الْمِكْتَلُ – قَالَ « أَيْنَ السَّائِلُ ». فَقَالَ أَنَا. قَالَ « خُذْهَا فَتَصَدَّقْ بِهِ ». فَقَالَ الرَّجُلُ أَعَلَى أَفْقَرَ مِنِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ فَوَاللَّهِ مَا بَيْنَ لاَبَتَيْهَا – يُرِيدُ الْحَرَّتَيْنِ – أَهْلُ بَيْتٍ أَفْقَرُ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي، فَضَحِكَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى بَدَتْ أَنْيَابُهُ ثُمَّ قَالَ « أَطْعِمْهُ أَهْلَكَ ». (الحديث ١٩٣٦، أطرافه ١٩٣٧، ٢٦٠٠، ٥٣٦٨، ٦٠٨٧، ٦١٦٤، ٦٧٠٩، ٦٧١٠، ٦٧١١، ٦٨٢١): [٦٧٨]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەخزمەتی خۆشەویست دا (دروودی خوای لەسەر بێ) دانیشتبووین لەوکاتەدا پیاوێ هاتە خزمەتی، عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! فەوتاوم فەرمووی: بۆچی فەوتاوی؟ گوتی لەڕەمەزانا بەرۆژوو بووم لەگەڵ ژنەکەم دروستبووم، فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): ئایا هەتە کە بەندەیێ ئازاد بکەی، لەکەفارەتی ئەو

[٦٧٨] تجريد/٢، ژمارە: ٨٩٢ = ١٩٣٦ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٨٩ = ١١١١ = ٢٥٩٠ شيحا.

کاره ناشایستەدا کە کردوتە؟ گوتی: نەء، نیمە، فەرمووی: ئەی دەتوانی کە دوو مانگ لەسەریەك بەرۆژوو بی؟ گوتی: نەء، ناتوانم. فەرمووی: ئەی دەتوانی خواردنی ژەمێکی شەست هەژار دابینکەی‌و تێریان بکەی؟ وتی: ناتوانم. ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەشوێنی خۆی مایەوە پیاوەکەش لەخزمەتی دا دانیشت ئێمەش هەروا، هەتا زەمیلەیێ خورمایان هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کوا پرسیار کەرەکە؟ گوتی: ئەمەتام ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: ئەمە بەرە بیکە بەخێر، پیاوەکەیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کێ لەئێمە پێویستی زیاتر هەیە بەم زەمیلە خورمایە، هەتا پێی بدەم! دەسا بەو خودایە لەم پەڕی مەدینەوە هەتا ئەو پەڕی مەدینە خێزانێ شك نابەم کە لەخێزانەکەی من هەژار تربێ‌و وەکوو خێزانەکەی من پێویستی بەم خورمایە بێ! جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وەها پێکەنی تەنانەت ددانەپێشینەکانی دەرکەوت، ئینجا فەرمووی: دەبڕۆ ئەم خورمایە دەرخواردی خێزانەکەی خۆت بدە. (تاج/٢/١٠٠ ز/٣٩ = ژمارە: ١٣٥٤ - ش/د/ت/ن).

ئەمە دەقی گێڕانەوەی ژمارە (٨٩٢)ی تەجریدی بوخارییە، گەرچی کەمێ جیاوازی هەیە لەگەڵ دەقی کتێبەکە. گێڕانەوەکەی (اللؤلؤ والمرجان) لە سەرەتاکەیەوە ئاوایە:

(فقال: إِنَّ الأَخِرَ وَقَعَ عَلَى امْرَأَتِهِ فِي رَمَضَان) واتە: منی قوڕەی هۆزەکەی خۆم، بەرۆژوو بووم لە ڕەمەزانا رۆیشتمە لای ژنەکەم؟.....تاد).

٦٧٩- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) أَنَّهَا قَالَتْ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: احْتَرَقْتُ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لِمَ؟ ». قَالَ: وَطِئْتُ امْرَأَتِي فِي رَمَضَانَ نَهَارًا، قَالَ: « تَصَدَّقْ تَصَدَّقْ ». قَالَ: مَا عِنْدِي

شَيْءٌ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَجْلِسَ فَجَاءَهُ عَرَقَانِ فِيهِمَا طَعَامٌ، فَأَمَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ يَتَصَدَّقَ بِهِ. {الحديث: ٢٥٩٦ = ٢٥٧٦ فم. بخاري: ١٩٣٥، ٦٨٢٢ فتح. أبو داود. صوم: ٢٣٩٤}: [٦٧٩]

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هات بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: قوربان! ئاگری دۆزەخ سووتاندمی؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (چۆن؟ بۆچی؟). گوتی: دروست بووم لەگەڵ ژنەکەما لە ڕەمەزانا، لە ڕۆژدا، فەرمووی: (دەی خێربکە، دەی خێربکە). پیاوەکە گوتی: هیچم نییە تابیکەم بەخێر، جا پێغەمبەر فەرمانی پێکرد کە لەلای دابنیشێ، جا دوو زەمیلە خۆراکیان هێنا بۆ پێغەمبەر، پێغەمبەر ئەو دوو زەمیلە خۆراکەی دا بەپیاوەکەو پێی فەرموو کە بیکا بەخێر لە کەفارەتا).

## ١٥) باب: جواز الصوم والفطر في شهر رمضان للمسافر في غير معصية إذا كان سفره مرحلتين فأكثر

## بۆ ڕێبوار لە مانگی ڕەمەزانا، خۆی سەرپشکە دەتوانێ بەڕۆژوو بێ، یان بەڕۆژوو نەبێ بەڵام بەم دوو مەرجە:

## یەکەم: سەفەرەکەی حەڵاڵ بێ

## دووەم: سەفەرەکەی لە دوو قۆناغ کەمتر نەبێ

٦٨٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ: سَافَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي رَمَضَانَ فَصَامَ حَتَّى بَلَغَ عُسْفَانَ ثُمَّ دَعَا بِإِنَاءٍ فِيهِ شَرَابٌ فَشَرِبَهُ نَهَارًا، لِيَرَاهُ النَّاسُ، ثُمَّ أَفْطَرَ حَتَّى دَخَلَ مَكَّةَ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَصَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله

---

[٦٧٩] مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٩٠ - ٢٥٩٦. بخاری: ١٩٣٥.

عليه وسلم) وَأَفْطَرَ، مَنْ شَاءَ صَامَ، وَمَنْ شَاءَ أَفْطَرَ. {الحديث: ٢٦٠٣ = ٢٥٨٣ فـم. بخاري. صوم: ١٩٤٨، ٢٤٠٤، نسائي. صيام: ٢٢٩٠ تحفة الأشراف: ٥٧٤٩} : [٦٨٠]

ئيبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە رەمەزانا سەفەری کرد، لە رێگە بەرۆژوو بوو هەتا گەیشتە عوسفان، کەسیی‌و شەش میل دوورە لە مەککەوە، لەوێ داوای جامێ ئاوی کرد، لە رۆژدا بە بەرچاوی خەڵکەکەوە خواردیەوەو رۆژووەکەی شکاند، ئیتر پێغەمبەر لە رێگە بەرۆژوو نەبوو هەتا گەیشتە مەککە، کە گەیشتینە مەککە، رەمەزانی مابوو، ئیبنو عەبباس دەیگوت: پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) وابووە لە سەفەردا بەرۆژوو بووە، وە وابووە بەرۆژوو نەبووە، جا کەوابوو لەسەفەردا ئەوەی حەزدەکا ئەوا با بەرۆژوو بێ، وە ئەوەیشی کە حەزناکا ئەوا با بەرۆژوو نەبێ). {تاج/٢/١١٣، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ١٣٧٤}.

٦٨١- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ – رضى الله عنهما – قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِي سَفَرٍ، فَرَأَى زِحَامًا، وَرَجُلاً قَدْ ظُلِّلَ عَلَيْهِ، فَقَالَ « مَا هَذَا ». فَقَالُوا صَائِمٌ. فَقَالَ « لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصَّوْمُ فِي السَّفَرِ ». (الحديث ١٩٤٦): [٦٨١]

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ لە ڕێبوارییەکا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەدەوری پیاوێ قەرەباڵغییەکی دی، کە سێبەری بۆ کرابوو فەرمووی: ئەم جەنجاڵییە چییە؟ گوتیان ڕۆژووەوانە، ناوی ئەبو ئیسرائیلە، بەڕۆژووە، لەگەرماو لە توونیانا

---

[٦٨٠] مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٢٦٠٣. بخاري: ١٩٤٨.

[٦٨١] تجريد/٢، ژمارە: ٨٩٨ = ١٩٤٦. مسلم: ١١١٥، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٩٨ = ٢٦٠٧.




لەهۆش خۆی چووە، فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): رۆژوو لەسەفەردا کارێکی نا باشە. (تاج/٢/١٠٨ ز/٤٦ ف/٣+١+٢+٤+٥+٦، ژمارە: ١٣٧٦، چ/٤).

**راڤەو شیکردنەوە:**

**کورتو پوخت،** بەکوردی پەتی لەسەفەردا بۆ کەسێ بتوانێ بەرۆژوو بێ رۆژوو باشترە بۆی، بۆ کەسێ پێی سەخڵەت بێ، بەرۆژوو نەبێ باشترە بۆی.

٦٨٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ كُنَّا نُسَافِرُ مَعَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَلَمْ يَعِبِ الصَّائِمُ عَلَى الْمُفْطِرِ ، وَلاَ الْمُفْطِرُ عَلَى الصَّائِمِ): [٦٨٢]

لەباتی ئەم فەرموودەیە، ئەم گێڕانەوەی ئیمامی موسلیم راگوێز دەکەین چونکە دەبێ بە راڤەو روونکردنەوە بۆی:

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضى الله عنه) قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لِسِتَّ عَشْرَةَ مَضَتْ مِنْ رَمَضَانَ، فَمِنَّا مَنْ صَامَ، وَمِنَّا مَنْ أَفْطَرَ، فَلَمْ يَعِبِ الصَّائِمُ عَلَى الْمُفْطِرِ، وَلاَ الْمُفْطِرُ عَلَى الصَّائِمِ. {الحديث: ٢٦١٠ = ٢٥٩٠ فم} :

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: شازدەی رەمەزان بوو، لە خزمەت پێغەمبەر خۆیدا چووین بۆ غەزا، هەمان بوو بەرۆژوو بوو، هەمان بوو بەرۆژوو نەبوو، جا نە رۆژووەوان نەنگو عەیبی لە رۆژوو شکێن دەگرت، لەسەر ئەوە کە لەسەفەرا بەرۆژ نییە، وە نە رۆژوو شکێن نەنگی لە بەرۆژوو دەگرت، لەسەر ئەوە کە بەرۆژووە). {تاج/٢/١١٤، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ١٣٧٥ چ/٤} .

---

[٦٨٢] تجريد/٢، ژمارە: ٨٩٩ = ١٩٤٧ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٥٩٩ = ١١١٥ = ٢٦١٠ شيحا.

## (١٦) باب: أجر المفطر في السفر إذا تولى العمل

## لەسەفەردا ڕێبوار ئەگەر بەڕۆژوو نەبێ، پاداشی گەورە بۆ ئەوە، بەمەرجێ كاری پێویست ئەنجام بدا

٦٨٣- عَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنـه) قَـالَ: كُنَّـا مَـعَ النَّبِـيِّ (صـلى الله عليـه وسلم) فِى السَّفَرِ، فَمِنَّا الصَّائِمُ، وَمِنَّا الْمُفْطِرُ، قَالَ: فَنَزَلْنَا مَنْزِلاً فِى يَوْمٍ حَارٍّ، أَكْثَرُنَـا ظِـلاًّ صَـاحِبُ الْكِسَاءِ، وَمِنَّـا مَـنْ يَتَّقِـى الـشَّمْسَ بِيَـدِهِ، قَـالَ: فَـسَقَطَ الـصُّوَّامُ وَقَـامَ الْمُفْطِرُونَ، فَضَرَبُوا الأَبْنِيَةَ وَسَقَوُا الرِّكَابَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسـلم): « ذَهَبَ الْمُفْطِرُونَ الْيَوْمَ بِالأَجْرِ ». {الحديث: ٢٦١٧ = ٢٥٩٧ فم. تجريد/٢/٣١٦، رقـم: ١١٩٠ = ٢٨٩٠. نسائي. صيام: ٢٢٨٢. تحفة الأشراف: ١٦٠٧} : [٦٨٣]

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەسـەفەرێكا، لـە خزمـەت پێغەمبەردا بووین، ڕۆژەكەی زۆر گـەرم بـوو، گەیـشتینە شوێنێ سێبەر نـەبوو، لەوێ لاماندا، ئەوەمان سێبەری گەورەی هەبوو، كە عەبای پێبوو، لەباتی چاتۆڵ دەیكـرد بـە سـێبەر بـۆ خـۆی! هەمان بـوو دەسـتی دەدایـە بەرتیـشكی خۆرەكـە، ئەوانەشی كەلەو ڕەوتەنییەدا، بەڕۆژوو بوون هیچ خزمەتێكیان پێ نەكراو لاڵو پـاڵ پاڵكـەوتن، بـەڵام بـە پێـچەوانەوە ئەوانـەی كـە بـەڕۆژوو نـەبوون، هـەموو كارەكان ئەوان كردیان، دەوارو چادرەكانیان هەڵدا، وڵاخـەكانیان بـرد بـۆ لـەوەڕو بۆسەر ئاو، دەستیان كرد بە خزمەت كردنو نانو ئاویان بۆ ئامادەكردین.

پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) كـە حاڵەكـەی بینـی، فـەرمووی: (پاداشی هەرە گەورە، ئەمڕۆ، ئەوانە بردیان بۆ خۆیـان كـە بـەڕۆژوو نـەبوون!). {تاج/٢/١٤٥، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ١٣٧٧} .

---

[٦٨٣] تجریـد/٣، ژمـارە: ١١٩٠ = ٢٨٩٠ مـسلم: ١١١٩ مختـصر صـحیح مـسلم/٢، ژمـارە: ٦٠٠ = ٢٦١٧ شیحا.

## (١٧) باب: التخيير في الصوم والفطر في السفر
## ڕێبوار لە ڕەوتەنی (سەفەر)دا خۆی سەرپشکە لە نێوانی ڕۆژووگرتنو ڕۆژوو شکاندندا

٦٨٤- عَنْ عَائِشَةَ – رضى الله عنها – زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّ حَمْزَةَ بْنَ عَمْرٍو الأَسْلَمِيَّ قَالَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَأَصُومُ فِي السَّفَرِ وَكَانَ كَثِيرَ الصِّيَامِ. فَقَالَ « إِنْ شِئْتَ فَصُمْ، وَإِنْ شِئْتَ فَأَفْطِرْ ». (الحديث ١٩٤٣): [٦٨٤]

عائیشە هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خوا لەپێغەمبەرو ڕەزای خودا لەعائیشەی هاوسەری بێ) فەرمووی: حەمزەی کوڕی ئەسلەمی پیاوێ بوو زۆر بەڕۆژوو دەبوو، عەرزی حەزرەتی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! لە سەفەردا بەڕۆژوو بم یانا؟ فەرمووی: ئارەزووی خۆتە، حەزدەکەی بەڕۆژوو بە، حەزدەکەی بەڕۆژوو مەبە.

ئەمەیش دەقی ئەم فەرموودەیە لەژمارە (٦٠٢)ی موختەصەری موسلیمدا:

عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَمْرٍو الأَسْلَمِيِّ (رضى الله عنه) أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَجِدُ بِي قُوَّةً عَلَى الصِّيَامِ فِي السَّفَرِ فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « هِيَ رُخْصَةٌ مِنَ اللَّهِ، فَمَنْ أَخَذَ بِهَا فَحَسَنٌ وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَصُومَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ ». {الحديث: ٢٦٢٤ = ٢٦٠٤ فم}:

حەمزەی کوڕی عەمری ئەل‌ئەسلەمی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوتم: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! من تەواناى بەڕۆژوو بوونم هەیە لەسەفەردا، جا ئایا ئەگەر لەسەفەردا بەڕۆژوو ببم گوناهم دەگا؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ڕۆژوو شکاندن لەسەفەردا، مۆڵەتو روخصەتو ڕێپێدانێکە لەخوداوە، هەرکەسێ کار بەو مۆڵەتەی خودا بکا ئەوە

[٦٨٤] تجريد/٢، زمارە: ٨٩٥ = ١٩٤٣. مسلم: ١١٢١ مختصر صحيح مسلم/٢، زمارە: ٦٠٢.

كـارێ بـاش دەكـاو شـتێ جـوانی كـردووەو بەخـشش‌و خـەڵاتی خـودای رەت نەكردۆتەوە، بەڵام ئەگەر كەسێ لەسەفەردا، حەزبكا بـەڕۆژووبێ، هـیچ گونـاهی لەسەر نییە).

**روونكردنەوە:**

حەمزەی كوڕی عەمری ئەسلەمی، هاوەڵی پێغەمبـەر، بـە خـەڵكی حیجاز دائەنرێ، ساڵ دوازدە مانگە بـەڕۆژوو بـوو، خـەڵكی مەدینـە فـەرموودەكانی ئـەو دەگێڕنەوە، لە تەمەنی حەفتاو یەك، یا لە تەمەنی هەشتا، ساڵێدا، لـە شەسـت‌و یەكی كۆچیدا، مردووە، (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

٦٨٥- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ خَرَجْنَا مَـعَ النَّبِـيِّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ) فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ فِي يَوْمٍ حَارٍّ حَتَّى يَضَعَ الرَّجُلُ يَدَهُ عَلَى رَأْسِهِ مِنْ شِدَّةِ الْحَـرِّ، وَمَا فِينَا صَائِمٌ إِلاَّ مَا كَانَ مِنَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ) وَابْـنِ رَوَاحَـةَ. (الحـديث ١٩٤٥):

ئـەبو دەرداء (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: لەخزمـەتی پێغەمبـەردا لەمانگی رەمەزانا دەچووین بۆ سەفەرێ، رۆژەكەی زۆر گەرم بوو، تەنانەت پیـاو لەتاو گەرما بەدەستی سێبەری بۆسەری دەكرد ئێمە هـەموو بـەڕۆژوو نـەبووین، بێجگە لەپێغەمبەرو عەبدوڵڵای كوڕی رەواحە.

## (١٨) باب: إستحباب الفطر للحاج بعرفات يوم عرفة

## ڕۆژووی عارفەی جەژنی قوربان، بۆ کەسێ خەریکی حەجکردن بێ، کە پێی دەگوترێ: نۆمینەی حاجیان، ڕۆژوو شکاندن خێرترە

٦٨٦- عَنْ أُمِ الفَضْلِ رَضِي اللّهُ عَنْها قالَتْ: شَكَّ النَّاسُ يَوْمَ عَرَفَةَ في صَوْمِ النبي صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَبَعَثْتُ إلى النَّبي صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِشرابٍ فَشَرِبَهُ).
(الحديث ١٦٥٨ – اطرافه في: ١٦٦١، ١٩٨٨، ٥٦٠٤، ٥٦١٨، ٥٦٣٦):[٦٨٦]

ئوممول فەضل (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی عارفە، کەڕۆژی نۆهەمی مانگی قوربانە، کەحاجیان لەو ڕۆژەدا لەچیای عەرەفە سەرگەرمی ئەنجامدانی کردارەکانی حەجن، مەردومەکە کەوتنە گومانەوە کە ئایا پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لەم ڕۆژەدا بەڕۆژوە یانا؟ جا منیش جامێ شیرم بۆی نارد، تابزانین بەڕۆژووە یا نا، جا حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- شیرەکەی خواردەوە، ئیتر زانیمان کە بەڕۆژوو نییە). (بڕ: تاج/١٣٤/٢ ز/٦٦ = ژمارە: ١٤٣٩ ش/د/ت).

ئوممول فەضل، ناوی لوبابەی کچی حاریثە، لەپێش کۆچ دا ئیسلام بووە، فەرموودەی زۆری لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (چوار خوشکە مسوڵمانەکە: مەیموونەی کچی حاریثو ئوممول فەضلو سەلماو ئەسماء). مەیموونەیان هاوسەری پێغەمبەر بوو، کەخوشکی هەقی ئوممول فەضلە. جارێ خەوێ دەبینێ، دەیگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەر، عەرزی دەکا: قوربان! لەخەونمدا بینیم ئەندامێ لەئەندامەکانی تۆ لەماڵی مندا بوو، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (فاطیمەی کچم کوڕێکی دەبێ، تۆ شیری پێ دەدەی، زۆری پێنەچوو حوسەین لەدایک بوو).

---

[٦٨٦] تجريد/٢، ژمارە: ٧٨٨ = ١٦٦١، مسلم: ١١٢٣ = ٢٦٢٧.

گەلێ جار پێغەمبەر بۆ ڕێزلێنانی دەچوو بۆ ماڵی ئومموفەضلی ئامۆژنی.

ئومموفەضل لەپێش ئیمامی عەباسی مێردیدا لە سەردەمی جێنشینی عوسماندا دەمرێ. ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێبێ.

٦٨٧- حديث مَيْمُونَةَ (رضى الله عنها) أَنَّ النَّاسَ شَكُّوا فِي صِيَامِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) يَوْمَ عَرَفَةَ ، فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ بِحِلاَبٍ وَهْوَ وَاقِفٌ فِي الْمَوْقِفِ ، فَشَرِبَ مِنْهُ ، وَالنَّاسُ يَنْظُرُونَ: (٦٨٧)

ئیبنو عەبباس فەرمووی: مەیموونەی پوورم (ڕەزای خودا لەهەموویان بێ) فەرمووی: لە حەجی ماڵاواییدا، لەڕۆژی وەستان لەچیای عەرەفەدا، کە ڕۆژی نۆی مانگی قوربانە، خەڵکەکە نەیاندەزانی کە ئایا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەڕۆژووە یان نا، لەوکاتەدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە وێستگا (موقف) وەستابوو، لەکاسەیەکی شیر دۆشیندا، هەندێ شیرم بۆی نارد، لەبەرئەوەی کە بەڕۆژوو نەبوو لەشیرەکەی خواردەوە خەڵکەکەیش چاویان لێی بوو، زانییان کە بەڕۆژوو نییە).

## (١٩) باب: صوم يوم عاشوراء

## ڕۆژووی دەی مانگی موحەررەم، کە ناسراوە بە ڕۆژووی عاشوراء

٦٨٨- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها): أَنَّ قُرَيْشًا كَانَتْ تَصُومُ عَاشُورَاءَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، ثُمَّ أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِصِيَامِهِ حَتَّى فُرِضَ رَمَضَانُ،

(٦٨٧) بخاري. صوم: ١٩٨٩، مسلم: ٢٦٣١ شيحا.

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ شَاءَ فَلْيَصُمْهُ، وَمَنْ شَاءَ فَلْيُفْطِرْهُ ».
{الحديث: ٢٦٣٦ = ٢٦١٦، تجريد/٢/٢٩٩، رقم: ٩١٩ = ٢٠٠٢ فتح} : [٦٨٨]

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموی: جاران قورەیش لەسەردەمی نەزانیدا، ڕۆژووی ڕۆژی عاشووڕایان دەگرت، وە پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) هەر لەو سەردەمەدا، چاوی لەوان دەکردو دەیگرت، کاتێ هاتیش بۆ مەدینە هەردەیگرتو فەرمانیشی دەکرد بەگرتنی، جا کە خودا ڕۆژووی ڕەمەزانی دانا لەسەر موسوڵمانان، ئیتر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وازی لەڕۆژووی ڕۆژی عاشوورا هێنا، جا ئێستا ئاوایە: کەسێ حەزکا دەیگرێ، وە کەسێ حەزکا نایگرێ). {تاج/٢/١٣٣، زنجیرە: ٦٠، ژمارە: ١٤١٧ + تجرید/٢/١٩١، ژمارە: ٧٦٤ = ١٥٩٢} .

ئەمە گێڕانەوەی بوخاری بوو، ئەمەیش گێڕانەوەی موسلیم:

عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانُوا يَصُومُونَ عَاشُورَاءَ قَبْلَ أَنْ يُفْرَضَ رَمَضَانُ، وَكَانَ يَوْماً تُسْتَرُ فِيهِ الكَعْبَة، فَلَمَّا فَرَضَ اللَّهُ رَمَضَانَ قَالَ رسولُ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ شَاءَ أَنْ يَصُومَهُ فَلْيَصُمْهُ، وَمَنْ شَاءَ أَنْ يَتْرُكَهُ فَلْيَتْرُكْهُ) (الحديث ١٥٩٢– أطرافه في: ١٨٩٣، ٢٠٠١، ٢٠٠٢، ٣٨٣١، ٤٥٠٢، ٤٥٠٤):

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: جاران هۆزی قورەیش لەسەردەمی نەزانیدا ڕۆژووی ڕۆژی عاشورایان دەگرت، کەدەی مانگی موحەڕڕەمە، قورەیش لە سەردەمی نەزانیدا، هەموو ساڵێ لە دەی موحەررەما بەرگی نوێیان بۆ کەعبە دەکردو بەرگە کۆنەکەیان دەگۆڕی، پێغەمبەریش -درودی خوای لەسەر بێ- چاوی لەوان دەکردو ڕۆژووی عاشوورای دەیگرتو کاتێ هاتیش بۆ مەدینە هەر دەیگرتو، فەرمانیشی بەمسوڵمانان دەکرد بەگرتنی. جاکاتێ خودای گەورە

---

[٦٨٨] بخاری، صوم: ١٨٩٣، مسلم: ٣٦٣٦ شیحا.

ڕۆژوی مانگی ڕەمەزانی دانا لەسەر مسولْمانان، ئیتر پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- خۆی وازی لەگرتنی ڕۆژووی ڕۆژی عاشورا هێنا، وە بەخەڵکەکەی فەرموو: (هەرکەسێ دمیەوێ بابیگرێ، وە هەرکەسێ حەزدەکا باوازی لێبهێنێو ئیتر نەیگرێ).(تاج/٢/١٢٤، زنجیرە: ٦٠، ژمارە: ١٤١٧ ش/د/ت).

٦٨٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) قَالَ: كَانَ عَاشُورَاءُ يَصُومُهُ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ ، فَلَمَّا نَزَلَ رَمَضَانُ قَالَ « مَنْ شَاءَ صَامَهُ ، وَمَنْ شَاءَ لَمْ يَصُمْهُ».

لەژمارە (٦٨٨)دا رابورد.

٦٩٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ دَخَلَ عَلَيْهِ الأَشْعَثُ وَهْوَ يَطْعَمُ فَقَالَ الْيَوْمُ عَاشُورَاءُ . فَقَالَ كَانَ يُصَامُ قَبْلَ أَنْ يَنْزِلَ رَمَضَانُ ، فَلَمَّا نَزَلَ رَمَضَانُ تُرِكَ ، فَادْنُ فَكُلْ. [٦٩٠]

ئەشعەث (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) چوو بۆ دیْنی عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود، روانی وانان دەخوات، ئیبنو مەسعوود بە ئەشعەثی کوڕی قەیسی فەرموو: ئەی باوکی موحەممەد! فەرموو لەگەڵما نان بخۆ! ئەشعەث لەوەلاما فەرمووی: من بەڕۆژووم، تۆ چۆن بەڕۆژوو نیت، ئەی ئەمڕۆ رۆژی عاشوراء نییە، کە موسوڵمان تیایا بەڕۆژوو دەبن؟

ئیبنو مەسعوود فەرمووی: راستە وایە، ئەمە بەر لەپێویستبوونی رۆژووی مانگی رەمەزان وابوو، بەلاَم کاتێ رۆژووی رەمەزان فەرزبوو بەدەقی دابەزینی ئایەتی قورئان، ئیتر وازهێنرا لە گرتنی رۆژووی رۆژی عاشووراء، جا ئەگەر بەڕۆژوو نیت وەرەپێشەوە لەگەڵما نان بخۆ).

---

[٦٩٠] بخاری، صوم: ٤٥٠٣، مسلم. شیحا: ٢٦٤٣، ٢٦٤٤، ٢٦٤٥، ٢٦٤٦.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەشعەثی کوڕی قەیسی کینـدی، هـاوەڵێکی نـاوداری پێغەمبـەرە (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەوبێ) ناوی دایکی کەبشەی کچی زەیـدە، کاتێ نوێنەرەکانی هۆزی کینده هـاتن بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) لەساڵی دەی کۆچیدا، ئەشعەث سەرۆکیان بوو، نزیکەی شەست سـوار بوون، هـەموویان موسـوڵمان بـوون، لەسـەردەمی نەفامیـدا ئەشـعەث سـەرۆکێکی قسە ڕۆیـشتوو بـوو، هۆزەکـەی لـە فـەرمانی دەرنەدەچـوو، هـەروا لەسـەردەمی ئیسلامیش‌دا، بەڵام جێگەی داخە کە لەپاش مەرگی پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لەگـەڵ هۆزەکەیـدا، لـە ئیـسلام هەڵگەڕانـەوە، هـەتا لەسـەردەمی جێگەنـشینی ئەبوبـەکری صـەدیقا بەیەخـسیری هێنایـان بـۆلای ئەبوبـەکری صـەدیق. ئەبوبـەکر دەسـتیکرد بـە سەرزەنـشتیو یەکـە یەکـە کـارە خراپـەکانی دایەوە بەچاویداو پێی دەگوت: ئەمەت کردو ئەوەت کـرد، ئـەویش هـەر وەڵامـی ئـەوی دەدایـەوە، هـەتا ئەشـعەث بـە ئەبوبـەکری فـەرموو: (تـۆ لەبەرئـەوەی کـە سـەرۆکی موسـوڵمانانی، جـەنگـو شـەڕو شـۆڕی زۆرت وا لەپێـشەوە، مـەمکوژە هەڵمگرە بۆ ئەو جەنگانەی خۆت، وە بۆ دروستبوونی متمانەو دڵنیایی لەنێوانی مـنو تـۆدا، خۆشـکێکی خۆشـتم لێ مـارە بکـە، ئەبوبـەکریش بـەگوێی کـرد، هـەم بەخشی، هـەم خوشـکی خـۆیی لێ مـارەکرد، کـە خوشـکەکەی نـاوی ئـوم فـەروەی کچی ئەبو قوحافە بوو، منداڵێکی لە ئەشعەث بـوو نـاوی نـا موحەممـەد، لـەوەدوا بە ئوم فەروەیان دەگوت: دایکی موحەممەد.

کاتـێ پێـشەوا عومـەری کـوڕی خـەتاب بـوو بەجێنـشین، ئەشـعەث لەگـەڵ جـەنگاوەرانی هۆزەکـەیدا لەگـەڵ سـوپاکەی سـەعدی کـوڕی ئـەبو وەققـاص‌دا

هاوبەشییان کرد لە نەبەردەکانی قادسییەدا، لەعێراق‌و لە مەدائین‌و لە جەلەولاو لە نەهاوەند.

لە کووفە خانوویەکی شایستەی دروست کردو تیادانیشت، وە لەساڵی (٤٢) چل‌و دووی کۆچی لە کووفە، بە مردنی خودا دەمرێ‌و حەسەنی کوڕی عەلی نوێژی تەرمی لەسەردەکا.

٦٩١- عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّهُ سَمِعَ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ (رضي الله عنهما) يَوْمَ عَاشُورَاءَ عَامَ حَجَّ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ يَا أَهْلَ الْمَدِينَةِ ، أَيْنَ عُلَمَاؤُكُمْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « هَذَا يَوْمُ عَاشُورَاءَ ، وَلَمْ يُكْتَبْ الله عَلَيْكُمْ صِيَامُهُ ، وَأَنَا صَائِمٌ ، فَمَنْ شَاءَ فَلْيَصُمْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيُفْطِرْ»: [٦٩١]

حەمیدی کوڕی عەبدوررەحمان فەرمووی: ئەو ساڵەی کە مەعاوییە چوو بۆ حەج، گوێم لێی بوو، لە رۆژی عاشوورادا، لەسەر دوانگەکە دەیفەرموو: (ئەی خەڵکی مەدینە! ئەوە کوا زاناکانتان لەکوێن؟ بۆچی سەبارەت بە گرتنی رۆژووی ئەم رۆژی عاشوورایە، قسەی روون‌و ئاشکراتان بۆ ناکەن؟ دەی من بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست، دەیفەرموو: (ئەم رۆژووی رۆژی عاشوورایە، دەی مانگی موحەررەمە، خودا رۆژووی ئەم رۆژەی لەسەر ئێوە فەرزو پێویست نەکردووە).

موعاوییە فەرمووی: هەروا پێغەمبەر (درورودی خودای لەسەر بێ) لەو فەرمایشتەدا فەرمووی: (بەڵام من خۆم بەرۆژووم، جا خۆتان سەرپشکن، هەرکەسێ حەزدەکا بەرۆژوو بێ‌و رۆژووی رۆژی عاشوراء بگرێ، هەرکەسێکیش ئارەزوو ناکا، با ئەم رۆژە نەگرێ‌و بەرۆژوو نەبێ!).

---

[٦٩١] بخاری، صوم: ٢٠٠٣، مسلم: ٢٦٤٨.

٦٩٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَدِمَ الْمَدِينَةَ، فَوَجَدَ الْيَهُودَ صِيَامًا يَوْمَ عَاشُورَاءَ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَا هَذَا الْيَوْمُ الَّذِى تَصُومُونَهُ؟ ». فَقَالُوا: هَذَا يَوْمٌ عَظِيمٌ أَنْجَى اللَّهُ فِيهِ مُوسَى وَقَوْمَهُ، وَغَرَّقَ فِرْعَوْنَ وَقَوْمَهُ فَصَامَهُ مُوسَى شُكْرًا، فَنَحْنُ نَصُومُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « فَنَحْنُ أَحَقُّ وَأَوْلَى بِمُوسَى مِنْكُمْ ». فَصَامَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ. {الحديث: ٢٦٥٣ = ٢٦٣٣ فم. تجريد/٢/٢٩٩، رقم: ٩٢٠ = ٢٠٠٤، ٣٣٩٧، ٣٩٤٣، ٤٦٨٠، ٤٧٣٧} :[٦٩٢]

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەهات بۆ مەدینە، لەوێ جوولەکەی لێ بوو، کاتێ مانگی موحەڕەم هات، تەماشای کرد کەوا جوولەکەکان دەی موحەڕەم بەڕۆژوو دەبن، فەرمووی: (ئەم ڕۆژووە هی چییە کەوا دەیگرن؟) گوتیان: ئەمڕۆ ڕۆژێ زۆر گەورەو باشە، ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە خودای گەورە مووساو هۆزەکەیی، تیادا ڕزگار کردووە لەدەستی فیرعەونی دوشمنیانو فیرعەونی تیا لەدەریادا خنکان وە مووسا لەم ڕۆژەدا، سوپاس بۆ خودا، لەسەر نیعمەتی ڕزگاربوون لەدەستی دوژمن، بەڕۆژوو بووە، وە ئێمەیش چاو لەو دەکەینو ئەمڕۆژە بەڕۆژوو دەبین، حەزرەتیش (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ بەمەی زانی فەرمووی: (کەوابێ بۆ من ڕەواترە کە لەمەدا پەیڕەوی مووسا بکەم هەتا ئێوە). جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەم خۆی گرتیو هەم فەرمانی کرد بە موسوڵمانان کە ئەم ڕۆژە بەڕۆژووبن). {تاج/٢/١٣٣، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ١٤١٧ ج/٤}.

---

[٦٩٢] تجرید/٢، ژمارە: ٩٢٠ = ٢٠٠٤، مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٦١٣ = ١١٣٠ = ٢٦٥٣ شیحا.

**ڕوونكردنەوە:**

١- پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەمانگی مەولوددا كەپێی دەگوترێ ڕەبیعول ئەووەل، لە سەفەری كۆچدا گەیشتە مەدینە، كاتێ مانگی موحەڕەم دێو دەبێ بەڕۆژی عاشوورا، دەبینێ جوولەكەكان ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو دەبن و ئەو پرسیارو وەڵامە ڕوودەدا كە لە فەرموودەكەدا ڕابورد.

٢- هەندێ دەفەرموون: جوولەكەكان بەپێی ساڵی هەتاوی بەڕۆژوو بوون، بۆیە كە پێغەمبەر دەگاتە مەدینە ئەوان بەڕۆژوو بوون، بەڵام ئەمە دوورە.

٦٩٣– عَنْ أَبِي مُوسَى (رضى الله عنه) قَالَ: كَانَ يَوْمُ عَاشُورَاءَ تَعُدُّهُ الْيَهُودُ عِيدًا ، قَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): «فَصُومُوهُ أَنْتُمْ »: [٦٩٣]

ئەبو مووسای ئەشعەری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جولەكەكان ڕۆژی دەی موحەڕڕەم كە ناسراوە بە عاشووراء، دەیانكرد بە جەژن، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەی ئێوە لەم ڕۆژەدا بەڕۆژوو بن!).

٦٩٤- عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي يَزِيدَ سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) وَسُئِلَ عَنْ صِيَامِ يَوْمِ عَاشُورَاءَ، فَقَالَ: مَا عَلِمْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) صَامَ يَوْمًا يَطْلُبُ فَضْلَهُ عَلَى الأَيَّامِ، إِلاَّ هَذَا الْيَوْمَ، وَلاَ شَهْرًا إِلاَّ هَذَا الشَّهْرَ. يَعْنِي رَمَضَانَ. {الحديث: ٢٦٥٧ = ٢٦٣٧ فم. بخاري. صوم: ٢٠٠٦. نسائي. صيام: ٢٣٧٢} : [٦٩٤]

عوبەیدی كوڕی ئەبو یەزید (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: گوێم لە ئیبنو عەبباس بوو، لێیان پرسی، لەبارەی گرتنی ڕۆژووی ڕۆژی عاشووراوە. فەرمووی: نەمدیوە كە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) مشووری ڕۆژووی هیچ ڕۆژێ بخوا، كە بە گەورەتری دابنێ لە ڕۆژانی تر، جگە لەم ڕۆژە كە ڕۆژی

---

[٦٩٣] بخاري، صوم: ٢٠٠٥، مسلم: ٢٦٥٥، ٢٦٥٦ شیحا.

[٦٩٤] بخاري: صوم: ٢٠٠٦، مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٦١٤ = ٢٦٥٧ شیحا.

عاشوورایه، وه بێجگه لەم مانگه که مانگی رەمەزانـه). {تـاج/١/١٣٥، زنجیرە: ٦٠، ژمارە: ١٤٢٢}.

### (٢١) باب: من أكل في عاشوراء فليكف بقية يومه
### کەسێ لە ڕۆژی عاشورادا بە ڕۆژوو نەبووە، با کە ئەم فەرمانەی پێ دەگا، با ئیتر بەڕۆژوو بێ

٦٩٥- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعَثَ رَجُلاً يُنَادِي فِي النَّاسِ، يَوْمَ عَاشُورَاءَ « أَنْ مَنْ أَكَلَ فَلْيُتِمَّ أَوْ فَلْيَصُمْ، وَمَنْ لَمْ يَأْكُلْ فَلاَ يَأْكُلْ ». (الحديث ١٩٢٤، طرفاه ٢٠٠٧، ٧٢٦٥ ): [٦٩٥]

سەلەمەی کوڕی ئـەکوع (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی لەبـەیانی ڕۆژی عاشورادا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی کرد بە پیاوێ لـەهۆزی ئەسـلەم، کـە بەمـەردوم دا ئـەم بانگـەوازە هـەڵ بـداو پەخـشەوە بکـا، ئـەی موسـوڵمانینە! ئـەوەی کـە ئـەمڕۆ شـتی خـواردووە، بـا ئـیتر لەبیـستنی ئـەم بانگەوازەوە شت نـەخواو ماوەی ئـەمڕۆ تـا ئێـوارێ بـەرۆژوو بـێ، وەئـەوەی کـە ئەمڕۆ تا ئێستا شتی نەخواردوە با تائێوارێ شت نـەخواو بـەڕۆژوو بـێ، چونکە ئـەمڕۆ ڕۆژی عاشـورایە، ڕۆژووکـەی سـوننەتێکی گەورەیـە. (تـاج/٢/١٣٦ ز/٦٠ = ژمارە: ١٤٢٠ + ریاض/٣/٩٢٤ ز/٢٢٧).

### ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئـەم فەرموودەیـە پێنجـەم فەرموودەیـە لـە فـەرموودە سـێ کەسـییەکانی صەحیحی بوخاری کـە ژمارەیـان (٢٣) فەرموودەیـە، ڕشـتە (سـند)ەکـەی ئاوایـە:

---

[٦٩٥] تجرید/٢، ژمارە: ٨٨٨ = ١٩٢٤، مسلم: ١١٣٥، محمد فؤاد = ٢٦٦٣ شیحا.

(حدثنا أوبو عاصم-١، عَنْ زيد بن أبي عبيد-٢، عَنْ سلمة بن الأكوع-٣) كه يەكەمی ئەم (٢٣) فەرموودەيە فەرموودەی ژمارە (٩٠) لە تەجريدا، وا لە لەبەرگی يەكەما، كە ژمارەی (١٠٩)يە لەفەتحول باری دا، ئاخر فەرموودەی سيانی ژمارە: ٧٤٢١ لەفەتحولباريدا وا لە (كتاب التوحيد)دا فەرموودەی چوارەم لە (باب: وكان عرشه على الماء).

٦٩٦- عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ بْنِ عَفْرَاءَ قَالَتْ: أَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) غَدَاةَ عَاشُورَاءَ إِلَى قُرَى الأَنْصَارِ الَّتِي حَوْلَ الْمَدِينَةِ: « مَنْ كَانَ أَصْبَحَ صَائِمًا فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، وَمَنْ كَانَ أَصْبَحَ مُفْطِرًا فَلْيُتِمَّ بَقِيَّةَ يَوْمِهِ ». فَكُنَّا بَعْدَ ذَلِكَ نَصُومُهُ وَنُصَوِّمُ صِبْيَانَنَا الصِّغَارَ مِنْهُمْ إِنْ شَاءَ اللَّهُ وَنَذْهَبُ إِلَى الْمَسْجِدِ فَنَجْعَلُ لَهُمُ اللُّعْبَةَ مِنَ الْعِهْنِ، فَإِذَا بَكَى أَحَدُهُمْ عَلَى الطَّعَامِ أَعْطَيْنَاهَا إِيَّاهُ عِنْدَ الإِفْطَارِ. {الحديث: ٢٦٦٤ = ٢٦٤٣ فـم. تجريد/٢/٢٨٧، رقم: ٩٠٥ = ١٩٦٠. تحفة الأشراف: ١٥٨٣٣}:[٦٩٦]

روبەييعی كچی موعەززيذی كوڕی عەفراء (خوای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەر لەبەيانی رۆژی عاشوورا، پەيامی نارد بۆ گوندەكانی ياريدەدەران (أنصار) كە لە دەوروبەری شاری مەدينە بوون، فەرمووی: (هەركەسێ ئەمڕۆ بەڕۆژووە، با نەيشكێنێ تا ئێوارێ، وە هەركەسێ ئەمڕۆ بەڕۆژوو نييە با ماوەی ئەمڕۆ بەڕۆژووبێ، ئيتر لەوەدوا دەستوورمان وابوو، ئەو رۆژە بەڕۆژوو دەبووين، تەنانەت بە منداڵی بچكۆلەی خۆشمان دەگرت، بەوانەيان كە خودا لەچارەی نووسيبوون، وە دەچووين بۆ مزگەوت و ياريلۆكە (لوعبة)مان لەخوری رەنگاو رەنگ دروست دەكرد بۆيان، جا كە

[٦٩٦] تجريد/٢، ژمارە: ٩٠٥ = ١٩٦٠، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٦١٥ = ٢٦٦٤ شيحا.

دەگریان بۆنانو ئاو بەوە ژیرمان دەکردنەوە، هەتا کاتی بەربانگ). {تاج/٢/١٣٤، زنجیره: ٦٠، ژمارە: ١٤٢١} ..

**روونکردنەوە:**

ئـەوەوی دەفـەرموێ: لـەلای ئیبنـو عـەباس رۆژی عاشـوورا نـۆی مـانگی موحەررەمە، بەڵام ئەم رایـە لاوازە، بـەڵکوو رای بـەهێز فەرمایـشتی جـەماوەری زانایانە، کە دەفەرموون: رۆژی عاشوورا دەی موحەررەمە. {بڕوانـە: تـاج/٢/١٣٢، زنجـیرە: ٥٩، ژمـارە: ١٤١٥، ١٤١٦} . {بـۆ ژیننامـەی روبـەییعی کـچی مومعـەوویز بڕوانە پاش فەرموودەی ژمارە: ٦١٦ لە مختصر صحیح مسلمدا} .

**روونکردنەوە:**

روبەییعی کچی موعەوویز (رەزای خودای لێ بێ) یەکێکە لەو ژنانـەی کـە هـاوەڵو سەحابەی پێغەمبەر بوون، ژنێکی بەڕێزی ناودارە، ئەنصارییە، بەنی نەجارییە، واتە: لەهۆزی خاڵوانی پێغەمبـەر. موعـەوویز دەفـەرموێ: کەچووم بـە بـووکی، بەیانی شەوی بووکێنیم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆ دێنیم، یەکێکە لەو ژنانەی کە لەژێر درەختی بەیعەتوڕیزواندا پەیمانی بەست لەگەڵ پێغەمبەرداو، خودا بە ئایەتی قورئان پەسنی ئەوانی کرد کە دەفەرموێ: {لَقَدْ رَضِيَ اللَّـهُ عَـنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الـشَّجَرَةِ – فـتح/١٨} ئامـادەی هەنـدێ لە غـەزاکانی پێغەمبەر بووە، خۆی دەفەرموێ: لـە خزمـەت پێغەمبـەردا دەچووین بـۆ غـەزا، ئێمـەی ژنـان، لـە غـەزادا ئیـشمان ئـەوەبوو، ئاومـان دەدا بـە جـەنگاوەرەکان، خزمـەتمان دەکـردنو شـەهیدو زامارمـان دەگواسـتەوە، بـۆ مەدینـە، جـارێ پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) میوانی بوو، کاتێ دەسـتنوێژی گـرت، روبـەییع خـۆی ئاوی دەستنوێژەکەی دەکـرد بـە دەسـتیدا، ئیبنـو عـەبباس بەتایبـەتی چـوو بـۆ

خزمەتی، تا چۆنێتی ئەو دەستنوێژەی پێغەمبەری بۆ باس بکا. لە صەحیحی بوخاریدا سێ فەرموودەی هەیە، ئەبو عوبەیدەی کوڕی موحەممەد دەڵێ: عەرزی خاتوو روبەییعم کرد: چۆنێتیی شێوەی پێغەمبەرم بۆ باس بکە؟ فەرمووی: (خۆرێکی هەڵاتوو بوو بۆ خۆی!).

## (٢٢) باب: النهى عن صوم يوم الفطر ويوم الأضحى

## پێشگیریی لە ڕۆژووی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانو ڕۆژووی جەژنی قوربان

٦٩٧- عَنْ أَبِى عُبَيْدٍ مَوْلَى ابْنِ أَزْهَرَ قَالَ: شَهِدْتُ الْعِيدَ مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، فَجَاءَ فَصَلَّى، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَخَطَبَ النَّاسَ فَقَالَ: إِنَّ هَذَيْنِ يَوْمَانِ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ صِيَامِهِمَا: يَوْمُ فِطْرِكُمْ مِنْ صِيَامِكُمْ، وَالآخَرُ يَوْمٌ تَأْكُلُونَ فِيهِ مِنْ نُسُكِكُمْ. {الحديث: ٢٦٦٦ = ٢٦٤٦. تجريد/٥، لاپەڕە: ١٣٦، رقم: ١٨٣٩ = ٥٥٧١، ١٩٩٠. أبو داود. صوم: ٢٤١٦. ترمذى. صوم: ٧٧١. تحفة الأشراف: ١٠٦٦٣، ١٠٣٣٠}: [٦٩٧]

زوهری (رەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەبو عوبەیدی ئازادکراوی ئیبنو ئەزهەر، بۆیگێڕامەوە، فەرمووی: لەکاتی جێنشینی ئیمامی عومەردا، لە خزمەتیدا، ئامادەی کردنی نوێژی جەژنی قوربان بووم، لەپێش وتار خوێندنەوەدا نوێژی جەژنی بۆمان کرد، ئەوجا وتاری داو فەرمووی: ئەی موسوڵمانینە! پێغەمبەری خودا، (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیریی کردووە لە گرتنی ڕۆژووی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانو ڕۆژی جەژنی قوربان، چونکە یەکەمیان ڕۆژی جەژنی ڕۆژوو شکاندنە، ئەوی تریشیان ڕۆژی جەژنی

[٦٩٧] تجريد/٥، ژمارە: ١٨٣٩ = ٥٥٧١، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٦٢٢ = ٢٦٦٦ شيحا.

خـواردنی قوربانیەکانتانـە). {بڕوانـە: تـاج/٢، لاپـەڕە: ١٢٧، زنجـیرە: ٥٣، ژمـارە: ١٤٠٢}.

٦٩٨- عن أبي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ (رضى الله عنه) يُحَدِّثُ بِأَرْبَعٍ عَـنِ النَّبِـيِّ (صـلى الله عليه وسلم) قَالَ: «وَلاَ صَوْمَ فِي يَوْمَيْنِ الْفِطْرِ وَالأَضْحَى»: [٦٩٨]

لە ژمارە (٦٩٧)دا واتاکەی بەتەواوی رابورد.

٦٩٩– حديث ابن عمر (رضى الله عنهما) قَالَ جَاءَ رَجُلٌ إِلَى ابْنِ عُمَرَ (رضـى الله عنهما) فَقَالَ رَجُلٌ نَذَرَ أَنْ يَصُومَ يَوْمًا ، قَالَ أَظُنُّهُ قَالَ الاِثْنَيْنِ ، فَوَافَقَ يَـوْمَ عِيـدٍ . فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ أَمَرَ اللَّهُ بِوَفَاءِ النَّذْرِ ، وَنَهَى النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ صَوْمِ هَذَا الْيَوْمِ): [٦٩٩]

زیـادی کـوڕی جوبـەیر (ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پیـاوێ هـات بۆلای ئیبنو عومەر (ڕەزای خـودای لێ بـێ)، گـوتی: مـن ئـاهم کـردووە کـە ڕۆژی دوو شەممە بەڕۆژووبم، بەڵام ڕۆژی دووشـەم ڕێکـەوتی ڕۆژی قوربـان یـان ڕۆژی جەژنی رەمەزان بوو، ئایا چیبکەم؟

ئیبنـو عومـەر فـەرمووی: (خـودا لـە قورئانـا فـەرمان دەکـا بـە جێبـەجێ کردنی ئاهو نەزر، پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ڕێگـری دەکـا لـە ڕۆژووی ڕۆژی جەژن، لەبەرئەوە من وەڵامم نییە بۆ ئەم پرسیارەی تۆ).

---

[٦٩٨] بخاری. صوم: ١٩٩١، مسلم: ٢٦٦٩ شیحا.

[٦٩٩] بخاری. صوم: ١٩٩٤، ٧٦٠٦، مسلم: ٢٦٧٠، شیحا = تخریج وترقیم شیخ خلیل مـأمون شـیحا لصحیح مسلم.

**ڕوونکردنەوە:**

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتو سۆزو میهرەبانی خودای گەورەو مەزنی لێ بێ) دەفەرموێ: بەکۆی دەنگ ڕۆژووی هەردوو جەژنەکان، کە بریتین لە پێنج ڕۆژ، ڕۆژی یەکەمی جەژنی ڕەمەزانو چوار ڕۆژەی جەژنی قوربان، بەکۆی دەنگ ڕۆژی ئەم پێنج ڕۆژەیە دروست نییە.

بەڵام بۆ پرسی ئەم پیاوە ڕاجیایی هەیە، هەندێ دەڵێن: نە دەیگرێ، نە قەزای دەکاتەوە، هەندێکیش دەفەرموون نابێ بەڕۆژوو بێ، بەڵام دروستە قەزای بکاتەوە، نەوەوی دەفەرموێ: وەڵامەکەی ئیبنو عەبباس بۆنی قسەی دووهەمی لێ دێ، کەبۆی هەیە بیگێڕێتەوە.

### (٢٤) باب: كراهة صيام الجمعة منفرداً
### گرتنی ڕۆژووی هەینی یا شەممە، بەتەنها باش نییەو ناپەسەندە

٧٠٠- عَنْ محمد بن عباد قال: سألتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) وَهُوَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ أَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- عَنْ صِيَامِ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَقَالَ نَعَمْ. (الحديث ٢٧٣٧): [(٧٠٠)]

موحەممەدی کوڕی عەباد (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا خەریکی تەوافی بەیت بوو، لێیم پرسی (ڕەزای خوای لێ بێ) ئایا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نەهی دەکرد لەگرتنی ڕۆژووی ڕۆژی هەینی بەتەنها؟ فەرمووی: بەڵێ، مەگەر لەپێشیەوە، یا لەپاشیەوە ڕۆژووی تری لەگەڵ دا بگرێ. (تاج/٢/١٢١ ز/٥٦).

---

[(٧٠٠)] تجريد/٢، ژمارە: ٩١٥ - ٢٧٣٧، مسلم: ٢٦٧٦، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٦٢٥ - ٢٦٧٨ شيحا.

عَنْ جُوَيْرِيَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ – رضى الله عنها – أَنَّ النَّبِىَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دَخَلَ عَلَيْهَا يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَهْىَ صَائِمَةٌ فَقَالَ « أَصُمْتِ أَمْسِ ». قَالَتْ لاَ. قَالَ « تُرِيدِينَ أَنْ تَصُومِى غَدًا ». قَالَتْ لاَ. قَالَ « فَأَفْطِرِى ». (الحديث ١٩٨٦)[٣٢٦].

جوویرییەی کچی حاریث کە هاوسەری پێغەمبەر بوو (ڕەزای خودا لە هەموو هاوسەرە پاکیزەکانی بێ) فەرمووی: ڕۆژی هەینی بوو بەڕۆژوو بووم، ڕۆژووی سوننەت، پێغەمبەر هات بۆلام، فەرمووی: دوێنێ بەڕۆژوو بووی؟ گوتم: نەء، فەرمووی: باشە دەتەوێ لەگەڵ ئەمڕۆدا سبەی بەڕۆژوو بی؟ گوتم: نەء، فەرمووی: کەوایە ڕۆژووەکەت بشکێنە.

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

١- لەفیقهی ئاسانا، لەزنجیرەی:١٤٧ ل/٣٣٧ بەرگی/١ لەسەر باسی (ڕۆژووی ناباش-الصوم المكروه)دا دەفەرموێ: دوو ڕۆژووی ساڵ دوانزە مانگە ناباشە، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەروێ: ڕۆژووی ئەو کەسە گیرا نەبێ کە ساڵ دوانزە مانگە بەڕۆژوو دەبێ!. ڕۆژووی ڕۆژی هەینیش بەتەنیا ناباشە، ئەگەر بەنیازی ڕۆژووی سوننەت بێ. هەروەها ڕۆژووی شەممەیش بەتەنیا خۆی ناباشە، هەروەها گرتنی ڕۆژووی ڕۆژی یەك شەممەیش ناباشە.

٢- جوویریەی کچی حاریث، هاوسەری پێغەمبەر یەکێکە لەدایکانی باوەڕداران، لەهۆزی بەنی موصطلیق، لەپێشدا ناوی (بەررە)بوو، کە پێغەمبەر مارەی کرد ناوەکەی گۆڕیو ناوی نا (جوومیرییە)، حاریثی باوکی ئاغای هۆزی بەنی موصطلیق بوو. کۆمەڵێ فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە لەبەر کردووە،

---

[٣٢٦] قال العسقلاني في خاتمة كتاب الصوم لم يوافقه مسلم على تخريج حديث جوريرة في صوم يوم الجمعة. (المترجم).

لەبوخاریو موسلیم دا لەچەند شوێنو بۆنەیەکدا ناوی هاتووە، تەنیا ئەم فەرموودەیەی نێرەی هەیە لەبوخاری دا کە خۆی گێڕابێتییەوە لەپێغەمبەرەوە، لەسەر فەرمایشتی شێخی عەینی، ئافرەتێکی یادکاری زمانپاراو بەیادی خوا بوو، جاری وا دەبوو کە نوێژی بەیانی دەکرد لەسەر جێگە نوێژەکەی دادەنیشت، کۆمەڵێ ناوکەخورما یا بەردە وردەی لەبەردەمی خۆی دا دادەنا، هەتا چێشتەنگاوێکی درەنگ، لەباتی تەزبیح ویردو تەسبیحاتی پێیان دەژمارد ساڵی (٥٦)ی کۆچی کۆچی دوایی کردووە (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ) بۆ زانیاری زیاتر فەرموو بڕوانە ئەم سەرچاوانە:

(تاج/١/٣٢٠ ز/١٠٨ ف/٧ + تاج/٢ ل/٣١٠ ز/١٤٩ + تاج/٣/٣٨ ز/١٨ + تاج/٥ ز/٣٥ + تاج/٨/٢٢٦ ز/٩٢ + تاج/٩/١٦٤ ف/٣، ٤ + عەینی/١١ ل/١٠٦ + فتح الباری/٤ ل/٢٣٢، فەرموودەی ز/١٩٨٤ + الإصابة في تمييز الصحابة/٤ ل/٢٥٦ ز/٢٥١ + الإستيعاب في معرفة الأصحاب/٤ ل/٢٥٨ جويرية + تاج/١ ل/٢١٧ + تاج/٢ ل/٢٠٢ + تاج/٢ ل/٢٧٢ + تاج/٥ ل/١٠١ + صحيحی مسلم/١٧ ل/٤٤ + صەحیحی مسلم/١٠/١٤٠-١٤٥ + عینی/١١/٢٨٧ + عینی/١٧ ل/٣٠٤ + عینی/١٧ ل/٣١٤ + عینی/١٣/٩٥).

٧٠١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ يَصُمْ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ إِلاَّ أَنْ يَصُومَ قَبْلَهُ أَوْ يَصُومَ بَعْدَهُ ». {الحديث: ٢٦٧٨ = ٢٦٥٨ فم. تجريد/٢/٢٩٧، رقم: ٩١٥، ٩١٦ = ١٩٨٤، ١٩٨٦ فتح}:[٧٠١]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەس لەئێوە بەتایبەتی ڕۆژووی ڕۆژی هەینی بەتەنیا نەگرێ، مەگەر لەپێشیەوە یا لەپاشیەوە، ڕۆژێکی تری لەگەڵدا بگرێ).
{تاج/٢/١٢٩، زنجیرە: ٥٦، ژمارە: ١٤٠٨}.

[٧٠١] تجريد/٢، ژمارە: ٩١٥ = ٢٧٣٧، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٦٢٥ = ٢٦٧٨ شیحا.

عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لاَ تَخْتَصُّوا لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ بِقِيَامٍ مِنْ بَيْنِ اللَّيَالِى، وَلاَ تَخُصُّوا يَوْمَ الْجُمُعَةِ بِصِيَامٍ مِنْ بَيْنِ الأَيَّامِ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ فِى صَوْمٍ يَصُومُهُ أَحَدُكُمْ ». {الحديث: ٢٦٧٩ = ٢٦٥٩ فم} :

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەتایبەتی بەتەنیا شەوی هەینی هەڵ مەسن بۆ شەو نوێژ، هەروا بەتایبەتی رۆژووی رۆژی هەینی، لەناو رۆژانی هەفتەدا، بەتەنیا مەگرن، مەگەر وارێ بکەوێ کە سەرەی رۆژووی خۆی بێ، وەك رۆژ نارۆژێ بەرۆژووبێ، یا نەزرێکی کردبێ، ئەوە قەیناکا).

## (٢٥) باب: بيان نسخ قوله تعالى: ﴿وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ﴾ بِقَوْلِهِ: ﴿فَمَنْ شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾

## ئایەتی ﴿وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ﴾ بە ئایەتی ﴿فَمَنْ شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾ نەسخ بۆتەوە

٧٠٢- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ (رضى الله عنه) قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: (وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ) كَانَ مَنْ أَرَادَ أَنْ يُفْطِرَ وَيَفْتَدِىَ، حَتَّى نَزَلَتِ الآيَةُ الَّتِى بَعْدَهَا فَنَسَخَتْهَا. {الحديث: ٢٦٨٠ = ٢٦٦٠ فم. بخارى. تفسير: ٤٥٠٧. أبو داود. صوم: ٢٣١٥. ترمذى. صوم: ٧٩٨} : [٧٠٢]

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ} بەپێی ئەم ئایەتە موسوڵمان خۆی سەرپشك بوو لەنێوانی ئەم دوو شتەدا: یا بەرۆژوو بێ، یا بەرۆژوو نەبێ و تۆڵە (کەفارەت) بدا، بەڵام ئایەتەکەی پاشی کەهات، ئەمەی

---

[٧٠٢] بخاری. تفسیر: ٤٥٠٧، مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٦٠٧ = ٢٦٨٠ شیحا.

نەسخ كـردەوە، چـونكە فـەرمانی كـرد بـەگرتنی ڕۆژوو، وەك دەفـەرموێ: {فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ}.

## (٢٦) باب: قضاء رمضان في شعبان
## گێڕانەوەی ڕۆژووی ڕەمەزان لە مانگی كوڵەمانگا

٧٠٣- عَنْ أَبِى سَلَمَةَ قَالَ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ (رضى الله عنهـا) تَقُـولُ: كَـانَ يَكُـونُ عَلَىَّ الصَّوْمُ مِنْ رَمَضَانَ فَمَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَقْضِيَهُ إِلاَّ فِى شَعْبَانَ، الشُّغْلُ مِنْ رَسُولِ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم) أَوْ بِرَسُولِ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسـلم). {الحـديث: ٢٦٨٢ = ٢٦٦٢ فم. بخاري. صوم: ١٩٥٠. أبو داود. صوم: ٢٣٩٩. نسائى. صيام: ٢٣١٨}: [٧٠٣]

یەحیای كوڕی سـەعید فـەرمووی: ئـەبو سـەلەمەی كوڕی عەبـدوڕەحمان فەرمووی: لـە عائیـشەی هاوسـەری پێغەمبـەرم بیـست دەیفـەرموو: بـە سـەرینی پێغەمبـەر خـوای (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ئێمـەی هاوسـەرانی پێغەمبـەر، هەندێكمان لەبەر بێنوێژیی، یا زەیستانی، بـەڕۆژوو نـەدەبووین، لەبەرئەوەیـشی كە لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین نەمان دەتوانی بیگرینـەوە، هـەتا كوڵـە مـانگ (شەعبان) دەهات. {تاج/٢/١١٨، زنجیرە: ٤٨، ژمارە: ١٣٨٤}.

[٧٠٣] بخاری. صوم: ١٩٥٠، مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٦٠٤ - ٢٦٨٢ شیحا.

## (٢٧) باب: قضاء الصيام عن الميت
## گێڕانەوەی ڕۆژووی فەوتاو بۆ مردوو

٧٠٤- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ ». {الحديث: ٢٦٨٧ = ٢٦٦٧ فم. تجريد/٢/٢٨٥، رقم: ٩٠٠ = ١٩٥٢. أبو داود. صوم: ٢٤٠٠ تحفة الأشراف: ١٦٣٨٢}: (٧٠٤)

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەری خۆشەویست و ئازیز، دەفەرموێ: (کەسێ بمرێ و ڕۆژووی لەسەر بێ، کەسوکاری دەتوانن لەباتی ئەو بەڕۆژوو بن و بۆی بگێڕنەوە). {تاج/٢/١١٩، زنجیرە: ٤٩، ژمارە: ١٣٨٦}.

٧٠٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أُمِّى مَاتَتْ، وَعَلَيْهَا صَوْمُ شَهْرٍ، أَفَأَقْضِيهِ عَنْهَا قَالَ « نَعَمْ - قَالَ - فَدَيْنُ اللَّهِ أَحَقُّ أَنْ يُقْضَى ». (الحديث ١٩٥٣): (٧٠٥)

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! دایکم مردووە وەڕۆژووی مانگێکی لەسەرە، دەبێ کەمن خۆم بۆی بگێڕمەوە لەجیاتی خۆی؟ فەرمووی: (دروودی خوای لەسەر بێ) بەڵێ دەبێ.

ئەوجا خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) بەپیاوەکەی فەرموو: پێم بڵێ ئەگەر دایکت قەرزاری کەسێ بێ وە تۆ ئەو قەرزەی بۆ بدەیتەوە، ئایا ئەوە برێتی قەرزەکەی دەکەوێ یا نا؟ گوتی: بەڵێ، برێتی دەکەوێ، فەرمووی

---

(٧٠٤) بخاری. تفسیر: ٤٥٠٧، مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٦٠٥ = ٢٦٨٧ شیحا.

(٧٠٥) تجرید/٢، ژمارە: ٩٠١ = ١٩٥٣، بخاری. مسلم: ١١٤٨، محمد فؤاد = ٢٦٨٨ شیحا.

(دروودی خـوای لەسـەر بـێ): کەواتـە دانـەوەی قـەرزی خـودا ڕەواتـرە کـە بدرێتەوە!. (تاج/٢/١١١ ز/٤٩ — ژمارە: ١٣٨٧).

## (٢٩) باب: حفظ اللسان للصائم

## ڕۆژووەوان زمانی خۆی دەگرێو دەیپارێزێ لە قسەی ناڕەواو هیچو پوچ

٧٠٦- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ « الصِّيَامُ جُنَّةٌ، فَلاَ يَرْفُثْ وَلاَ يَجْهَلْ، وَإِنِ امْـرُؤٌ قَاتَلَـهُ أَوْ شَـاتَمَهُ فَلْيَقُـلْ إِنِّـى صَـائِمٌ. مَرَّتَيْنِ، وَالَّذِى نَفْسِي بِيَدِهِ لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللّٰهِ تَعَالَى مِنْ رِيحِ الْمِـسْكِ، يَتْرُكُ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ وَشَهْوَتَهُ مِنْ أَجْلِي، الصِّيَامُ لِي، وَأَنَا أَجْـزِى بِـهِ، وَالْحَـسَنَةُ بِعَـشْرِ أَمْثَالِهَا ». (الحديث ١٨٩٤، أطرافه ١٩٠٤، ٥٩٢٧، ٧٤٩٢، ٧٥٣٨): [٧٠٦]

ئـەبوهورەیرە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: خـودای گـەورە لەفەرموودەیـەکی قودسـیدا دەفەرموێ: هەموو کردەوەیـەکی ئـادەمیزاد بـۆ خۆیـەتیو بەشـی دنیـایی خـۆیی پێوە هەیـە، بێجگـە لـەڕۆژوو بـەڵام ڕۆژوو سـاخ بـۆ منـە، لەبـەر ئـەوە مـن خـۆم پاداشـی دەدەمـەوە، وە ڕۆژوو قەڵغانـەو مـەردوم دەگێڕێتـەوە لەخراپـەو دەبـێ بەحەساری ئاگری دۆزەخ! جا هەر ڕۆژێ بەڕۆژوو بوون قسەی پڕوو پوچو شاتە شات مەکەن، ئەگەر یەکێکیش جنێوی پێدان، یـا شـەڕی پـێ فرۆشـتن بڵێن مـن بابایـەکی بـەڕۆژووم شـەڕە جمـێنو شـەڕکردن بـۆ مـن نـەهاتووە بـەزمانی بەڕۆژووەوە دەمی خۆم چەپەڵ ناکەم!.

بەوکەسەی کە گیانی منی بەدەستە بـۆنی بـەڵخی دەمـی ڕۆژووەوان لـەلای خـودا لـەبۆنی میـسك خۆشـترە. ڕۆژووەوان لەبـەر خـاتری مـن واز لـە خـواردنو

[٧٠٦] تجرید/٢، ژمارە: ٨٧١ = بخاری: ١٨٩٤، مسلم: ١١٥١، ترقیم محمد فؤاد عبدالباقی.

خواردنەوەو لەهەموو ئارەزووی خۆی دەهێنــێ، هـەموو کردەوەیـەکی ئـادەمیزاد چـەند قـات پاداشـی دەدرێتـەوە، چـاکەیش یـەك بەدەیـە، هـەتا یـەك بەحـەوت سـەدیش هەیـە، بـەڵکوو زیـاتریش. (تـاج/٢/٦٩ ز/٣٦ ف/١ = ژمـارە: ١٢٩٨+ ریـاض الصالحین/٣/٩٠٦-٢١٧ ف/١ = ژمارە: ١٢١٥)، (بڕوانە:١ ژ/٨٧٧ لە تجرید).

## (٣٠) باب: فضل الصیام
## باسی خێرو بەهرەی ڕۆژوو

٧٠٧- عَنْ أَبِی هُرَیْرَةَ (رضی الله عنه)قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صـلی الله علیـه وسلم): « قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ، إِلاَّ الصِّیَامَ، فَإِنَّهُ لِی، وَأَنَا أَجْزِی بِـهِ، وَالصِّیَامُ جُنَّةٌ، فَإِذَا كَانَ یَوْمُ صَوْمِ أَحَدِكُمْ، فَـلاَ یَرْفُـثْ یَوْمَئِـذٍ، وَلاَ یَـسْخَبْ. فَـإِنْ سَـابَّهُ أَحَدٌ، أَوْ قَاتَلَهُ، فَلْیَقُلْ: إِنِّی امْرُؤٌ صَائِمٌ، وَالَّذِی نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِیَـدِهِ لَخُلُـوفُ فَـمِ الـصَّائِمِ، أَطْیَبُ عِنْدَ اللَّهِ یَوْمَ الْقِیَامَةِ، مِنْ رِیحِ الْمِسْكِ، وَلِلـصَّائِمِ فَرْحَتَـانِ یَفْرَحُهُمَـا، إِذَا أَفْطَـرَ فَـرِحَ بِفِطْـرِهِ، وَإِذَا لَقِـیَ رَبَّـهُ، فَـرِحَ بِـصَوْمِهِ ». {الحـدیث: ٢٧٠٠ = ٢٦٨١ فـم. تجرید/٢/٢٦٦، رقم: ٨٧٧ = ١٩٠٤. نسائی. صیام: ٢٢١٥ تحفة: ١٢٨٥٣}: [٧٠٧]

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: خۆشەویـست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـە فەرموودەیـەکی پـیرۆز (قودسـی)دا دەفـەرموێ: (خـودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: هەموو کردەوەیەکی ئادەمیزاد بـۆ خۆیـەتیو بەشـی دنیایی خۆیی پێوە هەیە، بێجگە لـە ڕۆژوو، بـەڵام ڕۆژوو سـاخ هـەر بـۆ منـە، وە لەبەرئـەوە مـن خـۆم پاداشی باشـی دەدەمـەوە، وە ڕۆژوو قەڵغانـەو مـەردوم لـە خراپە دەگێڕێتەوەو، دەبێ بە حەساری دەوری ئاگری دۆزەخ بۆ خاوەنی!

---

[٧٠٧] تجرید/٢، ژمارە: ٨٧٧ - بخاری: ١٩٠٤، مسلم: ١١٥١ حسب تـرقیم محمـد فـؤاد عبـدالباقی = مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٧١ - ٢٧٠٠ حسب ترقیم خلیل مأمون شیحا.

جا هەر رۆژێ بەرۆژوو بوون قسەی پڕو پووچ‌و شاتە شات مەکەن، ئەگەر یەکێکیش گەڕی پێکردن‌و جنێویدا پێتان، یا شەڕی فرۆشت پێتان، بڵێن: من بابایەکی بەرۆژووم، شەڕە جمێن‌و شەڕکردن بۆمن نەهاتووە، بەزمانی بەرۆژووەوە دەمی خۆم چەپەڵ ناکەم!

بەوکەسە کە گیانی موحەممەدی بەدەسە، بۆنی بەڵخی دەمی رۆژووەوان (لەلای خودا) لە بۆنی میسك خۆشترە.

رۆژوەوان لەدوو کاتا شادو کەیف خۆش دەبێ: لەکاتی بەربانگا شادو کەیف خۆش دەبێ، وە لەوکاتەشدا کە دەچێتەوە دیوانی خودا بەهۆی رۆژووەکەیەوە تەواو کەیف خۆش دەبێ). {تاج/٢/٧٤، زنجیرە: ٢٦، ژمارە: ١٢٩٨} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢١٧، ژمارە: ١٢١٥}.

٧٠٨- عَنْ سَهْلٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ « إِنَّ فِي الْجَنَّةِ بَابًا يُقَالُ لَهُ الرَّيَّانُ، يَدْخُلُ مِنْهُ الصَّائِمُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، لاَ يَدْخُلُ مِنْهُ أَحَدٌ غَيْرُهُمْ يُقَالُ أَيْنَ الصَّائِمُونَ فَيَقُومُونَ، لاَ يَدْخُلُ مِنْهُ أَحَدٌ غَيْرُهُمْ، فَإِذَا دَخَلُوا أُغْلِقَ، فَلَمْ يَدْخُلْ مِنْهُ أَحَدٌ ». (الحديث ١٨٩٦، طرفه ٣٢٥٧). [٧٠٨]

سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: دەرگایەك هەیە لەبەهەشتا ناوی دەرگای تێراوە، لەڕۆژی قیامەت دا تەنها رۆژووەوانەکان لەو دەرگایەوە دەچنە ژوورەوەو بەس، فریشتەی ڕەحمەت بانگەواز دەکەن رۆژووەوانەکان کوان لەکوێن؟ جا ئەوانیش دەڕۆن لەو دەرگایەوە دەچنە ژوورەوە کە دواکەسیان دەچێتە ژوورەوە ئیتر ئەو دەرگایە دادەخرێ‌و کەسی تری لێوە ناچێتە ژوورەوە. (ریاض/٣/٩٠٩ ز/٢١٧ = ژمارە: ١٢١٧ - ش + تاج/٢/٧٢ ز/٢٦ ف/٤ = ژمارە: ١٣٠١ - ش/ن).

---

[٧٠٨] تجرید/٢، ژمارە: ٨٧٢ = ١٨٩٦، مسلم: ١١٥٢ - ٢٧٠٣ شیحا.

### (٣١) باب: فضل الصيام في سبيل الله لمن يطيقه بلا ضرر ولا تفويت حق

### گەورەیی ڕۆژوو لە پێناوی خودادا، بۆ کەسێ لە توانایا هەبێ بەبێ زیان لە کەسێ، یا فەوتاندنی مافی کەسێ

٧٠٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (مَنْ صَامَ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ بَعَّدَ اللَّهُ وَجْهَهُ عَنْ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا) (الحديث ٢٨٤٠): [٧٠٩]

ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەپێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (هەر کەسێ ڕۆژێ بەرۆژووبێ لەرێگەی خودادا، خودا رووی حەفتا ساڵ لەئاگری دۆزەخ دوور دەخاتەوە).

### (٣٢) باب: أكل الناسي وشربه وجماعه لايفطر

### ڕۆژووەوان ئەگەر لەبیری نەبوو، شتی خوارد، یا شتی خواردەوە، یا لاقەکردنی نێرو مێیی ئەنجام دا، ڕۆژووەکەی ناشکێ

٧١٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ « إِذَا نَسِيَ فَأَكَلَ وَشَرِبَ فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللَّهُ وَسَقَاهُ ». (الحديث ١٩٣٣، طرفه ٦٦٦٩): [٧١٠]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەگەر کەسێ لەبیری نەبوو کە بەڕۆژووە، وە چشتی خوارد، یا چشتی خواردەوە ئەوە با ڕۆژووەکەی نەشکێنێ، ئەو نان و ئاوەش کە خواردوویەتی رزق و ڕۆژیەك بووە خوا بۆی ڕەخساندووە. (تاج/٢/١٠٠ ز/٤٠ ف/٢ = ژمارە: ١٣٥٦ - ش/د/ت/ن).

---

[٧٠٩] تجرید/٣، ژمارە: ١١٧٠ = بخاری: ٢٨٤٠، مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٦٠٩ = ٢٧٠٤ شیحا.

[٧١٠] تجرید/٢، ژمارە: ٨٩١ = ١٩٣٣ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٨٧ = ٢٧٠٩.

## (٣٤) باب: صيام النبى صلى الله عليه وسلم في غير رمضان وإستحباب أن لايخلى شهرا عن صوم

## ڕۆژووی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لە غەیری مانگی ڕەمەزانا، وا سوننەتە کە هیچ مانگێك خاڵی نەبێ لە ڕۆژوو

٧١١- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ عَنْ صِيَامِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَتْ: كَانَ يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ: قَدْ صَامَ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ: قَدْ أَفْطَرَ، وَلَمْ أَرَهُ صَائِمًا مِنْ شَهْرٍ قَطُّ أَكْثَرَ مِنْ صِيَامِهِ مِنْ شَعْبَانَ، كَانَ يَصُومُ شَعْبَانَ كُلَّهُ، كَانَ يَصُومُ شَعْبَانَ إِلاَّ قَلِيلاً. {الحديث: ٢٧١٤ = ٢٦٩٧ فم. تجريد/٢/٢٩٠، رقم: ٩٠٩ = ١٩٦٩، ١٩٧٠، ٦٤٦٥. أبو داود. صوم: ٢٤٣٤. نسائى. صيام: ٢٣٥} : (٧١١)

ئەبو سەلەمە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەبارەی چۆنێتیو چەندێتیی رۆژووی پێغەمبەرەوە، (دروودی خودای لەسەر بێ)، پرسیارم لە عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر کرد، فەرمووی: دەستووری رۆژوو گرتنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوابوو: جاری وادەبوو کە دەستی دەکرد بە گرتنی رۆژوو دەمانگوت: ئیتر هەر بەڕۆژوو دەبێو نایشکێنێ، جاری وایش دەبوو کە بەڕۆژوو نەدەبوو، دەمانگوت: بەردەوام دەبێ لەسەر رۆژوو شکاندن، هەرگیز نەیشم دیوە کە لەهیچ مانگێك بەقەی مانگی کوڵە مانگ (مانگی شەعبان) بەڕۆژوو بێ، بگرە کوڵە مانگی هەموو دەگرت کەمێکی نەبێ).

ئەمەش دەقی ئەم فەرموودەیە، لە تەجریدی بوخاریدا، بۆ بەرابەری لەنێوان دوو دەقەکەدا:

---

[٧١١] تجريد/٢، ژمارە: ٩٠٩ = بخاری: ١٩٦٩، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٦١٦ = ٢٧١٤ - ١١٥٦ محمد فؤاد عبدالباقی.

عَنْ عَائِشَةَ - رضى الله عنها - قَالَتْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ لاَ يُفْطِرُ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ لاَ يَصُومُ. فَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اسْتَكْمَلَ صِيَامَ شَهْرٍ إِلاَّ رَمَضَانَ، وَمَا رَأَيْتُهُ أَكْثَرَ صِيَامًا مِنْهُ فِي شَعْبَانَ. (الحديث ١٩٦٩، طرفاه ١٩٧٠، ٦٤٦٥):

عائيشه (ڕەزای خوای لیّ بیّ) فەرمووی: نەم دیوه كه پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بیّ) مانگێكی تەواو بەڕۆژوو بیّ، بێجگه له ڕەمەزان، نەیشم دیوه كه لەهیچ مانگێك بەقەی مانگی كوڵەمانگ (مانگی شەعبان) بەڕۆژوو بیّ، كۆوڵەمانگی هەموو دەگرت كەمێكی نەبیّ بگره ساڵی وابوو هەمووی دەگرت، یەك ڕۆژی لیّ نەدەبوارد. (تاج/٢/١٣٠ ز/٦٢ ف/١).

٧١٢- وَعَنْهَا (رَضِي اللهُ عَنْها) قَالَتْ لَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَصُومُ شَهْرًا أَكْثَرَ مِنْ شَعْبَانَ، فَإِنَّهُ كَانَ يَصُومُ شَعْبَانَ كُلَّهُ، وَكَانَ يَقُولُ « خُذُوا مِنَ الْعَمَلِ مَـا تُطِيقُونَ، فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يَمَلُّ حَتَّى تَمَلُّوا، وَأَحَبُّ الصَّلاَةِ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ) مَا دُووِمَ عَلَيْهِ، وَإِنْ قَلَّتْ » وَكَانَ إِذَا صَـلَّى صَـلاَةً دَاوَمَ عَلَيْهَـا. (الحـديث ١٩٧٠): (٧١٢)

دیسان عائیشه (ڕەزای خوای لیّ بیّ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بیّ) ڕۆژووی سوننەتی لەهیچ مانگێكی تردا وەك مانگی كوڵە مانگ بەتەواوی نەدەگرت، چونكه زۆربەی ساڵ زۆرترین مانگی كوڵە مانگ بەڕۆژوو دەبوو، پێغەمبەر دەیفەرموو: ئەی موسوڵمانینه! كاریّ بكەن كه لەتواناتانا هەبیّ چونكه هەتا ئێوه وەڕس نەبن خودا وەڕس نابیّ.

وه خۆشەویسترین نوێژی سوننەتیش لەلای پێغەمبەری خودا ئەو جۆره نوێژه سونەتانه بوو كه بەبەردەوامی دەكرێن، با كەمیش بن، دەستووری

---

(٧١٢) تجرید/٢، ژماره: ٩١٠ = ١٩٧٣، مسلم: ٢٧١٦ شیحا.

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وابوو کە خووی دەگرت بە نوێژێکی سوننەتەوە ئیتر هەمیشە بەردەوام دەبوو لەسەری، ئەوەك ماوەیێ بیکاو دوایی وازی لێ بهێنێ. (تاج/١٥٤/٤ ز/٤٩ ف/١ = ژمارە: ٢٩٠١، بەرگی/٣).

**راڤەو شیکردنەوە:**

**فیقهی ئەم فەرموودەیە ئەمەیە:**

ئەوەنـدە شـتی سوننەت بگرە ئەستۆ کەهەتا سەر بە بەردەوامی بۆت بکرێ، نەکەی لەهەوەڵەوە زۆر لەشتێکی سوننەت ئەنجام بدەیو لەپاشا لەبەر زۆریەکەی وازی لێ بهێنی، کورتو پوخت کەمی بەردەوام چاترە لەزۆرێ کە زۆرینەی کات لەپڕا دەپچڕێ!.

٧١٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) قَالَ مَا صَامَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) شَهْرًا كَامِلاً قَطُّ غَيْرَ رَمَضَانَ ، وَيَصُومُ حَتَّى يَقُولَ الْقَائِلُ لاَ وَاللَّهِ لاَ يُفْطِرُ ، وَيُفْطِرُ حَتَّى يَقُولَ الْقَائِلُ لاَ وَاللَّهِ لاَ يَصُومُ):

واتاو وەرگەڕاوەکەی بەتەواوی لە ژمارە (٧١١)دا رابورد.

**(٣٥) باب: النهي عن صوم الدهر لمن تضرر به، أو فوت به حقا، أو لم يفطر العيدين والتشريق وبيان تفضيل صوم يوم وإفطار يوم**

**ڕۆژووی ساڵ دوانزە مانگە ڕێی پێ نەدراوە بۆ کەسێ، کە زیانی پێ بگەیەنێ، یان ببێ بەهۆی لە دەستچوونی مافێکی ڕەوا، یان دوو ڕۆژەی جەژنی ڕەمەزانو جەژنی قوربان لەگەڵ سێ ڕۆژەی ﴿أيام التشريق﴾دا بە ڕۆژوو بێت**

٧١٤- عن عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو قَالَ أُخْبِرَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنِّي أَقُولُ وَاللَّهِ لأَصُومَنَّ النَّهَارَ ، وَلأَقُومَنَّ اللَّيْلَ ، مَا عِشْتُ . فَقُلْتُ لَهُ قَدْ قُلْتُهُ بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي . قَالَ « فَإِنَّكَ لاَ تَسْتَطِيعُ ذَلِكَ ، فَصُمْ وَ أَفْطِرْ ، وَقُمْ وَنَمْ ، وَصُمْ مِنَ الشَّهْرِ

ثلاثَةَ أيَّامٍ ، فإنَّ الْحَسَنَةَ بِعَشْرِ أمْثالِهَا ، وَذَلِكَ مِثْلُ صِيَامِ الدَّهْرِ » . قُلْتُ إِنِّى أُطِيقُ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ . قَالَ « فَصُمْ يَوْمًا وَأَفْطِرْ يَوْمَيْنِ » . قُلْتُ إِنِّى أُطِيقُ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ . قَالَ « فَصُمْ يَوْمًا وَأَفْطِرْ يَوْمًا ، فَذَلِكَ صِيَامُ دَاوُدَ – عَلَيْهِ السَّلاَمُ – وَهْوَ أَفْضَلُ الصِّيَامِ» . فَقُلْتُ إِنِّى أُطِيقُ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ . فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ »: [٧١٤]

بۆ سوودو بەهرەی زیاترو بۆ تێگەیشتنی تەواو، لە کرۆکو مەبەستی زۆر لە دەقی فەرموودەکان، ئەم چەند گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیەی عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص لەم جێگەیەدا راگوێز دەکەم:

عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو بن العاص قَالَ: بَلَغَ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) أَنِّى أَسْرُدُ الصَّوْمَ وَأُصَلِّى اللَّيْلَ، فَإِمَّا أَرْسَلَ إِلَيَّ، وَإِمَّا لَقِيتُهُ، فَقَالَ: « أَلَمْ أُخْبَرْ أَنَّكَ تَصُومُ وَلاَ تُفْطِرُ وَتُصَلِّى اللَّيْلَ؟ فَلاَ تَفْعَلْ، فَإِنَّ لِعَيْنِكَ حَظًّا، وَلِنَفْسِكَ حَظًّا، وَلأَهْلِكَ حَظًّا، فَصُمْ وَأَفْطِرْ، وَصَلِّ وَنَمْ، وَصُمْ مِنْ كُلِّ عَشْرَةِ أَيَّامٍ يَوْمًا، وَلَكَ أَجْرُ تِسْعَةٍ »، قَالَ: إِنِّى أَجِدُنِى أَقْوَى مِنْ ذَلِكَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ! قَالَ: « فَصُمْ صِيَامَ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ »، قَالَ: وَكَيْفَ كَانَ دَاوُدُ يَصُومُ يَا نَبِيَّ اللَّهِ؟! قَالَ: « كَانَ يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا، وَلاَ يَفِرُّ إِذَا لاَقَى »، قَالَ: مَنْ لِى بِهَذِهِ يَا نَبِيَّ اللَّهِ؟ قَالَ عَطَاءٌ: فَلاَ أَدْرِى كَيْفَ ذَكَرَ صِيَامَ الأَبَدِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ صَامَ مَنْ صَامَ الأَبَدَ. لاَ صَامَ مَنْ صَامَ الأَبَدَ». {الحديث: ٢٧٢٦ = ٢٧١٠ فم. تجريد البخارى/٢/٢٩٣، رقم: ٩١٢ = ١٩٧٥، ١١٣١، ١١٥٢، ١١٥٣، ١٩٧٤، ١٩٧٦، ١٩٧٧، ١٩٧٨، ١٩٧٩، ١٩٨٠، ٣٤١٨، ٣٤١٩، ٣٤٢٠، ٥٠٥٢، ٥٠٥٣، ٥٠٥٤، ٥١٩٩، ٦١٣٤، ٦٢٧٧ + تجريد/١/٥٤٢، رقم: ٥٦٤. ترمذى. صوم: ٧٦٨. نسائى. صيام: ٢٣٩٦. تحفة الأشراف: ٦٦٣٥} :

---

[٧١٤] تجريد/٢، ژمارە: ٦٢٨ = ١٣٠٦، بخارى. مسلم: ٩٣٦، محمد فؤاد - مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٦٢٨ = ٢٧٢٦ شيحا.

عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص (رەزای خودا لەخۆی‌و باوکی) فەرمووی: عەرزی حەزرەتیان کردبوو کەمن بەردەوام هەر بەڕۆژوو دەبم‌و بە شەویش هەر شەو نوێژ دەکەم، جایا ناردی بەشوێنما، یا بە خزمەتی گەیشتم، فەرمووی: (ئایا وایە، گوایە تۆ دەڵێی بەردەوام هەر بەڕۆژوو دەبم‌و رۆژێکی لێ ناخۆم‌و بە شەویش ناخەوم هەر شەو نوێژ دەکەم؟). گوتم: بەڵێ گوتوومە. فەرمووی: (شتی وا مەکە، چونکە چاوەکانت مافیان هەیە لەسەر تۆ، کە بەشی خۆیان بخەون، تا کزو کوێر نەبن بەهۆی شەو نوخوونی زۆرەوە، دەروونت مافی حەوانەوەی هەیە لەسەر تۆ، وە خێزانەکەت هەقی هەیە لەسەر تۆ، وەخۆت ماف‌و هەقت هەیە لەسەر خۆت، جا دەبێ موراعاتی حاڵی ئەمانە بکەی، کەواتە: ناوبەناو بەڕۆژووبەو ناوبەناویش بەڕۆژوومەبە، ناوبەناویش بە شەو، شەو نوێژبکەو ناوبەناویش بەشی خۆت بخەوە، لە دە رۆژ رۆژێ بەڕۆژووبە، خێری گرتنی نۆ رۆژەکەی تریشت بۆ حسێب دەکرێ). عەبدوڵلا فەرمووی: قوربان! ئەی پێغەمەری خودا! توانای زیاترم هەیە، کەواتە بۆم زیاتر بکە؟ فەرمووی: (دە تۆش وەك داوود پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەڕۆژووبە). عەبدوڵلا عەرزی دەکا: ئەی پێغەمەری خودا! داوود پێغەمبەر چۆن رۆژووی سوننەتی دەگرت؟ فەرمووی: (داوود رۆژ نارۆژێ بەڕۆژوو دەبوو، کاتێکیش لەکاتی شەڕدا، بەرەنگاری لەشکری دوژمن دەبوو، لەبەری هەڵ نەدەهات‌و شێرانە دەجەنگی لەگەڵیانا).

عەبدوڵلا فەرمووی: قوربان! جا شتی وانایاب دەست کێ دەکەوێ! عەطاء کە ئەم فەرموودەیە لە ئەبولعەبباسەوە دەگێڕێتەوە، ئەویش لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە دەیگێڕێتەوە، عەطاء دەفەرموێ: نازانم ئەبول عەبباس باسی رۆژووی ساڵ دوانزە مانگەی چۆن گێڕایەوە، لەم بارەیەوە تەنیا ئەمەم

لەبەرماوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دووجار لەسەر یەك دەفەرموێ: (ڕۆژووی ئەو کەسە گیرانەبێ کە ساڵ دوانزە مانگە بەڕۆژوو دەبێ).
{تاج/٢، زنجیرە: ٧١، ژمارە: ١٤٥٢ + زنجیرە: ٧٠، ژمارە: ١٤٥٠، ١٤٥١} .

عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عَمْرٍو (رضى الله عنهما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّ أَحَبَّ الصِّيَامِ إِلَى اللّٰهِ صِيَامُ دَاوُدَ، وَأَحَبَّ الصَّلاَةِ إِلَى اللّٰهِ صَلاَةُ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ، كَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيْلِ، وَيَقُومُ ثُلُثَهُ، وَيَنَامُ سُدُسَهُ، وَكَانَ يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا ». {الحديث: ٢٧٣١ = ٢٧١٥ فم. تجريد/٢/٥٤٢، رقم: ٥٦٤. راجع رقم: ٦٢٨ لمعرفة أطرافه. أبو داود. صوم: ٢٤٤٨. نسائي. قيام الليل: ١٦٢٩. تحفة الأشراف: ٨٨٩٧} :

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پەسەندترین ڕۆژوو ئەو ڕۆژوومیە، کە لەسەر دەستووری داوود پێغەمبەر بێ، (دروودی خودای لەسەر بێ)، وە هەروەها نوێژی شەو نوێژیش، یاسای داوود پێغەمبەریش بۆ شەونوێژ ئاوا بوو: نیوەی شەو دەخەوت، سێیەکی شەویش شەو نوێژی دەکرد، ئەمە دەکاتە پێنج بەش لە شەش بەش، وە ئەو شەشیەکەی تریشی دەخەوتەوە! وە ڕۆژ ناڕۆژێکیش بەڕۆژوو دەبوو). {تاج/١/٤٩٤، ج/١ = ج/٤، زنجیرە: ١٨١، ژمارە: ٩٧٣} .

عَنْ عَبْدَ اللّٰهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) (أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لَهُ أَحَبُّ الصَّلَاةِ إِلَى اللّٰهِ صَلَاةُ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَام وَأَحَبُّ الصِّيَامِ إِلَى اللّٰهِ صِيَامُ دَاوُدَ وَكَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيْلِ وَيَقُومُ ثُلُثَهُ وَيَنَامُ سُدُسَهُ وَيَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا): (الحديث ١١٣١ـ أطرافه في: ١١٥٢، ١١٥٣، ١٩٧٤، ١٩٧٥، ١٩٧٦، ١٩٧٧،

١٩٧٨، ١٩٧٩، ١٩٨٠، ٣٤١٨، ٣٤١٩، ٥٠٥٢، ٣٤٢٠، ٥٠٥٣، ٥٠٥٤، ٥١٩٩، ٦١٣٤، ٦٢٧٧).

عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: ( پەسەند ترین نوێژ لەلای خودا ئەو نوێژەیە کەلەسەر دەستووری داود پێغەمبەر بێ (دروودی خودای لەسەر بێ) وە هەروەها ڕۆژوویش، یاسای داود پێغەمبەریش ئاوا بوو: نیوەی شەو دەخەوت، سێ یەکی شەویش شەونوێژی دەکرد، ئەمە دەکاتە پێنج بەش لە شەش بەشی شەو، وە ئەو شەش یەکەکەی تریشی دەخەوتەوە! وەرۆژ نا ڕۆژێکیش بەڕۆژوو دەبوو) (ت/ ١/ ٤٩٤/ ٩- ش/ د = ز-١٨١ ژ-٩٧٣).

## ڕاڤە و شیکردنەوە:

مەبەستی سەرەکی لەم فەرموودەیە ئەوەیە: کەبەشێوەی گشتی شەونوێژو ڕۆژووی سوننەت لەسەر ئەم شێوەیە بن، هەتا جەستەیش بەشی خۆی بحەسێتەوەو تووشی بێزاری نەبێ، دەنا شەونوێژ ئەگەر لەم ئەندازەیەیش کەمتر یا زیاتر بێ هەر دەبێ. هەندێ لەزانایان کاری باش بە پێی ئەم یاسایە دەکەن: ( کار تا زۆرتر بێ پاداشیشی زۆرترە).

٧١٥- عن عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) « يَا عَبْدَ اللَّهِ أَلَمْ أُخْبَرْ أَنَّكَ تَصُومُ النَّهَارَ وَتَقُومُ اللَّيْلَ ». فَقُلْتُ بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ « فَلاَ تَفْعَلْ، صُمْ وَأَفْطِرْ، وَقُمْ وَنَمْ، فَإِنَّ لِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِعَيْنِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِزَوْجِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِزَوْرِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ بِحَسْبِكَ أَنْ تَصُومَ كُلَّ شَهْرٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، فَإِنَّ لَكَ بِكُلِّ حَسَنَةٍ عَشْرَ أَمْثَالِهَا، فَإِنَّ ذَلِكَ صِيَامُ الدَّهْرِ كُلِّهِ ». فَشَدَّدْتُ، فَشُدِّدَ عَلَيَّ، قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً. قَالَ «

فَصُمْ صِيَامَ نَبِيِّ اللَّهِ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ وَلاَ تَزِدْ عَلَيْهِ ». قُلْتُ وَمَا كَانَ صِيَامُ نَبِيِّ اللَّهِ دَاوُدَ – عَلَيْهِ السَّلاَمُ – قَالَ « نِصْفَ الدَّهْرِ ». فَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يَقُولُ بَعْدَ مَا كَبِرَ يَا لَيْتَنِي قَبِلْتُ رُخْصَةَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ). (الحديث ١٩٧٥، راجع رقم: ٥٦٤ ت + ١١٣١ ف، لمعرفة أطرافه): [٧١٥]

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویست پێی فەرمووم: ئەی عەبدوڵڵا! بیستومە کە تۆ ساڵ دوانزە مانگە بەڕۆژوو دەبیتو بەشەویش ناخەوی، هەر شەو نوێژ دەکەیت؟ گوتم: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا!. چۆن دەفەرمووی وایە، فەرمووی: وامەکە، ناو بەناو بەڕۆژوو بەو ناو بەناویش بەڕۆژوو مەبە، بەشەویش هەتا تاوێ شەو نوێژ بکەو، تاوێکیش بخەوە، چونکە لەڕاستی دا لەشو جەستەت مافی هەیە لەسەر تۆ کە زۆر نەیرەنجێنیو تاڕادەی پڕووکان نەیرەتێنی وەهەروەها چاوەکانت مافیان هەیە لەسەر تۆ، وە هەروەها ژنەکەت مافی هەیە لەسەرتۆ، وەهەروەها میوانەکەت مافی هەیە لەسەر تۆ، جا دەبێ ئەمانە ڕەچاو بکەی، هەریەکەی بەپێی خۆی، وەلەگشت مانگێ تەنیا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بە بەستە! چونکە چاکە یەك بەدەیە، ئیتر ئەوە وەك ئەوە وایە کە ساڵ دوانزە مانگەی خودا بەڕۆژوو بی.

عەبدوڵڵا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەڵام من خۆم کارەکەم لەخۆم گران کردو باری خۆم قورس کرد، بۆیە لێم گرانو قورس کراوە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا لەخۆم رادەبینمو بەخۆما رادەپەرمووم کە زیاتر بفەرموو، فەرمووی: کەواتە وەکوو پێغەمبەری خودا داوود بەڕۆژوو بە (درووودی خوای لەسەر بێ) وەلێی زیاد مەکە. عەرزیم کرد ڕۆژووی داود پێغەمبەر (درووودی

---

[٧١٥] تجرید/٢، ژمارە: ٩١٢ = ١٩٧٥، ١٩٧٧، مسلم: ١١٥٩ - ٢٧٣٦.

خوای لەسەر بێ) چۆن بوو؟ فەرمووی: ڕۆژ نا ڕۆژێ بەڕۆژوو دەبوو، کەدەکاتە نیوەی ڕۆژووی ساڵ دوانزە مانگە. عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) کاتێ پیر بوو بوو دەیفەرموو: خۆزگایەم کاتی خۆی ڕوخسەتەکەی پێغەمبەرم قەبووڵ بکردایە. (ریاض/١ ژمارە/١٥٠، تاج/١/٤٩٤ ز/١٨١ ف/٩، بڕوانە: ژمارە/٥٦٤ کە لەبەرگی یەکەمی تجریددا رابوورد).

(مكرر) وَعَنْهُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) فِي رِوَايَةٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) « فَصُمْ صِيَامَ دَاوُدَ - عَلَيْهِ السَّلاَمُ - كَانَ يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا، وَلاَ يَفِرُّ إِذَا لاَقَى قَالَ: مَنْ لِي بِهَذِهِ يَا نَبِيَّ اللَّهِ؟ قَالَ عَطَاءٌ لاَ أَدْرِي كَيْفَ ذَكَرَ صِيَامَ الأَبَدِ، قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) « لاَ صَامَ مَنْ صَامَ الأَبَدَ ». مَرَّتَيْنِ. (الحديث ١٩٧٧):

لەگێڕانەوەیەکی تری دا فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەسەر شێوەی بەڕۆژوو بوونی پێغەمبەر داود (دروودی خوای لەسەر بێ) بەڕۆژوو بە، دەستووری داود وابوو ڕۆژ نا ڕۆژێ بەڕۆژوو دەبوو، کاتێکیش لەشەڕدا بەرەنگاری لەشکری دوژمن دەبوو لەبەری هەڵنەدەهات.

عەبدوڵلا فەرمووی: جاکێ دەبێ بەدەستەبەری ئەوە بۆ من ئەی پێغەمبەری خودا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ڕۆژووی ئەو کەسە گیرا نەبێ کەساڵ دوانزە مانگە بەڕۆژوو دەبێ، دووجار ئەم نزایەی دووبارە کردەوە. (ریاض/١ ژمارە:١٥٠ ز/١٤).

٧١٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: انْكَحَنِي ابِي (رَضِيَ اللهُ عنهُ) امْرَاةً ذاتَ حَسَبٍ فَكَانَ يَتَعَاهَدُ كَنَّتَهُ فَيَسْأَلُهَا عَنْ بَعْلِهَا فَتَقُولُ: نِعْمَ الرَّجُلُ مِنْ رَجُلٍ لَمْ يَطا لَنَا فِرَاشًا وَلَمْ يُفَتِّشْ لَنَا كَنَفًا مُنْذ اتَيْنَاهُ فَلَمَّا طالَ ذلِكَ عَلَيْهِ ذكَرَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: (الْقَنِي بِهِ فَلَقِيتُهُ بَعْدُ فَقَالَ: كَيْفَ تَصُومُ؟ قَالَ: كُلَّ يَوْمٍ قَالَ: وَكَيْفَ تَخْتِمُ؟ قَالَ: كُلَّ لَيْلَةٍ.

قَالَ: (صُمْ فِي كُلِّ شَهْرٍ ثلاثةً وَاقْرَا الْقُرْانَ فِي كُلِّ شَهْرٍ) قَالَ: قُلْتُ: اطيقُ اكْثرَ مِنْ ذلِكَ قَالَ: (صُمْ ثلاثةَ ايَامٍ فِي الْجُمُعَةِ) قُلْتُ: اطيقُ اكْثرَ مِنْ ذلِكَ قَالَ: (افْطرْ يَوْمَيْنِ وَصُمْ يَوْمًا) قَالَ: قُلْتُ: اطيقُ اكْثرَ مِنْ ذلِكَ قَالَ: (صُمْ افْضلَ الصَّوْمِ صَوْمَ دَاوُدَ صِيَامَ يَوْمٍ وَافْطارَ يَوْمٍ وَاقْرَا فِي كُلِّ سَبْعِ لَيَالٍ مَرَّةً) فَلَيْتَنِي قَبِلْتُ رُخْصَةَ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَذاكَ انِّي كَبِرْتُ وَضَعُفْتُ فَكَانَ يَقْرَا عَلَى بَعْض اهْلِهِ السُّبْعَ مِنْ الْقُرْانِ بالنَّهَارِ وَالَّذي يَقْرَؤُهُ يَعْرِضهُ مِنْ النَّهَارِ لِيَكُونَ اخفَّ عَلَيْهِ باللَّيْلِ وَاذا ارَادَ انْ يَتَقَوَّى افْطرَ ايَامًا وَاحْصَى وَصَامَ مِثلَهُنَّ كَرَاهِيَةَ انْ يَتْرُكَ شَيْئًا فَارَقَ النَّبِيَ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَيْهِ (الحديث ٥٠٥٢- طرفه في : رقم : ٥٦٤ تجريد ١١٣١ فتح الباری = بەرگی یەکەم = لاپەڕە : ٥٤٢ ): [٧٦٦]

مەبەستی سەرەکی لەم فەرموودەیە ڕۆیشت. بڕ : ژ : ٥٧٦ تجرید = ١١٥٢ فتح = بەرگی یەکەم ل- ٥٥١ + ژ: ٩١٢ ت = ١٩٧٥فتح = بەرگی/٢ ل/٢٩٣ + ژ/٩١٢ م= ١٩٧٧ فتح = بەرگی/٢ ل/٢٩٤.

لێرەدا دەفەرموێ: باوکم ژنێکی خانەدانی هێنابوّم، ناوبەناو بووکەکەیی بەسەر دەکردەوە و، لە بارەی مێردەکەیەوە کەمن بووم لێی دەپرسی. ئەویش جارێ عەرزی دەکا: پیاو هەروا دەبێ، لەوە چاکتر نابێ، ئەوە تەی نسیبم کەوتووەتە لای نەپێی ناوەتە سەرنوێنەکەم نەچمکی پەردەکەی هەڵداوەتەوە واتە هێشتا دروست نەبووە لەگەڵماو بەدەستی نەگرتووم!

جا کەئەم بارودۆخە درێژەی کێشا، باوکم ئەمەی عەرزی پێغەمبەر کرد. ئەویش (دروودی خودای لێ بێ) پێی دەفەرموا: (بیهێنە بۆ لام). جا کاتێ چووم بۆ خزمەتی پێی فەرمووم: (چۆن چۆنی بە ڕۆژو دەبێ؟) گوتم: (بەردەوام ساڵ دووانزە مانگە هەموو ڕۆژێ بەڕۆ ژو دەبم ) فەرمووی : ( ئەی

[٧٦٦] تجرید/٤، ژمارە: ١٧٣٩ = ٥٠٥٢، بخاری. مسلم: ٢٧٢٤ شیحا.

چۆن و بە چەند رۆژ خەتمەیەکی قورئان دەکەی ؟ ) گوتم : هەمو شەوێ خەتمێ دەکەم.

فەرمووی : (وامەکە بەڵکوو لە هەموو مانگێ سێ رۆژ بەرۆژوو بە، بە مانگێکیش خەتمەیەکی قورئان بکە ). گوتم لەمە زیاتر دەتوانم ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی : (دەی کەوایە گشت هەفتەیەك سێ رۆژ بەرۆژوبە) گوتم: زیاتر دەتوانم. فەرمووی: (دەی کەوایە هەمیشە دوو رۆژ بە رۆژوبە و رۆژێ بەرۆژو مەبە). عەرزیم کرد لەمەیش زیاتر دەتوانم. فەرمووی: (دەی باشترین شێوەی رۆژو گرتن ئەنجام بدە، کە شێوەی بە رۆژو بوونی داوود پێغەمبەرە، کە بەم شێوەیە بەرۆژو دەبوو، تۆیش ئاوا بەرۆژو بە : رۆژێك بە رۆژو بە و رۆژێك بە رۆژو مەبە، وە بە حەوت شەویش خەتمەیەکی قورئان بکە). جاکاتێ عەبدوڵلا پیربوو، دەیفەرموو:(خۆزگە کاتی خۆی روخسەتەکەی پێغەمبەرم قە بووڵ دەکرد و، ئەو هەموو چەندو چۆنەم لە گەڵ نەکردایە، چوونکە ئێستا پیربووم و بێ هێزو زەبوون بووم و، ئەوەی بە لاوی دەمتوانی بیکەم ئێستا بە ئاسایی بۆم ناکرێ).

موجاهید (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ( کاتێ عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص، پیر بوو بەردەوام بوو لە سەر ئەو شێوە خوا پەرستیەی کە لە سەردەمی پێغەمبەردا بەردەوام بوو لەسەری، کە ئەوە بوو رۆژ نا رۆژێ بەرۆژو بێ و، خەتمێکی قورئانیش بە حەوت شەو لە شەو نوێژدا بکات، بەڵام لە کاتی پیریدا بۆ ئاسان کاری ئاوای دەکرد، بە رۆژ پشکی قورئان خوێندنەکەی شەوی، کە حەوت یەکی قورئان بوو، لە لای یەکێ لە کەسوکارەکەی دەور دەکردەوە، هەتا بەباشی رەوانی بکاتەوە، مەبادا شتێکی لێی لەبیرچوو بێ، هەتا بەشەو بەئاسانی و رەوانی لە شەو نوێژەکەی دا بیخوێنێ.

وەکاتێکیش دەیویست کە تۆزێ تین و هێزو گورێکی تێ بێتەوە، ڕۆژ نا ڕۆژەکە بەڕۆژو نەدەبوو، وەك سەردەمی لاوی، بەڵکو چەند ڕۆژێ بەژمارە دەیشکان و، بەڕۆژو نەدەبوو، ئەوجا ڕێك بەژمارەی ئەو ڕۆژانەی کە بەڕۆژو نەبوو بوو، ئەوەندە ڕۆژ بەسەریەکەوە بەڕۆژو دەبوو. بەم شێوە یە بەردەوام بوو لەسەر ئەو خوا پەرستیەی کە لەسەردەمی ژیانی پێغەمبەردا ئەنجامی دەدا، چونکە حەزی نەدەکرد کە ئەوەی لە ژیانی پێغەمبەردا کردوویەتی لە پەرستش‌و خوا پەرستی لە پاش مەرگی ئەو لە هیچ قۆناغێکی ژینی دا لێی کەم بکاتەوە!!

٧١٧- عنْ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ: لِي رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (يَا عَبْدَ اللّٰهِ لَا تَكُنْ مِثلَ فُلَانٍ كَانَ يَقُومُ اللَّيْلَ فَتَرَكَ قِيَامَ اللَّيْلِ). (الحديث ١١٥٢): [٧١٧]

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: ( ئەی عەبدوڵڵا! وەك فیسارە کەس مەبە، کەشەونوێژی دەکرد، بەڵام ئێستا وازی لێ هێناوە). (ریاض/ ١/ ١٥٥ ز-١٥ ژ-١٥٤).

٧١٨- حديث عَمْرٍو بن عاص (رضى الله عنهما) بَلَغَ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) أَنِّى أَسْرُدُ الصَّوْمَ وَأُصَلِّى اللَّيْلَ ، فَإِمَّا أَرْسَلَ إِلَيَّ ، وَإِمَّا لَقِيتُهُ ، فَقَالَ « أَلَمْ أُخْبَرْ أَنَّكَ تَصُومُ وَلاَ تُفْطِرُ ، وَتُصَلِّى وَلاَ تَنَامُ ، فَصُمْ وَأَفْطِرْ ، وَقُمْ وَنَمْ ، فَإِنَّ لِعَيْنِكَ عَلَيْكَ حَظًّا ، وَإِنَّ لِنَفْسِكَ وَأَهْلِكَ عَلَيْكَ حَظًّا » . قَالَ إِنِّى لأَقْوَى لِذَلِكَ . قَالَ « فَصُمْ صِيَامَ دَاوُدَ - عَلَيْهِ السَّلاَمُ - » . قَالَ وَكَيْفَ قَالَ « كَانَ يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا ، وَلاَ يَفِرُّ إِذَا لاَقَى » . قَالَ مَنْ لِى بِهَذِهِ يَا نَبِيَّ اللّٰهِ قَالَ عَطَاءٌ لاَ أَدْرِى كَيْفَ

[٧١٧] تجريد/١، ژمارە: ٥٧٧، بخاری: ١١٥٤، مسلم: ٢٧٢٥.

ذَكَرَ صِيَامَ الأَبَدِ ، قَالَ النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسلم – « لاَ صَامَ مَنْ صَامَ الأَبَدَ » . مَرَّتَيْنِ.[٧١٨]

**له ژماره (٧١٤)دا رابورد بهته‌واوی.**

٧١٩- عن عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رضى الله عنهما) قَالَ قَالَ لِي النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّكَ لَتَصُومُ الدَّهْرَ ، وَتَقُومُ اللَّيْلَ » . فَقُلْتُ نَعَمْ . قَالَ « إِنَّكَ إِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ هَجَمَتْ لَهُ الْعَيْنُ وَنَفِهَتْ لَهُ النَّفْسُ ، لاَ صَامَ مَنْ صَامَ الدَّهْرَ ، صَوْمُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ صَوْمُ الدَّهْرِ كُلِّهِ » . قُلْتُ فَإِنِّي أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ . قَالَ « فَصُمْ صَوْمَ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ كَانَ يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا ، وَلاَ يَفِرُّ إِذَا لاَقَى»:[٧١٩]

**له ژماره (٧١٥)دا رابورد بهته‌واوی.**

٧٢٠- عن عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رضى الله عنهما) أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ لَهُ: «وَأَحَبُّ الصِّيَامِ إِلَى اللَّهِ صِيَامُ دَاوُدَ ، وَكَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيْلِ وَيَقُومُ ثُلُثَهُ وَيَنَامُ سُدُسَهُ ، وَيَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا»:[٧٢٠]

**واتاکه‌ی له‌ژماره‌کانی پێشتردا رابورد.**

٧٢١– عن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو فَحَدَّثَنَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – ذُكِرَ لَهُ صَوْمِي فَدَخَلَ عَلَيَّ ، فَأَلْقَيْتُ لَهُ وِسَادَةً مِنْ أَدَمٍ ، حَشْوُهَا لِيفٌ ، فَجَلَسَ عَلَى الأَرْضِ ، وَصَارَتِ الْوِسَادَةُ بَيْنِي وَبَيْنَهُ . فَقَالَ « أَمَا يَكْفِيكَ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلاَثَةُ أَيَّامٍ » . قَالَ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ . قَالَ « خَمْسًا » . قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ . قَالَ « سَبْعًا » . قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ . قَالَ « تِسْعًا » . قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ . قَالَ « إِحْدَى عَشْرَةَ » .

---

[٧١٨] **بخاری: ١٩٧٧، مسلم: ٢٧٢٦ شيحا.**

[٧١٩] **له ژماره (٧١٨)دا ته‌خریج کرا.**

[٧٢٠] **بخاری. تهجد: ١١٣١، مسلم: ٢٧٣١.**

ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ صَوْمَ فَوْقَ صَـوْمِ دَاوُدَ - عَلَيْـهِ الـسَّلاَمُ - شَطْرَ الدَّهْرِ ، صُمْ يَوْمًا ، وَأَفْطِرْ يَوْمًا »: [٧٢١]

لەژمارەكانی پێش خۆیدا واتاو مەبەستەكەی رابورد، بەتایبەتی لەژمارە (٧١٤)دەدا.

## (٣٧) باب: صوم سرر شعبان
## رۆژووی ناوەڕاستی مانگی كوڵەمانگ

٧٢٢- عَنْ عِمْرَانَ بْـنِ حُصَيْنٍ (رضـى الله عنهمـا): أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ (صـلى الله عليه وسلم) قَالَ لَهُ أَوْ لآخَـرَ: « أَصُـمْتَ مِـنْ سَـرَرِ شَـعْبَانَ؟ ». قَـالَ: لاَ. قَـالَ: « فَـإِذَا أَفْطَرْتَ فَصُمْ يَوْمَيْنِ ». {الحديث: ٢٧٤٣ = ٢٧٢٨ فم. تجريد البخارى/٢/٢٩٦، رقم: ٩١٤ = ١٩٨٣. أبو داود. صوم: ٢٣٢٨. تحفة الأشراف: ١٠٨٤٨} : [٧٢٢]

عیمرانـی كـوڕی حوصـەین (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەخۆمی فـەرموو، یـا فـەرمووی: بـە پیـاوێكی تـری فەرموو: (ئایا لە ناوەڕاستی مانگی كوڵـە مانگدا، هـیچ بـەڕۆژوو بـووی؟) گـوتی: نــەء، فــەرمووی: (دەی لــەجیاتی ئــەوە، كــە ڕەمــەزان تــەواو بــوو، دوو ڕۆژ بەڕۆژووبە).

---

[٧٢١] لە ژمارە (٧١٤)دا تەخریج كراوە.

[٧٢٢] تجرید/٢، ژمارە: ٩١٤ - ١٩٨٣، مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٦١٧ = مسلم. شیحا: ٢٧٤٣.

### (٤٠) فضل ليلة القدر والحث على طلبها وبيان محلها وأرجى أوقات طلبها
### باسى گەورەیی‌و پیرۆزیی شەوی لەیلەتولقەدر، وە کاتەکەی کەیە؟ وەچی شەوێ هیوای گەورە وایە کە ئەو شەوە شەوی لەیلەتولقەدر بێ

٧٢٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رِجَالاً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أُرُوا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي الْمَنَامِ فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) « أَرَى رُؤْيَاكُمْ قَدْ تَوَاطَأَتْ فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ، فَمَنْ كَانَ مُتَحَرِّيَهَا فَلْيَتَحَرَّهَا فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ ». (الحديث ٢٠١٥): [٧٢٢]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: چەند پیاوێ لەهاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە خەونا پێیان گوترا بوو کەشەوی لەیلەتولقەدر دەکەوێتە حەوت شەوەکانی دوایی ڕەمەزانەوە، جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کاتێ ئەم خەونەی پێ گەیشتەوە فەرمووی: وادەزانم خەونەکەتان پێکاویەتی‌و رێك دەکەوێت لەگەڵ راستی دا، جا کەوابێ ئەو کەسەی کەدەیەوێ مشووری ئەم شەوە بخوات، با لەحەوت شەوەکانی دوایی ڕەمەزان دا مشوری بۆ بخوات. (تاج/٢/١٧٦، ژمارە: ١٣٩٥ - ش/د/ن + ریاض/٣/٨٩١ ف/٢ = ژمارە: ١١٩٠، زنجیرە: ٢١٤).

٧٢٤- عن أبي سَعِيدٍ الخُدرِي (رضي الله عنه) اعْتَكَفْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) الْعَشْرَ الأَوْسَطَ مِنْ رَمَضَانَ، فَخَرَجَ صَبِيحَةَ عِشْرِينَ، فَخَطَبَنَا وَقَالَ « إِنِّي أُرِيتُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ، ثُمَّ أُنْسِيتُهَا أَوْ نُسِّيتُهَا، فَالْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ فِي الْوَتْرِ، وَإِنِّي رَأَيْتُ أَنِّي أَسْجُدُ فِي مَاءٍ وَطِينٍ، فَمَنْ كَانَ اعْتَكَفَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَلْيَرْجِعْ ». فَرَجَعْنَا وَمَا نَرَى فِي السَّمَاءِ قَزَعَةً، فَجَاءَتْ سَحَابَةٌ فَمَطَرَتْ حَتَّى سَالَ

---

[٧٢٢] تجريد/٢، ژمارە: ٩٢٢ = ٢٠١٥، مسلم: ١١٦٥ = تخريج/ محمد فؤاد عبدالباقى = ٢٦٥٣ ترقيم/شيحا.

سَقْفُ الْمَسْجِدِ وَكَانَ مِنْ جَرِيدِ النَّخْلِ، وَأُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَسْجُدُ فِي الْمَاءِ وَالطِّينِ، حَتَّى رَأَيْتُ أَثَرَ الطِّينِ فِي جَبْهَتِهِ. (الحديث ٢٠١٦):[٧٣٤]

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەدەشەوی یەکەمی ڕەمەزان دا لەمزگەوت خەڵوەی دەکێشا، واتە ئیعتیکافی دەکرد لەپاشا لەدەشەوی ناوەڕاستیشا خەڵوەی کێشا، لەناو چاتۆڵێکی لباد دا بوو، حەسیرێ پەردەی دەرگاکەی بوو، گوتی: جا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) بەدەستی خۆی حەسیرەکەی هەڵگرتو لەگۆشەیەکی چاتۆڵەکەوە دووری خستەوە، ئینجا بەیانی ڕۆژی بیستەمی ڕەمەزان لەدەرگای چاتۆڵەکەوە سەری کێشاو وتارێکی بۆمان دا وەقسەی لەگەڵ خەڵکەکە کرد، ئەوانیش لێی نزیك بوونەوە، فەرمووی: من پێم گوترا بوو کەشەوی لەیلەتولقەدر کام شەوەیە لەمانگی ڕەمەزانا، بەڵام دوایی لەبیرم برایەوە، من لەدەی یەکەما خەڵوەم کێشا منەیی شەوی لەیلەتولقەدرم دەکردو، بۆ ئەو شەوە دەگەڕام هەروەها لەدەی ناوەڕاستیش دا کەچی جوبرائیل هاتە لام فەرمووی: کەئەو شەوە لەدەی دوایی دایە، کەواتە: هەرکەسەتان حەزدەکەن کەئەم دەشەوەی دواییەیش خەڵوە بکێشن، ئەوا بۆ شەوی لەیلەتولقەدر بگەڕێن، ئیتر مەردوومەکەش لەگەڵ پێغەمبەر دا (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەو دەشەوەی تریش خەڵوەیان کێشایەوە لەناو مزگەوتا، فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): لەخەوما نیشانم درا کەشەوی بەڕێز (لەیلەتولقەدر) شەوێکی تاك دەبێ، وە لەبەیانی یەکەیدا کوڕنووش لەناو قوڕاوو باراناودا دەبەم بۆ خوا، جا وا ڕێکەوت شەوی بیستو یەك باران باری، مزگەوتەکە دلۆپەی کرد، بەچاوی

---

[٧٣٤] تجرید/٢، ژمارە: ٩٢٣ = ٢٠٣٦، مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٦٣٢ = ٢٧٦٣ شیحا.

خـۆم ئـاوو قوڕەكـەم دی، پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) كەلەنوێـژی بەیانی بووەوە چووە دەرەوەو تەوێڵو سەری لووتی ئاوو قوڕیـان پێـوە بـوو، وە خەونەكەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هاتە دی، جا تەماشـامان كـرد ئـەو شـەوە شـەوی بیـستو یـەك بـوو، لەدەشـەوی دوایـی رەمـەزان. (تـاج/٢/١١٨، ژمارە: ١٣٩٨، چ/٤ - ش/د/ن).

٧٢٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضي الله عنه) كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليـه وسلم) يُجَاوِرُ فِي رَمَضَانَ الْعَشْرَ الَّتِي فِي وَسَطِ الشَّهْرِ ، فَإِذَا كَـانَ حِـينَ يُمْـسِي مِـنْ عِشْرِينَ لَيْلَةً تَمْضِي ، وَيَسْتَقْبِلُ إِحْدَى وَعِشْرِينَ ، رَجَعَ إِلَى مَـسْكَنِهِ وَرَجَـعَ مَـنْ كَـانَ يُجَاوِرُ مَعَهُ . وَأَنَّهُ أَقَامَ فِي شَهْرٍ جَاوَرَ فِيهِ اللَّيْلَةَ الَّتِي كَانَ يَرْجِعُ فِيهَا ، فَخَطَبَ النَّاسَ ، فَأَمَرَهُمْ مَا شَاءَ اللَّهُ ، ثُمَّ قَالَ «كُنْتُ أُجَاوِرُ هَذِهِ الْعَشْرَ ، ثُمَّ قَدْ بَدَا لِي أَنْ أُجَاوِرَ هَـذِهِ الْعَشْرَ الأَوَاخِرَ ، فَمَنْ كَانَ اعْتَكَفَ مَعِي فَلْيَثْبُتْ فِي مُعْتَكَفِهِ ، وَقَدْ أُرِيتُ هَذِهِ اللَّيْلَةَ ثُمَّ أُنْسِيتُهَا فَابْتَغُوهَا فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ وَابْتَغُوهَا فِي كُلِّ وِتْرٍ ، وَقَدْ رَأَيْتُنِي أَسْجُدُ فِي مَـاءٍ وَطِينٍ». فَاسْتَهَلَّتِ السَّمَاءُ فِي تِلْكَ اللَّيْلَةِ ، فَأَمْطَرَتْ ، فَوَكَـفَ الْمَـسْجِدُ فِـي مُـصَلَّى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) لَيْلَةَ إِحْدَى وَعِشْرِينَ ، فَبَصُرَتْ عَيْنِي رَسُولَ اللَّـهِ (صـلى الله عليه وسلم) وَنَظَرْتُ إِلَيْهِ انْصَرَفَ مِنَ الصُّبْحِ ، وَوَجْهُهُ مُمْتَلِئٌ طِينًا وَمَاءً): [٧٢٥]

ئـەبو سـەعیدی خـودری (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: دەسـتووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، لەدەی ناوەڕاستی مانگی رەمـەزانا، لەناو مزگەوتەكەیدا خەڵوەی دەكێشا، واتـە: اعتكافی دەكـرد، جا بـەردەوام بـوو لەسەر خەڵوەكەی هەتا بیستی مانگ تەواو دەبوو، لەشەوی بیستو یەكی مانگی رەمەزانـدا، كۆتـایی بەخەڵوەكـەی دەهێنـاو دەگەڕایـەوە بـۆ ماڵـەوەی، وە ئـەو

---

[٧٢٥] مسلم: ٢٧٦١، بخاري: ٦٦٩، ٨١٣، ٨٣٦، ٢٠١٦، ٢٠١٨، ٢٠٢٧، ٢٠٣٦، ٢٠٤٠، ٨٩٤.

کەسانەیش کە لەو ماوەیەدا، خەڵوەیان لەگەڵدا دەکێشا، کە ئەو دەگەڕایەوە ئەوانیش دەگەڕانەوە بۆ ماڵی خۆیان.

جا ئەم حاڵە بەردەوام بوو، هەتا ساڵێ لە رەمەزانا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ کۆمەڵێ، وەك ساڵانی پێشوو، لەسەرەتای دەی ناوەڕاستی رەمەزانەوە دەستیان کرد بە خەڵوەکێشان، جا لەشەوی بیستو یەکی مانگا، نەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە، بەڵکوو بەردەوام بوو لەسەر خەڵوە کێشانەکەیو وتارێکی دا بۆ ئامادەبوانو بەوەی حەزی خودای لەسەربوو فەرمانی پێیان کرد، لەپاشا فەرمووی: (من لەمەوبەر ئەم دەڕۆژەی ناوەڕاستی مانگی رەمەزان خەڵوەم دەکێشا لەناو مزگەوتدا، بەڵام ئێستا وا دەرکەوتووە بۆم کە ئەم دە شەوەی ئاخری مانگی رەمەزان، لەناو مزگەوتا خەڵوە بکێشم، جا هەرکەسێ لەم ماوەیەدا لەگەڵ مندا، لەم مزگەوتەدا، خەڵوەی کێشاوە، با لەجێ خەڵوەکەی خۆیدا بمێنێو لەسەر خەڵوەکێشانەکەی بەردەوام بێ. لەڕاستیدا من پێم نیشان درا کە ئەم شەوی لەیلەتول قەدرە کام شەوەیە، لە شەوەکانی مانگی رەمەزان، بەڵام لەپاشا لەبیرم برایەوە، دەی ئێوە منەی ئەو شەوە بکەنو بەشوێنیا بگەڕێن، لە دەی دوایی رەمەزاندا، بەتایبەتی لەشەوە تاکەکانی دەشەوی دوایی رەمەزاندا منەی بکەن. وە لەخەوما نیشانم درا، کە لەکۆتایی ئەو شەوەدا لەناو ئاوو قوڕاودا کوڕنووش دەبەم، جا ئەو شەوە کە شەوی بیستو یەکی رەمەزان بوو، بارانێکی خوڕزم باری، سەربانی مزگەوت دڵۆپەی کرد، لەجێگە نوێژەکەی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ)، جا بەچاوی خۆم تەماشای پێغەمبەرم کرد، کە نوێژی بەیانی تەواو کردو جێگە نوێژەکەی بەجێ هێشت، قوڕاوو ئاو دەمو چاوی داپۆشیبوو!).

٧٢٦- عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ كَانَ رَسُولُ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم) يُجَاوِرُ فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ ، وَيَقُولُ « تَحَرَّوْا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ »:

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) له دەشەوی دوایی مانگی رەمەزاندا، لەناو مزگەوتەکەی خۆیدا، له مەدینەی نازدار، خەڵوەی دەکێشا، وه دەیفەرموو: (بگەڕێن بۆ شەوی بەڕێز، که ناوداره بەشەوی لەیلەتول قەدر، له شەوه تاکەکانی دەی دوایی رەمەزاندا).

**روونکردنەوە:**

لەکۆتایی باسی رۆژودا، پوختەی بڕیارەکانی نامەی رۆژوو، له شەرحی بلوغ المرامەوه، بەرگی دووەم، کەوا لەپاش ژماره (٧١٤)ەی بلوغ المرامەوه راگوێز دەکەین بۆ زیاده بەهرەو سوودی گشتی:

## پوختەی بڕیارەکانی نامەی رۆژوو

١- رۆژوو روکنی چوارەمه لەپێنج روکنەی ئیسلامو فەرزێکه لەفەرزه گرنگه ئایینیەکانو رێزو پیرۆزیو پاداشێکی گەورەی هەیه، هەرکەسێ رۆژووی مانگی رەمەزان بەفەرزو پێویست نەزانێ پێی کافرو ناموسوڵمان دەبێ. بڕوانه: (روونکردنەوه)ی دوا ژماره: ٦٩٧ له بلوغ المرام.

٢- رێزو گەورەیی مانگی رەمەزان.

٣- پارشێو سوننەته، چی بۆ رۆژووی فەرز بێ، چی بۆ رۆژووی سوننەت، هەتا پارشێو دوابخرێ خێرتره، بەمەرجێ شەوی بمێنێ، که پارشێو دەکرێ.

٤- نیازهێنانی رۆژووی فەرز، لەپێش شەبەقدا فەرزه.

٥- لەگەڵ شەبەقی بەیانا، رۆژوو دەست پێ دەکا، هەتا بانگی شێوان.

٦- رۆژووی شەو حەرامە.

٧- رۆژوو برێتییـــە لەخۆپاراســـتن لـــەخواردن و خواردنـــەوەو جیمـــاع و هەرشتێ کە رۆژووی پێ بشکێ، بەنیازی خواپەرستی.

٨- رۆژوو دانە دەم رۆژوو (وصال الصِیَامِ) باش نییە. واتە: ویصال ناباشـەو مەکرووهە.

٩- لەسەفەردا، مرۆڤ دەتوانێ بەرۆژوو بێ و دەتوانێ بەرۆژوو نەبێ، واباشە مرۆڤ بەپێی حاڵی خۆی لەم لایەنەوە بڕیاربدا.

١٠- رۆژووی مانگی رەمەزان، لەسەر توانای بێ عوزر فەرزە.

١١- رۆژووی فـەوتاوی رەمـەزان، دەبـێ قـەزا بکرێتـەوە بەمـەرجی خـۆی، ئـەوەی لـەرۆژووی ئـەدادا، پێویـستە، وەك نیـەت و وازهێنـان لـەرۆژوو شـکێن، لەرۆژووی قەزایشدا پێویستە، هەروا ئەوەی لەرۆژووی ئەدادا سوننەتە لـەرۆژووی قەزایشدا سوننەتە.

١٢- کەسێ بمرێ و رۆژووی لەسەر بێ، کەسوکاری دەتـوانن بـۆی بگێڕنـەوە، دەتوانن حەجیشی بـۆ بکـەن، عـەمرەی بـۆ بکـەن، قوربـانی بـۆ بکـەن، قـەرزی بـۆ بدەنەوە، صەدەقەی جاری بۆ وەقف بکەن، وەك بیرو پـردو مزگـەوت. {بڕوانـە: پوختەی موسلیم ژمارە: ٦٠٥، ٦٠٦} .

١٣- رۆژووی سوننەت باشترین خواپەرستی و پاداشی گـەورەو زۆری هەیـە، جۆرو بۆنەی زۆری هەیە.

١٤- رۆژوو نـەزرکردن، بەبۆنـەی هاتنـەدی مـرازەوە، یـا بـەهۆی رزگـاربوون لەدەردوبەلا، پەرستشێکی گەورەیە.

١٥- رۆژووی نۆی مانگی قوربان، بۆ کەسێ خەریکی کردنـی حـەج و عـەمرە نەبێ، سوننەتەو خێرێکی گەورەی هەیە.

١٦- رۆژووی عاشوراء سوننەتە، کە دەیەمی مانگی موحەڕڕەمە.

١٧- رۆژووی شەش رۆژ لەمانگی شەشەلان (شەعبان) سوننەتە.

١٨- رۆژووی رۆژەکانی جەژنی رەمەزان و جەژنی قوربان نادروستەو دانامەزرێ و حەرامە.

١٩- رۆژووی دوو شەممەو پێنج شەممە سوننەتە، ئەگەر کەسێ هەموو حەفتەیێ، یان ناوبەناو، پێنج شەممان بەرۆژوو نەبێ و دوو شەممە بەرۆژوو بێ هەردەبێ و سوننەتە، یا بەپێچەوانەوە پێنج شەممان بەرۆژوو بێ و دوو شەممان بەرۆژوو نەبێ هەر سوننەتە، بەڵام بەردەوام بوون لەسەر گرتنی ئەو دوو رۆژە لە حەفتەدا، سوننەتێکی گەورەیەو دروشمی خواناسانە.

٢٠- بەتەنها بەبێ هۆی ڕەوا، گرتنی رۆژووی هەینی، بەنیازی رۆژووی سوننەت ناباشە. {بڕوانە: ژمارە: ٧٠٨ لە بلوغ المرام}.

٢١- کەسێ رۆژووی سوننەت بگرێ دەتوانێ بیشکێنێ، تەنانەت بۆی هەیە بەدروستبوون لەگەڵ حەڵاڵ و هاوسەریدا بیشکێنێ و کەفارەتیشی ناکەوێتە سەر.

٢٢- رۆژوشکاندن، لەرەمەزان و لەغەیری رەمەزانا، لەپاش بانگی شێوان، لەکاتی رۆژوو شکاندندا، بەجیماع لەگەڵ حەڵاڵ و هاوسەردا دروستەو ناباشی نییە.

٢٣- رۆژووی سوننەت بۆ رەگەزی مێ، ئەگەر مێردی هەبێ و مێردەکەی لەگەڵیدا بێ و لەکاروان و دەشت و دەر نەبێ، بەبێ رەزابوونی مێردەکەی ناباشە، بەڵام دادەمەزرێ. {بڕوانە: ژمارە: ٧٠٣ لە بلوغ المرام}.

٢٤- بۆ ژنی مێردار، رۆژووی فەرز و رۆژووی نەزر و رۆژووی قەزا، پێویستی بەرەزا لەسەربوونی مێرد نییە جا ژن دەتوانێ بەبێ ڕەزای مێرد، ڕۆژووی سوننەت بگرێ، بەڵام لە پێشا نەزری بکا لەسەر خۆی.

٢٥- لەهەموو مانگێ گرتنی سێ رۆژ سوننەتە، واباشە کەسیازدەو چواردەو پازدە بن.

٢٦- لەشپیسی رۆژووی پێ ناشکێ. بڕوانە: شەرحی بلوغ المرام ژمارە: ٦٩٧ بڕگەی ژمارە: ١٩ لەروونکردنەوەکە.

٢٧- خواردنو خواردنەوەو چوونە لای ژن، بەپێش یان بەپاش، هەروا خۆ رەحەتکردن بەهەر شێوەیێ بێو چوونە لای ئاژەڵو مرۆڤ، چی بەپێش چی بەپاش رۆژوو بەتاڵ ئەکاتەوە، بکەرو بدەر ئەگەر بەرۆژوو بن، رۆژووی هەردوولایان بەتاڵو پووچ دەبێتەوە، ئەگەر رۆژووی رەمەزان بێو ئەدا بێو بەرۆژ بێ، بەس مێرد کەفارەتی دەکەوێتە سەر، کەفارەت لەسەر ژنەکە نییە. گەرچی هەندێ دەفەرموون: ژنەکەیش کەفارەتێکی تری لەسەرە. لەم جۆرە شتانەدا لەبیر چوون کاریگەری هەیە. {بڕوانە: تجریدی بوخاری/٢ لاپەڕە: ٢٦٣، زنجیرە: ٣٦ لە ژمارە: ٨٧١ هەتا ٩٢٦ + تاج/٢، لاپەڕە: ٧٠ هەتا ١٥٩ لە زنجیرە: ٢٥وە هەتا زنجیرە: ٧٧ لە ژمارە: ١٢٩٥وە هەتا ژمارە: ١٤٦٩ + پوختەی موسلیم لە ژمارە: ٥٧١وە هەتا ٦٣٨ لە زنجیرە: ٤٤٩وە هەتا زنجیرە: ٥٠٨ نامەی هەشتەم = ٨ كتاب الصيام + ریاض/٣، ژمارە: ١٢٢٤ هەتا ژمارە: ١٢٦٧ لە زنجیرە: ٢١٧وە هەتا زنجیرە: ٢٣١ لاپەڕە: ١٥٤ هەتا لاپەڕە: ١٨٤}.

# ١٤- كتاب الإعتكاف
# نامەی خەڵوەکێشان
## (١) باب: إعتكاف عشر الأواخر من رمضان
## لە دەی دوایی مانگی ڕەمەزانا، خەڵوەکێشان سوننەتەو خێری زۆر گەورەیە

٧٢٧- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عُمَرَ (رضی الله عنهما) قَالَ كَانَ رَسُولُ اللّٰـهِ (صـلى الله عليه وسلم) يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ: [٧٢٧]

عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەر (ڕەزای خـودا لـەخۆیو لـەباوکی) فـەرمووی: دەسـتووری پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) وابـوو، لـە دەشـەوی دوایـی ڕەمەزانا، لەناو مزگـەوتا خـەڵوەی دەکێـشاو لـەماوەی ئـەو دە ڕۆژەدا لەمزگـەوت دەرنەدەچوو).

٧٢٨- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنهـا) أَنَّ النَّبِـيَّ (صـلى الله عليـه وسـلم) كَـانَ يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ، ثُـمَّ اعْتَكَـفَ أَزْوَاجُـهُ مِـنْ بَعْدِهِ. {الحديث: ٢٧٧٦ = ٢٧٦٠ فم. تجريد/٢/٣٠٧، رقم: ٩٢٧ = ٢٠٢٦. أبـو داود. صوم: ٢٤٦٢. تحفة الأشراف: ١٦٥٣٨} : [٧٢٨]

عائیـشە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: جـاران پێغەمبـەری خـودا (دروودی خودای لەسەر بـێ) لـە ژیانیـدا، کردبـووی بـە دەسـتوور، لـەدەی دوایـی ڕەمەزانا، لەناو مزگەوتا خەڵوەی دەکێشا، هەتا ئەو کاتەی خودا بردیـەوە بـۆلای خۆی ئەمەی تەرك نەکرد. بۆیە لەپاش خۆشی ژنەکانیـشی لـە مزگـەوتا خـەڵوە دەکێشن). {تاج/٢/١٥٤، زنجیرە: ٧٤، ژمارە: ١٤٥٩ ج/٤}.

---

[٧٢٧] مسلم: ٢٧٧٢، شیحا بوخاری: ٢٠٢٥.

[٧٢٨] تجرید/٢، ژمارە: ٩٢٧ - ٢٠٢٦، مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٦٣٢ = مسلم: ١١٧٢ = ٢٧٧٦.

## (٢) باب: متى يدخل من أراد الإعتكاف في معتكفه
## کەسێ بیەوێ دەست بکا بە خەڵوە کێشان کەی بڕواتە ناو خەڵوەگاکەی

٧٢٩- عَنْ عَائِشَةَ – رضى الله عنها – أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَرَادَ أَنْ يَعْتَكِفَ، فَلَمَّا انْصَرَفَ إِلَى الْمَكَانِ الَّذِى أَرَادَ أَنْ يَعْتَكِفَ إِذَا أَخْبِيَةٌ خِبَاءُ عَائِشَةَ، وَخِبَاءُ حَفْصَةَ، وَخِبَاءُ زَيْنَبَ، فَقَالَ « آلْبِرَّ تَقُولُونَ بِهِنَّ ». ثُمَّ انْصَرَفَ، فَلَمْ يَعْتَكِفْ، حَتَّى اعْتَكَفَ عَشْرًا مِنْ شَوَّالٍ. (الحديث ٢٠٣٤): [٧٢٩]

**لەتاجول ئوصولا ئەم فەرموودەیە ئاوایە:**

**عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) دەستووری وابوو، کە دەیویست خەڵوە بکێشێ لەمزگەوتا نوێژی بەیانی دەکردو دەچووە ناو خەڵوەخانەکەیەوە، جارێکیان لەدەی دوایی ڕەمەزان دا ویستی خەڵوەبکێشێ، جا فەرمانی کرد چاتۆڵەکەیان لەناو مزگەوتا بۆ هەڵدا زەینەبیش گاڵی دا، چاتۆڵەکەی خۆیان بۆهەڵدا ژنەکانی تریشی وەك عائیشەو حەفصە هەروا پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) کە نوێژی بەیانی کرد، چاتۆڵەکانی دی، ناو مزگەوتەکەیان داگیر کردبوو، جا فەرمووی: ئایا مەبەستیان کردنی کردەوەی چاکەیە، یا بۆ چاو لێ کەرییەو هیچی تر؟ ئینجا پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی کرد چاتۆڵەکەی ئەویان خست، وەلەو ڕەمەزانەدا خەڵوەی نەکێشا، وەلەدەی یەکەمی شەشەڵانا خەڵوەی کێشا. (تاج/٢/١٤٥ ز/٧٤ ف/٣ = ژمارە: ١٤٦١ - ش/د/ن).**

**لە پوختەی موسلیمیشا ئاوایە:**

عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِذَا أَرَادَ أَنْ يَعْتَكِفَ صَلَّى الْفَجْرَ ثُمَّ دَخَلَ مُعْتَكَفَهُ، وَإِنَّهُ أَمَرَ بِخِبَائِهِ فَضُرِبَ، أَرَادَ

---

[٧٢٩] تجرید/٢، ژمارە: ٩٣٠ - ٢٠٣٤ = ١١٧٣ - ٢٧٧٧ شیحا.

الاعْتِكَافَ فِى الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، فَأَمَرَتْ زَيْنَبُ بِخِبَائِهَا فَضُرِبَ، وَأَمَرَ غَيْرُهَا مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) بِخِبَائِهِ فَضُرِبَ. فَلَمَّا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) الْفَجْرَ، نَظَرَ فَإِذَا الأَخْبِيَةُ، فَقَالَ: « آلْبِرَّ تُرِدْنَ؟ ». فَأَمَرَ بِخِبَائِهِ فَقُوِّضَ، وَتَرَكَ الاعْتِكَافَ فِى شَهْرِ رَمَضَانَ، حَتَّى اعْتَكَفَ فِى الْعَشْرِ الأَوَّلِ مِنْ شَوَّالٍ. {الحديث: ٢٧٧٧ = ٢٧٦١ فم. تجريد/٢، لاپەڕە: ٣٠٧، زنجيره: ٣٨، رقم: ٢٠٢٩، ٢٠٣٣، ٢٠٣٤، ٢٠٤١، ٢٠٤٥. أبو داود. صوم: ٢٤٦٤. ترمذى. صوم: ٧٩١. نسائى. مساجد: ٧٠٨}:

عائيشه (خوداى لێ رازى بێ) فەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) دەستوورى وابوو، كە دەيويست خەڵوە بكێشێ، لە مزگەوتا، نوێژى بەيانى دەكردو دەچووە ناو خەڵوەخانەكەيەوە، جارێكيان لەدەى دوايى رەمەزاندا ويستى خەڵوەبكێشێ، جا فەرمانى كرد چاتۆڵەكەيان لەناو مزگەوتا بۆ هەڵدا، زەينەبى خێزانيشى گاڵيدا چاتۆڵەكەى خۆيان بۆ هەڵدا، ژنەكانى تريشى هەروا، پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) كە نوێژى بەيانى كرد چاتۆڵەكانى بينى، ناو مزگەوتەكەيان داگيركردبوو، جا فەرمووى: (ئايا مەبەستتان كردنى كردەوەى چاكەيە، يا بۆ چاو لێكەرييەو هيچى تر؟ ئەنجا پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمانى كرد چاتۆڵەكەى ئەويان خستو لايان برد، وە لەو رەمەزانەدا خەڵوەى نەكێشا، وە لەدەى يەكەمى مانگى شەشەڵانا خەڵوەى كێشا).

{تاج/٢، زنجيره: ٧٦، ژماره: ١٤٦١}.

## (٣) باب: الإجتهاد في العشر الأواخر من شهر رمضان
## خۆماندوو كردن بە خوداپەرستییەوە لەدەی دوایی مانگی ڕەمەزاندا

٧٣٠- عَنْ عَائِشَةَ - رضي الله عنها - قَالَتْ كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا دَخَلَ الْعَشْرُ شَدَّ مِئْزَرَهُ، وَأَحْيَا لَيْلَهُ، وَأَيْقَظَ أَهْلَهُ. (الحديث ٢٠٢٤):[٧٣٠]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) وابوو، کە دەی دوایی ڕەمەزان دەهات خۆی گورج دەکردەوە بۆ خوا پەرستیو بەشەو نوێژو یادی خودا شەوی خۆی ئاوەدان دەکردەوە، وەکەسوکاری خۆشی خەبەر دەکردەوە بۆ هەمان مەبەست. (ریاض/١/١٠٧ ز/١١ ف/٩٩ + تاج/٢/١١٥ ف/١ ز/٥١ — ش/د/ت/ن، فیقهی ئاسان/١/١٧٠-١٧٨).

بۆ بەهرەی تەواو لە بابەتی خەڵوەکێشاندا دەڵێین:

### پوختەی بڕیارەکانی خەڵوەکێشان:

١- باسی خەڵوەکێشان لە (بلوغ المرام) لە سەرەتاوە تا کۆتایی بڕێتیە لە (٧٢٥ — ٧١٤ = ١١) یازدە فەرمووده. کەسێ موراجەعەی بکا سوودی زۆرە.

٢- خەڵوەکێشان (واتە: ئیعتیکاف) سوننەتێکی گەورەیە، پێغەمبەرو خێزانو هاوسەرەکانیو هاوەڵە بەڕێزەکانیو زۆرینەی زانایانو خواناسان، ماوەیەکی باش لەمزگەوتا، بەنیازی پەرستشی ڕاستو دروست، خەڵوەیان کێشاوە.

٣- پێناسەیەکی کورتو پوختی خەڵوەکێشان بەکوردی پەتی ئەوەیە: (مانەوە بەلەشی پاکەوە، لەناو مزگەوتا، بەنیازی خواپەرستی).

٤- خەڵوەکێشان ساڵ دوازدە مانگ سوننەتە، لەمانگی ڕەمەزانا خێرترە، لەدەی دوایی ڕەمەزاندا سوننەتترە.

---

[٧٣٠] تجرید/٢، ژمارە: ٩٢٦ = ٢٠٢٤، مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٦٣٤ = ٢٧٧٩ شیحا.

٥- خەڵوەکێشان بەوەندە دێتە دی: کە کەسێ دەچێ بۆ مزگەوت، نێت بهێنێ، بڵێ: هەتا ئەم نوێژی عەصرە، یا ئەم نوێژی شێوانە، یان ئەم نوێژی خەوتنانە تەواو دەکەم، نێتمە لەم مزگەوتەدا خەڵوەدەکێشم، یا ئیعتیکاف دەکەم، یا بڵێ: هەتا تەراویحی ئەم شەو تەواو دەکەم، لەم مزگەوتەدا خەڵوەدەکێشم وە ئەم نێتەی جێبەجێ بکا.

٦- لە ڕەمەزاندا گەڕان بەشوێن شەوی لەیلەتولقەدردا زۆر سوننەتە، واباشە ئەو شەوانەی کە موسوڵمان بەشوێنی شەوی قەدردا دەگەڕێ، لەمزگەوتا خەڵوەبکێشێ هەتا بەیانی.

٧- أحیاءو زیندوو کردنەوەی شەوی لەیلەتولقەدرو شەوی هەینیو شەوەکانی دەی دوایی مانگی ڕەمەزانو دەی یەکەمی مانگی قوربان، یان هەرشەوێکی تری ساڵ، مەرج نییە کە هەر بەخەڵوەکێشان بێ، یان هەر لەمزگەوتا بێ، لەماڵیشەوە دەبێ، لەدەشتو دەرو سەر ئیشوکارو پیشەو شتی تری وایش دەبێ، وەك شوان لەلای ڕان بێ، یا کەسێ لەسەفەرا بێ، لەئوتێلا بێ، لەشەمەندەفەردا بێ، لەفڕۆکەدا بێ، لەکەشتیدا بێ دەبێ، لەم کاتانەداو لەم شوێنانەدا، سەرگەرمی یادی خودا بێ، قورئان بخوێنێ، گوێ لە قورئان بگرێ، شەونوێژ بکا، نزا بخوێنێ، لەخودا بپاڕێتەوە. بەڵام لەم کاتانەدا، چونکە لەمزگەوت نییە، نابێ نێتی خەڵوەکێشانو ئیعتیکاف بهێنێ، بەڵکوو ئەم جۆرە کارانە ئەنجام بدا، بەنیازی زیندوو کردنەوەی ئەو بۆنەیەی کەوا تیادا. {بڕوانە: تاجول ئوصول. بەرگی/٢، زنجیرە: ٧٤ هەتا/٧٧، لە ژمارە: ١٤٥٩ — ١٤٦٩ + تجریدی بوخاری = مختصر صحیح البخاری/٢، زنجیرە: ٣٨ نامەی خەڵوەکێشان لە ژمارە: ٩٢٧ هەتا ژمارە: ٩٣٢ + فیقهی ئاسان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە: ٣٨٤، زنجیرە: ١٥٧ + ریاض الصالحین بەکوردی/٣، لاپەڕە: ١٨٥، زنجیرە: ٢٣٣، ژمارە: ١٢٦٨، ١٢٦٩، ١٢٧٠ +





پوختەی موسلیم/٢ — نامەی خەڵوەکێشان. زنجیرە: ٥٠٠، ژمارە: ٦٣١ هەتا ژمارە: ٦٣٣ + ٦٣٤ هەتا/٦٣٨ + پوختەی موسلیم: ٣٩٨}.